# گۆڤاری
# کۆڕی زانیاری کورد



بەرگی شەشەم

١٩٧٨



# گۆڤاری

# کۆڕی زانیاری کورد

بەرگی شەشەم

١٩٧٨




چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا

بسم الله الرحمن الرحيم



نوسەری هەر وتار و لێکۆڵینەوەیەك کە لەم گۆڤارەدا

بـڵاو دەکرێتەوە ، خۆی بەرپرسیاری ناوەرۆکەکەیەتی .

★ ★ ★

البحوث والدراسـات التي تنشـر في هذه المجلة تعبر عن اراء اصحابها .

# چەپکە گوڵێک !

ساڵی «١٩٧٠» ساڵێکی مێژوویی بۆ بەرانبەر بە کورد • لە مـارتی ئەو ساڵەدا ؛ وە بە تایبەتی‌تر لە یانزەی مارتی ئەو ساڵەدا رەوزەوەی مێژوی کورد لە رووپەڕەی لاپەڕەیەکیەوە کوتوپڕ گۆڕا بە لاپەڕەیەکی‌تر ، گۆڕا لە هەموو رویەکەوە ئەتوانم بڵێم لە تاریکیەوە بۆ بە روناکی ؛ بەرهەمێکی زۆر بۆ بە دەستکەوتی کورد •

یەکێك لەوانە کە دیمەنێکی درەخشانی هەیە دەسـتکەوتی « کۆڕی زانیاری کورد » بووە • کۆڕی زانیاری خۆی بە خۆی بەرانبەر بە هەمـوو نەتەوەیەك دنیایەکی سەربەخۆیە ، چونکە ئەو نەتەوەیە کە کۆڕی زانیـاری هەبێ ئەتوانێ لە سێبەری ئەو کۆڕەیا وەکو رۆژ گزنـگی خـۆی بـلاو بکاتەوە و هەموو سوچێك روناك بکاتەوە •

راستە کۆڕی زانیاری گزنگی رونـاکی بلاو ئەکاتـەوە ، چونـکە زانیاری و خوێندەواری و بەرهەمی خوێندەواری بلاو ئەکاتـەوە ، هـەر نەتەوەیەك توانی ئەو زانیاری‌یە بلاو بکاتەوە مەعنای وایە کەسانی نەتەوەکە لە تاریکی نەزانینەوە ئەخاتە ناوەڕاستی بەهەشتی زانینەوە • عیلم چرایـە ، چرا رێگا روناك ئەکاتەوە ، رێگا ؛ کە روناك بووەوە ، ئەوەی کە هۆی نەزانینە ئەکەوێتە روو ، چرای زانینەکە وا ئەکا کە کەسانی نەتـەوەکە ئەو هۆیانـە

لابەرن و نەیانهێڵن ، لە نەهێشتنی ئەوانە نەتەوەکە لە عالەمی زیانکارییەوە ئەکەوێتە ناو عالەمێکی کامەرانی و سەربەرزی •

نەتەوەی کورد یەکێك بو لەو نەتەوانە کە لە یانزەی مارتی «١٩٧٠»دا ئەم ئاواتەی هاتە دی و بەیاننامەکەی ئەو ساڵە ئەو کامەرانیەی پێ رەوا بینی و دەروازەی ئەو کۆڕی زانیارییەی بۆ خستە سەر گازی پشت• پاش ئەوە کۆڕ، کە دامەزرا چاکی لێ بەلاداکرد و کەوتە چالاکی؛ چالاکیەکی وەها کە بە پشتیوانی خاوەن بەیاننامە گەلێ ئیشی گەورە گەورەی کرد ؛ جێگای بـۆ خۆی دروستکرد ، چاپخانەی دامەزراند ، گۆڤاری هێنایە ناوەوە• بە هۆی گۆڤار و چاپخانەکەیەوە کەوتە جم و جۆڵێکی نەسرەوتەوە •

بە بێ پشو ڕۆژ بە ڕۆژ تەکانی بۆ پێشەوە ئەدا ؛ گۆڤارەکەی بەرهەمی قەڵەمی ئەندامانی کۆڕ و زانایانی دەرەوە و ناوەوەی عیراقی بڵاو ئەکردەوە ، چاپخانەکەی بەرهەمی ڕۆشنبیرانی کوردی ئەگەیاند بە هەمو لایەك • لـە گۆڤارا زانیاری و لە چاپخانەدا دانایی وەکو دانەی مرواری ئەباراند بـە سەر تینوانی ئەدەب و سەقافەتی زمـانی کوردیدا و خـەڵکی تری لـەو ئەدەب و زمان و سەقافەتە تێئەگەیاند •

کۆڕی زانیاری کورد بە هۆی ئەو دو شاکارەیەوە لە ماوەی ئەم چەند ساڵە کەمەدا ئەوی شایانی بنکەیەکی زانیاری بێ پێشکەشی بکا بە نەتەوەی کورد و بە ڕۆشنبیران و خوێندەوارانی کورد و بە هەمو بێگانەیەك ، کردی •

لەم ماوەیەدا قەڵەمی نوسـەرانی کورد کەوتـە کار ؛ چ بە هـۆی گۆڤارەکەیانەوە ، چ بە هۆی چاپخانەکەیانەوە ، ئەوی لە توانایانا بو درێغیان نەکرد و هەر کەسە بە ئەندازەی دەسەڵاتی خۆی توانی بەرهەمـی خـۆی بگەیەنێ بە هەمو کەسێك •

کۆڕی زانیاری کورد و گۆڤار و چاپخانەی «زانیاری کۆڕ» هی کوردە،

هی هەمو کوردێکە ، پێویستی هەمو کوردێکە بە ئەندازەی توانا رایەڵی بیر و هۆشی راست و رەوانی خۆی رۆبەڕۆی ئەم کۆڕە بکاتەوە ، پشتگیری بکا ، قەڵەمی خۆی بۆ بەهرەی زانیاری تیایا بەکاربێنێ ، کەلەپوری نەتەوایەتی خۆی تێکڵاوی بکا ، بەرهەمی زانایانی رابوردوەکانمانی تێدا زیندو بکاتەوە ، لە بارەی زمانەکە و پەرەپێدانی زمانەکەوە بۆی خەریك بێ ، هەر کەسە لە راستی خۆی ئەم دەستکەوتە بە جگەرگۆشەیەکی خۆی بزانێ •

لەگەڵ ئەمەشا ئەمە لە دەستوری هەمو بنکەیەکی گشتییە ، کە ئەبێ بۆ بەڕێوەبردنی ئەو بنکەیە دەستەیەکی دەستنیشانکراو سەروکاری ئەو بنکە گشتییە بکا بۆ ئەوە سودەکەی بێ بە سودێکی گشتی و سێبەری خێوەتی زێڕینی لەنگەری بخاتە سەر هەموو لایەك • ئەگەر ئەمە نەبێ و وا نەبێ وەکو ئاوێکی لێدێ هەر بکرێتە بێژنگەوە و تیایا رانەوەستێ و راش ناوەستێ !•

ئەندامانی کۆڕی زانیاری کورد لە رۆژی دامەزراندنەکەیەوە تا ئێستە بە خۆیان و بە گۆڤار و چاپخانەی کۆڕەوە ئەگەر بە بێ لایەنگری سەیر بکرێ توانیان ئەوی پێوستی سەر شانیان بوبێ بۆ بڵاوکردنەوەی بەری رۆشنبیری و خوێندەواری بەجێ بێنن • لێشاوی بەرهەمی چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد لە ماوەی ئەم چەند ساڵە کەمەدا لام وایە دڵ و دەرونی هەمو کوردێك فێنك ئەکاتەوە • ئەگەر تەنیا ئەم سوچی چاپەمەنی کوردییە بگیرێ بە دەستەوە بۆ خزمەتکردنی کۆڕی زانیاری کورد ، بە کورد ، ئەبێ بە شابەڵگەیەکی درەخشان بۆ هەمو کوردێکی دور و نزیك لە کۆڕ •

ئێستەش ئەوا بەرگی شەشەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بە خۆی و بە ناوەرۆك و روخساریەوە کەوتە بەردەستی هەمو رۆشنبیر و

خوێندەوارێکی کورد ، هیوا وایە کە جێگای ڕەزامەندیی هەموو لایەك بێ • ڕێگای ڕەخنەش لە هیچ ڕۆژێکا لە هیچ کەس نەگیراوە و ناگیرێ ، چونکە ڕەخنەیەك کە لەسەر بناغەیەکی عیلمیی بێ هەموو وەخت گوڵ بە چرای ڕاستیی و واقیع زیاد ئەکا و ڕوناکتری ئەکاتەوە • نە ڕەخنە لێ گیراو ، وە نە ڕەخنەگر لەو مەیدانی ڕاستیەدا ئاڵۆزاویی بەسەر خۆیانا نایەنن ، بەڵکو هەمیشە لەو ڕێگایەدا ئەبێ وەکو ڕابەرێکی ڕێپیشاندەری دڵسۆز وا بن •

گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد پەیمانی خۆی تازە ئەکاتەوە کە تا لە توانایا بێ و ئەوەی لە دەسەڵاتی زانیاریدا هەبێ خزمەت بە زمان و ئەدەبی کورد بکا ، بەرهەمی قەڵەمی ڕابوردوانی کورد و ئێستامان زیندوو بکاتەوە ، دڵی دڵدارانی خاوەن قەڵەمی ڕابوردوانی کورد بگەشێنێتەوە ، هیوای پاشەڕۆژی خوێندەواری کورد بیوژێنێتەوە • ئیشی ئەم زیندوو کردنەوەی ئەدەب و زمانی کوردییە • ئەو ئەرکەی لە باوەڕی خۆیا بە پوختیی بە ئەنجام بگەیەنێ •

ئەمەیە نیازی بەرگی شەشەم و ئەمەیە ڕێبازی کۆڕی زانیاری کورد کە ئەم بەرگی شەشەمی گۆڤارەی نموونەیەکی ئەو ڕێبازەیە و دەستەچرایەکە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕێبازە •

**گۆڤار**

# مەلا محمدی خاکی

ئەندامی کارا : شێخ محەمەدی خاڵ

مەلا خاکی ناوی محەمەدی کوڕی ئەحمەدە و خەڵقی دێی ( ئەحمەد بڕندە)یە لە شارەزوور • لە ساڵی ١٢٥٥ی هـ لەدایـك بووە و ، لە ساڵی ١٣٢٦ی هـ بە نەخۆشی زەحیری کۆچی دوایی کردووە •

لە حەوت ساڵیدا دەستی کردووە بە خوێندن تا قورئـان و چەنـد کتێبێکی فارسی و سەرەتایی خوێندووە ، ئنجا هاتووەتە سلێمانی لای مەلا محەمەدی مەحوی و چەند مەلایەکی‌تر خوێندویەتی ، لەپاشا چووە بۆ سنە خوێندنی تـەواو کردووە • لەدواییـدا گەڕاوەتـەوە بۆ سلێمـانی • وا دەرئەکەوێ کە مزگەوتێکی دەست نەکەوتووە تا بە ئیمام یا بە مودەڕڕیس لەسەری دانیشێ • لەبەرئەوە هەر لە ماڵی خۆیا بووە • خانوشی نەبووە ، بەڵکو هەر ماوەی لە ماڵێکا بووە بە کرێ • ئنجا بۆئەوەی بژێ ، قوتابی ڕاگرتووە و دەرسی فارسی و کتێبی سەرەتـایی پێ وتـوون ، وەك مـەلا مەحمودی بێخود و شێخ سەلام و مەلا محیدینی خواجە ئەفەندی و مەلا حەمە سەعیدی کوڕی حاجی مەلا ئەحمـەدی دێلێژەیی و مەلا خـالیدی مەحوی و حاجی مەلا عارفی مستۆ و گەلێکی‌تر • زۆرترینی قوتابییەکانی لەپاشا بوون بە شاعیر • وادیارە کە لەگەڵ دەرس پێ وتنیانا دەسـتکاری هەست و بیریشی کردوون و ئەوانیش ئیلهامی شیعریان لەو وەرگرتووە •

لەگەڵ ئەمەشا خاکی زۆر خەتخۆش بووە و لە هێندێ مالآ قەتعەی جـوانی دەستنوسی ئەوم دیوە وەك ماڵی حاجی عەزیزی ئاغال و چەند کەسێکی‌تر کە زەڕکفتکاری کردبون و لە شوشەی گرتبون • وادیارە یا بە پارە بۆی نوسیون یا بە دیاری بۆی ناردون و ئەوانیش وەرامیان بە باشی داوەتەوە •

ئەم شاعیرە دەمێ دراوسێی مزگەوتی مفتی بووە و دەمێ دراوسـێی مزگەوتی ئێمە بووە • لەدواییشدا لە ماڵی مەلا برایمی چاپچیدا بووە کە باوکی حاجی ئەحمەدی مەشهور بە حاجی ئەحە ڕەشــە و لەوێ مردووە • خێزانەکەی پیرۆزەی کچی ئەحمەد بووە کە خوشکی مەلا برایمی چاپچی و پوری حاجی ئەحمەد بووە •

مەلا خاکی زۆر هاتوچۆی باوکم و باپیرمی کردووە • تەنانەت کە من لەدایك‌بوم لە ساڵی ١٩٠٤ی م ــ ١٣٢٢ی هـ بە سـێ شـیعری فـارسی مێژوی بۆ داناوم و لە پشتی دیوانەکەی خـۆی بــە دەستنوسی خـۆی نوسیویەتی ، دەڵێ :

**به چشمان خیالم دوش در خواب**
**یکی شیرین پسر خوش مهوشی بود**
**به باغ نیکنــامی و نکویی**
**محمــد نام سرو سرکشی بــود**
**عیار نقد تاریخش بجستم**
**محك گفت آزمودم ( بی‌غشی ) بود**

١٣٢٢ هـ

دوای مردنی مەلا خاکی ژنەکەی دیوانەکەی ناردووە بۆ بــاوکم کە ئێستا لای منە •

ئەم زانایە شاعیرێکی بەهرەمــەند بووە لــە کوردی و فارسیــدا • زۆرترینی شیعرەکانی بە فارسی‌یە • بەڵام چەکامەیەکی ١٦٩ شیعری هەیــە

بە کوردیَ لەباسی پێغەمبەر و هاوڕێکانیا (چەکامە بە قەسیدەیەك ئەڵێن کە لە هەژدە شیعر زیاتر بێ ، هەروەك چامە بە قەسیدەیەك ئەڵێن کە لە حەڤدە شیعر تێنەپەڕیبێت ) • ئنجا ئەم چەکامەی خاکییە پێیئەڵێن : چەکامــەی نوَر کە بە ئاسمانی ڕەوانبێژییەوە ئەدرەوشێتەوە ، ئەم چەکامــەیە وەك چەکامەی « بُردە » باسی پێغەمبەر و موعجیزاتی و میعراجی ئەکات لەگەڵ باسێکی ڕۆژی قیامەت و شەفاعەتیا • دوای ئەوە ئنجا باسێکی هاوڕێکانی پێغەمبەر ئەکات نەخوازەلاَ چوار یاری پایەبەرزی • بێگومانم هەرکەسێك• بە وردیَ بیخوێنێتــەوە ، تیَئــەگات کە خــاکی شاعــیرێکی زوَر ورد و سنعەتکار بووە ، وە بڕوا ئەهێنێت کە چەکامەی نوَر لە چەکامەی «بردەی بویصیری» کەمتر نییە ئەگەر زیاتر نەبێت •

حاجیَ محەمەدی سەڵتە کە بەخزمەت خاکیَ گەیشتووە گەلێکی لەم چەکامەیە لەبەربووە ، وە هەموَ جارێك ناوی چەکامەکەی هــەر بە غەزەل بردووە ، ڕوَژێك شاعیری بەناوبانگ ئەحمەد بەگی صاحێبقڕان کە ئــەم چەکامەیەی لەوەپێش نەبیستووە ــ ئەچێتــە ســەر دوَکانــەکەی حــاجیَ محەمەد و پێیئەڵیَ حاجیَ هاتوَم چەکامــەکەی خــاکیم بوَ بخوێنیتــەوە ، ئەویش ئەڵیَ : غەزەلی نوَر ئەفەرموَیت ؟ ئەمیش ئــەڵیَ : بەڵیَ • ئەویــش دەستئەکا بە خوێندنەوەی ، دە پانزە شــیعرێکی بوَ لیَ ئەخوێنێتــەوە • لەپاشا ئەحمەدبەگ ئەڵیَ : حاجیَ توَ غەزەلت لەبەرکردووە ، بەلاَم ئەمــە شــیرداخە •

وادەرئەکەویَ خاکیَ کە ئەم چەکامەیەی نوَسیوە وێنەیەکی ناردووە بوَ خوالیَخوَشبوو مەلا محەمەدی مەحویَ • ئەویــش کە ئەیخوێنێتــەوە زوَری پیَ جوان ئەبیَ و بەم دوَ شیعرە فارسییە پەسەندی ئەکات ، ئەڵیَ :

**ز خاك طينت ( خاكى ) بحكم طبع روان**
**چو سر زد اين گل و نسرين و سنبل و ريحان**

**هرانكه ديد به ديده ( جزاك خيراً ) گفت**
**شنيد هر كه به ( احسنت ) وا گشاد زبان**

ئەم جۆرە چەکامانە لە باسی پێغەمبەرا کە وتراون هەریەکەی بۆ ئاواتێك وتراوە کە بێتەدی ، وەك چەکامەکەی (بردە) کە شەرەفوددین محەمەدی بووەیسیری وتویەتی بۆئەوەی کە چاك ببێتەوە لەو نەخۆشی شەپلە (شلل)یەی کە لێیداوە وە پەکی هەستان و دانیشتنی خستووە ، کاتێك کە چەکامەکە تەواو ئەکات شەو بە خزمەت پێغەمبەر ئەگات وە چەکامەکەی بۆ ئەخوێنێتەوە ، وە پێغەمبەر زۆری پێ خۆش ئەبێت ، وە دەستی پیرۆزی بەسەر هەمو ئەندامی شەرەفوددیندا ئەهێنێ ؛ وە لە خەوەکەیا چاك ئەبێتەوە ؛ کە لەگەڵ خەبەری ئەبێتەوە خێرا هەڵئەستێتە پێیان کە تەماشا ئەکات وا بە راستی چاك بووەتەوە .

مەلا خاکی ئەم چەکامەی کە وتووە ، بۆ ئاواتێکی دنیایی نەوتووە ، بەڵکو بۆ ئاواتی رۆژی دوایی وتووە کە پێغەمبەر شەفاعەتخوازی بێ تاخوا لە گوناهی خۆش ببێ وەك خۆی لە چەکامەکەیا داوای کردووە ئەڵێ :

**ڕجای تاجی شەفاعەتیە ئەگەر هەر سەر بە سەودا بێ**
**منی عاسی ئومێدێکم ئەگەر بێ هەر گوناهانە**
**سوهایی بێبەهام عەزمە حوزووری حەزرەتی ڕۆژ بم**
**دیاری نادیاری حەسبی حاڵی نادیارانە**
**گەدا دیاری ئەبا بۆ شا ، وەلێکین کەم بە فیکری زۆر**
**قەبوڵ فەرمو کەریمانە لە من دیاری فەقیرانە**
**ئەبێ ( خاکی ) ئەتۆ خۆت چی و دیاری تۆ ئەبێ چی بێ**
**لەبۆ شاهی عەرەب هەرگیز نەڵێیت ئەم شیعرە کوردانە**
**مەگەر شاهی ڕەسول ، هادی سوبول ، سەرخێڵی جوملە و کول**
**بە ئیحسانی بکا تەحسین بڵێ وەك شیعری حەسسانە**

وادیارە کە مەلا خـاکیش وەك شـێخی بووەیسـیرێ ئاواتـەکەی گیرابوبێ •

حاجێ محەمەدی سەڵتە لە سلێمانێ بۆی گێڕامەوە وتی دوای مردنی خاکێ بەماوەیەك حـاجێ عەزیزی قەفتـان مەولودێـکی کرد زۆرکەسی بانگ‌کردبو • لەناو ئەوانەدا مەلا حەمەسوری خـانەقا و مـەلا حسـێنی سەبیلچێ‌یشیـان تیابو کە دەنگیـان خـۆش بو ، وە شیعریـان بە نقـام ئەخوێندەوە ــ ئەم دوانە دەستیان‌کرد بە خوێندنەوەی چەکامەی نـور ، دانیشتووان زۆریان پێ خۆش بو • ئنجا لەبەرئەوەی کە مەلا حەمەسور زۆر هاتوچۆی مەلا خاکێ ئەکرد لێیان پرسێ خاکیت دێ لەکاتی مردنیا ؟ ئەویش وتی : بەڵێ لەپێش مردنیا بە دو رۆژ چوم بۆلای ئەحواڵپرسیم کرد ، وتێ : زۆر چاکم ، وتم : هیچ نامانگوری‌یەکت نی‌یـە ؟ وتی : مـن و نامانگورێ دوای ئەوەی کە پێغەمبەر چەکامەکەی لێ وەرگرتم ؟ وتم : چـۆن ؟ وتی : دوێشەو بە خزمەتی گەیشتم فەرموی : خاکێ ! چەکامەکەتم پێ‌گەیشت • دوای ئەوە بە شەووڕۆژێك کۆچی دوایی‌کرد ، وە لە گردی ناوەڕاست کە مەشهورە بە گردی (عافوان) نێژرا ، وە بە میهرەبانێ خوا شاد و دڵشاد بو •

حاجێ ئەحمەدی مەلا برایـم بۆی گێڕامـەوە وتی کە مەلا خـاکێ کەوتەگیانەڵا و خێرا ڕەحمەخانی دایکی حاجێ سـەعیدی فەقێ مەحمـود دەستی‌کرد بە یاسین خوێندنی بە دەنگی بەرز ، ڕەحمەخانیش دەنگی زۆر خۆش بو • لەبەرئەوە مەلا خاکێ چاوی هەڵبڕێ و پێی‌وت : بە ئاهیستـە بخوێنە تاگوێی لە دەنگی نەبێ چونکە بۆ پیاو حەرامـە گوێ لە دەنـگی ئافرەت بگرێ •

جا لەبەرئەوەی کە ئەم چەکامەیە تائێستا لەچاپ‌نەدراوە ، وە کەم کەس

دیوێتی ، لەگەڵ ئەوەشا کە زۆر گران و پێچراوەیە ، وە ئاماژە «ئیشارە»ی زۆری تیایە بۆ زۆر لە ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر و بەسەرهاتی مێژوویی ، جگە لەوە کە پڕە لە سنعەتی ڕەوانبێژیی «بەلاغە» ، وە ئەمـانە بە بێ ڕاڤە « شەرح » نازانرێن ، بە پێویستم زانی کە بە یـارمەتی خوا ڕاڤەی بکەم .

ئەم چەکامەیە کە هاتمە سەر ڕاڤەکردنی نوسخەیەکیترم دەستکەوت بە دەستنوسی شێخ محەمەدی مەحوی کە ئەویش لەبـەر نوسـخەیەکی نوسیوەتەوە کە بە دەستنوسی مەلا خاکی نوسراوە ، وە لای کتێبفرۆش مەحمود خاکی بووە ، لەپاشا کەوتووەتە لای کاکەی فەلاح ، وە لەلای ئەو لەگەڵ کتێبەکانی خۆیدا سوتاوە ، وادەرئەکەوێ کە ئەو نوسخەیە مـەلا خاکی خۆی دوای نوسخەکەی لای من بە ماوەیەك نوسیویەتەوە ، وە دوانزە شیعری لێ زیاد کردووە کە لە نوسخەکەی لای منا نین ، لەکاتی ڕاڤەکردنیا ئەو دوانزە شیعرە نیشان ئەدەین ، لەبەرئەوە نوسخەکەی لای خۆم دانا بە نوسخەی ژمارە ( ١ ) وە نوسخەکەیترم دانا بە ژمارە ( ٢ ) .

ئەمە چەکامەکەیە کە ڕاڤەی ئەکەین :

بیارێنێ خودا بارانی هەرچی فەیز و ئیحسانە
لەسەر ئەو باعیثی خەلق و گوزیدەی جەمعی ئەکوانە [١]

---

(١) ئەو باعیسی خەلقە : واتە لەسەر ئەو پێغەمبەرەی کە هـۆی هـاتنە جیهانی ئادەمی‌یە ، واتە مەبەست لە دروستکردنی ئادەمی هاتنەدی حەزرەتی موحەممەدە « درودی خوای لێ بێ » . گوزیدە : وتـەیەکی فارسی‌یە بەمانا هەڵبژاردە . ئەکوان : جەمعی کەونی بەمەعنا بونەوەرە ، واتە حەزرەتی موحەممەد هەڵبژاردەی هەمو بونەوەرە ، وە خوا لـە هەمو بونەوەرا ئەوی هەڵبژاردووە بۆئـەوەی کە بیـکا بە دواترینـی

دەمی سوبحی ئەزەل داکا ، هەتا شامی ئەبەد بڕژێ
بە یەك تاو بێ نەکو تاوتاو ، وەکو تاوی بەهارانە (٢)
بە سۆزەی نەونەسیمی گوڵ شەمیمی لوتفەوە داکا
نەسیمی نیسبەتی حەق دانەیێکی کا بە سەد دانە (٣)
لە لالەی ڕۆی خۆیو سەبزەی سەحابەی ژالە سا پڕژێ
هەزاری وەك من و تۆ بێن هوزاری ئەو گولوستانە (٤)
بە ئەبجەد (طا) نۆوو (ها) پێنج و پێنج و نۆ دەکا چواردە
بە (طه) حەق نیدای کردێ کە یەعنێ بەدری تابانە (٥)

---

پێغەمبەران ، وە زنجیرەی هەمو پێغەمبەرانی پێ داکوژێنێ ، وە نامەیەکی عیلمێوای بۆ بنێرێ ــ وەك قورئان بێ ــ کە تا ڕۆژگار پێش‌کەوێ و نهێنی بونەوەر بدۆزرێتەوە موعجیزەی ئەو باشتر دەربکەوێ .

(٢) ئەزەل : نەبڕانەوەیە لە سەرەتاوە ، واتە هەر بوبێ ، وە هەرگیز سەرەتای نەبوبێ . ئەبەد : نەبڕانەوەیە لە دوایدا ، واتە هەر بمێنێ و بڕانەوەی نەبێ . وەکو تاوی بەهارانە : میسالی بارانی تاوتاوە ، واتە بارانی ڕەحمەتەکە تاوتاو نەبێ بەمڕەنگە تاوێ بباری و تاوێ نەباری وەك بارانی بەهار ، بەڵکو هەمیشەیی بێ .

(٣) سۆزە : کزەبای سوك . نەسیم : بایەکی نەرم و شلە کە دار و درەخت نەجوڵێنێتەوە. نەونەسیم : نەسیمی تازە و نوێ . گوڵ شەمیم : بۆنی گوڵ ، واتە : ئەو بارانی ڕەحمەتە داکات بە شنەشنی نەسیم و بۆنی عەتر و عەبیری لوتف و میهرەبانی‌یەوە ، وە ئەو لوتف و میهرەبانی‌یە هەمو دانەیەکی ئەو بارانە بکات بە سەد دانە .

(٤) لالە : گوڵاڵە سورە . ژالە : شەونم . سا : وەك دانەی شەونم ، وەك ئەڵێت : خۆتاسا . هوزار : بلبل . واتە ئەو بارانی ڕەحمەتە بباری بەسەر گوڵاڵە سورەی ڕوخساری پێغەمبەر و سەوزەی یاران و هاوڕێکانیا بە وێنەی شەونم .

(٥) ئەبجەد : یەکەمینی ئەو وتانەیە کە هەر بیست و هەشت پیتەکەی عەرەبی‌یان تیا کۆبووەتەوە ، کە ئەوانەش ئەمانەن : ابجد ، هوز ، حطي ، کلمن ، سعفص ، قرشت ، ثخذ ، ضظغ . ئنجا بۆچی ئەم پیتانە وا

سەد و بیست و چوار ئەلفن نەبی ، نەجمن هەمو ، میهراو

زەکا پەیدا ، سوها گوم ما ، نەما جێی ئەم بخور مانە (٦)

ئەگەرچی ئەنبیا جوملە چرای پەروانەی ئەحبابن

هەمو پەروانەی ئەو شەمعەن ، هەر ئەو شەمعی شەبوستانە (٧)

---

کۆکراونەتەوە ، لەبەر حیسابی جومەل کە هەر لە دانانی مێژوودا بەکاردێنرێن ، وە ڕیزکراون بەپێی ژمارەی تاکان «آحاد» و دەیان «عشرات» و سەدان «مئات» و هەزاران «الوف» .

(٦) ئەلف : وتەیەکی عەرەبی‌یە بمانا هەزار . نەبی : پێغەمبەر . واتە : ئەنبیا لە ئادەمەوە تا خاتەم کە موحەممەدە سەد و بیست و چوار هەزارن . میهر : ڕۆژێکە کە بەئاسمانەوەیە . ئەو : واتە پێغەمبەر . ئەم وتەیە لە خوێندنەوەدا لەبەر وەزنی شیعر (میهرەو) ئەخوێنرێتەوە. زەکا : ڕۆژێکە کە بەئاسمانەوەیە . سوها : ئەستێرەیەکی زۆر بچکۆلانەیە لەتەنیشت ئەستێرەی حەوتەمی حەوتەوانەوەیە لە سەری لای خوارۆی ، چاوی تیژی پێ تاقی ئەکرێتەوە . واتە خوا لە سەرەتای جیهانەوە تا ئەمڕۆ سەد و بیست و چوار هەزار پێغەمبەری ناردووە بۆ سەر ئادەمی کە ئەمانە هەمو وەك ئەستێرە وان ، دواترینیان نەبی کە وەك ڕۆژ وایە ، کە ئەویش هەڵات ئیتر ئەستێرە نابینرێن چجای ئەستێرەی سوها .

(٧) جوملە : هەمو . پەروانە : ئەو پەپولانەن کە بە شەو دەوری چرا ئەدەن و بەدەوریا ئەسوڕێنەوە . چرای پەروانەی ئەحبابن . واتە : کاتی خۆی پێغەمبەرەکانی پێش ئیسلام هەمو چرا بون بۆ ئەوکەسانەی کە بڕوایان پێ هێناون لە ئوممەتەکانی خۆیان ، وە ئەوانیش وەك پەروانە بەدەوری ئەمانا سوڕاونەتەوە ، وە سەری خۆیان داناوە لە ڕێیانا ، ئەمڕۆ ئەو پێغەمبەرانە خۆیان وەك پەروانە وان بۆ ئەم پێغەمبەرە گەورەیە کە وەك چرا داگیرساوە بۆ ڕوناك کردنەوەی ڕێی خۆشی و خۆشبەختی هەردو جیهان بۆ هەمو ئادەمی . هەر ئەو شەمعی شەبوستانە : واتە ئێستا هەر ئەم پێغەمبەرەیە چرای تاریکستانی هەردو جیهان .

ئەگەرچی هەر نەبینێ بەدری دەیجوری زەمانێ بۆ
لەکن ئیشراقی ئەو شەمسە مەهە گەر ماهی کەنعانە [٨]

ئەگەرچی جوملە پێش‌کەوتن لەپاشا (شا) کە پێشیان کەوت
لە دەوری شەمعی ڕوخساری گڕان مانەندی پەروانە [٩]

هەمو حەڵقە بەگۆشن و غاشیە بەردۆشی ئەو شاهەن
ئەگەر عیسای کوڕی مەریەم ، وەگەر موسایی عیمرانە [١٠]

(٨) بەدر : مانگی چواردە . دەیجور : شەوی تاریکی ئەموستەچاو . ئیشراق : هەڵاتنی ڕۆژ . شەمس : ڕۆژێکە کە بەئاسمانەوەیە . مەبەس لەو ڕۆژە پێغەمبەری ئیسلامە . ماهی کەنعان : حەزرەتی یوسفی کوڕی یەعقوبە کە زۆر جوان بووە . واتە : ڕۆژی ناوچەوانی پێغەمبەر کە دەرکەوت هەمو پێغەمبەرەکانی‌تر لەگەڵ حەزرەتی یوسفا بون بە مانگی بەکشەوە و ونبون لە ڕوناکیی ئەما .

(٩) واتە : ئەم پێغەمبەرانە هەریەکە لەکاتی خۆیدا هات و پێش گەلی خۆی کەوت بە چرای زانین و زانیاری‌یەوە . لەپاشا کە حەزرەتی موحەممەد هات و پێش هەمو پێغەمبەران کەوت ، ئەوان واتە ڕۆحانی‌یەتیان هەمو وەك پەروانە دەوریاندا و دوای‌کەوتن .

(١٠) غاشیە : بە کاڵایەك ئەوترێ کە لەسەر هەمو کاڵایەکی‌ترەوە بپۆشرێ ، وەك عەبا و پەچە و شتی‌تری‌وا . دۆش : وتەیەکی فارسی‌یە بەمەعنا شانە . غاشیە بەردۆش : واتە پێش‌خزمەت و عەبا هەڵگری ئەو شاهەن کە حەزرەتی موحەممەدە .

من لام‌وایە بەکارهێنانی «حەلقە بەگۆش» و «غاشیە بەردۆش» بۆ پێغەمبەران ناوترێن چونکە جۆرە سوکی‌یەکی تیایە . بەڵێ منیش ئەڵێم پێغەمبەری ئیسلام شاهەنشاهی هەمو پێغەمبەرانە ، وە لە هەمویان بە پلە و پایە گەورەترە ، بەڵام نابێ پێیان بووترێ «حەلقە بەگۆش» و «غاشیە بەردۆش» . نابینیت هەرچەند پێغەمبەر ناوی یەکێك لە پێغەمبەرەکانی بردبێ هەر بە برای خۆی ناوی بردون .

( یەدی بەیزا )ی لە باخەڵ نیٖ نەما شەو ، شەم چیٖیە کەمڕۆ
ظوهوری نەییری جەبهەی ڕەئیسی ئەنبیایانە (١١)

کەلامیان ڕاستە هەر دوٖ بوٖ لەگەڵ حەق ئەحمەد و موٖسا
تەفاوەتیان وەلیٖ ئاخر زەمین تا عەرشی ڕەحمانە (١٢)

تەماشای دەعوەت و عیززی ( أبیتُ عِندَ ربّی ) کەن
خودا خانە خوداوو موستەفا خواندەی سەری خوانە (١٣)

(١١) یەدی بەیزا : موعجیزەیەکی حەزرەتی موٖسا بووە هەرچەند ویستبێتی نیشانی بدات دەستی ڕاستی کردووە بە باخەڵیا ، کە دەری‌هێناوە سپیٖ و ڕوٖناك بووە وەك چرا ، وەك قورئان ئەفەرموێ « وادْخِلْ یَدَكَ في جَناحِكَ تَخرُجْ بَیْضاءَ من غَیْرِ سوءٍ » واتە : دەست بکە بە باخەڵتا دەستت دێتە دەرەوە بە سپیٖ بە بیٖ‌هەموٖ جوٖرە نەخوٖشییەك. شەم : کورتەی شەمعی بەمەعنا موٖمە ، بوٖ وەزنی شیعر کورت کراوەتەوە . کەمڕوٖ : کورتەی کە ئەمڕوٖیە . نەییر : ڕوٖناك . واتە : با حەزرەتی موٖسا یەدی بەیزای خوٖی بشارێتەوە چونکە شەو نەما تا پێویست بین بە موٖمێکی وەك دەستی سپیٖ ئەو . ئەمڕوٖ کە ڕوٖژی ڕوٖناکی ناوچەوانی سەروٖکی هەموٖ پێغەمبەران هەڵاتووە ، ئیتر موٖم چ‌نرخێکی ما .

(١٢) واتە : ڕاستە کە هەردوٖلا ـ لە حەزرەتی ئەحمەد و موٖسا ـ قسەیان کردووە لەگەڵ خوادا ، بەڵام ئەم دوٖ گفتوگوٖیە زوٖر لەیەکەوە دوٖرن وەك دوٖریٖ زەویٖ لە عەرشی خواوە .

(١٣) لە کتێبی (بوخاریٖ)دا ئەگێڕێتەوە لە (ئەبوٖهورەیرە)ی هاوڕێی پێغەمبەر (ڕەزای خوای لیٖ بیٖ) کە پێغەمبەر لە ڕەمەزاناندا زوٖرجار ئێواران ڕوٖژوٖی نەشکاندووە ، وە بیٖ‌خواردنی ئێواران و پارشێوان سبەینیٖ‌یش بەڕوٖژوٖ بووە ، وە بەم‌بوٖنەیەوە زوٖر لە هاوڕێکانی چاویان لە پێغەمبەر کردووە ، وە ڕوٖژوٖی دوٖ ڕوٖژیان بە یەك گەیاندووە . پێغەمبەر کە ئەمە ئەزانیٖ جڵەوگیٖریٖ هاوڕێکانی ئەکات لەبەر ڕوٖژوٖبوٖنی دوٖ ڕوٖژ لەسەر یەك بە بیٖ‌شکاندنی ڕوٖژووەکەیان لە ئێواران، وە بە بیٖ پارشێوکردن . هاوڕێکانی عەرزیان کرد : ئەی خوٖت بوٖچی دوٖ ڕوٖژ بەڕوٖژوٖ ئەبیت

(أرِنی) و (لَنْ تَرانی) با نەڵێت و نەشنەوێ مۆسا
بە سائیل نادرێ ئاخر ئەوی دەرخواردی میوانە [(١٤)]

لەسەر یەك بێ‌ئەوەی ئێوارێ بیشکێنیت و دوای شەو پارشێو بکەیت ؟ فەرموی : « اِنّی ابیتَ یطعِمُنی رَبّی ویَسقینی » . واتە من شەو ڕۆژ ئەکەمەوە ، وە خوا خواردن و خواردنەوەم ئەداتێ ، یەعنی هێزی بەکێکم ئەداتێ کە خواردبێتی و خواردبێتیەوە . ئنجا بەم شیعرە باسی ئەم مەسەلەیە ئەکات ئەفەرموێ : تەماشای ئەم گەورەیێ پێغەمبەرە بکەن کە خوا دەعوەتی ئەکات بۆلای خۆی ، خوا ئەبێ بە خانەخوێ و پێغەمبەر ئەبێ بە میوان بۆ سەر خوانی کەرەم و میهرەبانێ خوای گەورە .

(١٤) (أرِنی) و (لَنْ تَرانی) : ئەم شیعرە ئاماژەیە بۆ داستانێکی حەزرەتی مۆسا کە قورئان بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەفەرموێ : « وَلما جاءَ موسی لِمیقاتنا وکَلَّمَهُ رَبَّهُ ، قال : رَبِّ أرِنی انظُرْ الیْكَ . قال : لَن ترانی » واتە : کاتێك مۆسا هات (بۆ کێوی تور) لەوکاتەی کە بۆمان دانابێ ، وە پەروەردگاری قسەی لەگەڵ کرد ، مۆسا وتی : خۆتم پیشان بدە ئەی پەروەردگارم تا تەماشات بکەم ، خوا فەرموی تۆ من نابینیت.

واتە حەزرەتی موحەممەد لە شەوی میعراجا کە بانگ‌کرا بۆ خزمەت خوا میوان بێ ، ئەگەر بڵێین خوای دیوە لەبەرئەوە بووە کە میوان بووە. بەڵام حەزرەتی مۆسا سوالکەر بێ کە داوای بینینی خوای کرد . کەواتە با مۆسا بە (رَبِّ أرنی) داوای بینینی خوا نەکات ، تا بە «لَنْ تَرانی» وەڵام نەدرێ ، چونکە ئەوی بە میوان ئەدرێ بە سوالکەر نادرێ .

مەلا خاکێ لەسەر ئەو فەلسەفەیە ڕۆیشتووە کە بە فارسێ ئەڵێ :

**چو رسی بە کوی دلبر ( ارنی ) مگو و بگذر**
**کە نیرزد این تمنی بە جواب (لن ترانی)**

واتە : کە گەیشتیتە بارەگای خۆشەویست «أرنی» مەڵێ و بڕۆ ، چونکە ئەم داواکردنە ئەوە ناهێنێت کە پێت‌بڵێن تۆ ئێمە نابینیت . بەڵام حەزرەتی مۆسا (درودی خوای لێ بێ) لەسەر ئەو فەلسەفەیە ڕۆیشتووە کە ئەڵێ :

**چو رسی بە کوی دلبر (ارنی) بگو و مگذر**
**شنوی ز دوست حرفی وگرچە (لن ترانی)**

واتە : کە گەیشتیتە بارەگای خۆشەویست (أرنی) بڵێ و مەڕۆ ،

طوفەیلی خوانی جوودی ئەو وجوودی هەرچی مەوجوودە
دو ( لَو°لا ) لوئلؤ و لالا فشانی زەینی ئەم خوانە (١٥)

دەمێ نەبوو لە دەمدا دەم چ لێدا دەم لە دەم ئادەم
مەشامی زێ زوکامی لەم شەمی ڕەیحانە حەیرانە (١٦)

---

چونکە وتەیەك ئەبیەیت لە دۆست با ئەو وتەیەش (لن ترانی) بێ .
وتەی (نەڵێت) لە شیعرەکەدا ڕوئەکاتە (أرني) . وتەی (ئەشنەوێ) ڕوئەکاتە (لن ترانی) . کەواتە لێرەدا لەف و نەشری مورەتتەب هەیە .

(١٥) دوو لەولا : مەبەس لەم دوو لەولایە فەرموودەی ( لَولاكَ .. لَولاكَ لَماخَلَقْتُ الافلاكَ )ەیە کە بە حەدیثی قودسی ئەگێڕڕێتەوە ، واتە ئەگەر تۆ نەبویتایە ـ ئەی موحەممەد ـ من ئەرز و ئاسمانم دروست نەئەکرد . کەواتە ئەم ئاسمان و زەمینە بە شەرەفی پێغەمبەرەوە دروستکراوە ، وە ئەم هەموو ناز و نیعمەتەی کە لەسەر ئەم خوانە گەورەیە دانراوە ، هەرچی لێی بخوات طوفەیلین ، وە بە سایەی پێغەمبەرەوە ئەیخۆن ، وە ئەم دوو لەولایە شاباشی لوئلؤ و لالە ئەکەن بەسەر ئەم خوانە گەورەیەدا .

(١٦) دەمی یەکەم بە مەعنا کاتە . دەمی دووهەم بە مەعنا دەمێکە کە قسەی لێ دەرئەچێ . دەمی سێهەم بەمەعنا هەناسەیە واتە لەکاتێکا کە حەزرەتی ئادەم هەناسەی لە دەما نەبوو ، واتە لە ناوەندی ئاو و گڵا بوو ، وە هێشتا گیانی نەکرابوو بەبەرا ، چێ بڵێ دەربارەی حەزرەتی موحەممەد کە یەکێکە لە نەوەکانی ، کاتێك کە گیانی کرا بەبەرا ، سێ جار پژمێ لەسەر یەك ، ئنجا سەر و چاوی هەڵهێنا و لەو حەلەدا بۆنێکی زۆر خۆشی بەسەرا چوو کە گۆیا بۆنی نیسبەتی پێغەمبەری ئیسلام بووە کە خوا داوێتی بە لوتیا تا گیانی ئارام بگرێ لە لەشیا .
پژمین ئەگەر دوو جار بۆ ئەوە نیشانەی تەندروستییە بۆیە سوننەتە لەو حەلانەدا بووترێ بەوکەسانەی کە ئەپژمن « يَرْحَمُكَ اللهُ » وە ئەگەر سێ جار بۆ ئەوە نیشانەی هەڵامەتە بۆیە پێی ئەوترێ « يَشْفيكَ اللهُ ».
ئنجا ئادەم کە سێجار پژمی واتە بە نەخۆشی هەڵامەتەوە هاتە دنیاوە ، وە کەسێك هەڵامەتی بێ بۆن ناکات نە خۆش نە ناخۆش ، کەچی ئادەم هەستی بە بۆنی خۆشی پێغەمبەر کرد، وە لوتی پڕ بوو لەو بۆنە، وەك لە نیو شیعری دووهەما ئەڵێ : « مەشامی ذێ زوکامی لەم شەمی ڕێحانە

( نَفَخْتُ فیهِ مِن روحی ) لە خاتەم پرسە نەك ئادەم
موعەللیم خاتەمە و ئادەم لەلای تیفلی دەبوستانە (۱۷)

غەرەز ئیسکاتی سائیل بۆ (قُل الروح )ی جواب فەرمۆ
وەگەرنێ کەی خەفێ بۆ جان لەو ئارامی دڵ و جانە (۱۸)

---

حەیرانە » . ئنجا بزانە ئەبێ ئەو بۆنە تا چ ئەندازەیەك خۆش و بەتین بوبێ .

مەعنای ئەم شیعرەی کە لێکمان دایەوە تۆزێك دەرئەکەوێ لەو شیعرەی کە بەدوایا دێ .

(۱۷) نَفَخْتُ فیهِ : لە سورەتی (حجر) و (ص)دا ئەفەرموێ « فاذا سَوَّیتُهُ ونَفَخْتُ فیهِ مِنْ روحی فَقَعوا لَهُ ساجدینَ » . واتە : کە ئادەمم دروستکرد و ڕێکم خست و گیانم کرد بەبەرا ، (هەمو) بکەون بە ڕۆدا بۆی ، واتە سەری بۆ دابنەوێنن ، ئنجا ئەم باسە لە خاتەم پرسە باست بۆ بکات نەك لە ئادەم ، چونکە ئادەم ئاگای لەو پەردانە نییە کە بەسەر دروستکردنی خۆیا هاتووە ، وەك پێغەمبەری خاتەم ئاگای لێیەتی بەهۆی قورئانەوە ، واتە خاتەم لەمڕووەوە مامۆستای بەڕاستییە ، وە ئادەم لە چاو ئەوا منالی بەرمەمکانەیە .

(۱۸) نێ : نا . جان : گیان . لەو ئارامی : بۆ وەزنی شیعر ئەخوێنرێتەوە لەوارامی . وەك قورئان بۆمان ئەگێڕێتەوە بە ئایەتی « وَیَسْئَلونَكَ عَنِ الروحِ » = پرسیارکراوە لە پێغەمبەر کە گیان چییە ؟ خواش پێی ئەفەرموێ « قُلِ الروحُ مِنْ امرِ رَبّی » بڵێ : گیان بە فەرمانی خوایە ئنجا شاعیر لێرەدا ئەڵێ : ئەم جوابە هەر بۆ دەمکوت کردنی ئەوکەسانە بووە کە ئەم پرسیارەیان لە پێغەمبەر کردووە ، ئەگینا پێغەمبەر خۆی لە خواوە زانیوێتی کە حەقیقەتی گیان چییە ؟

ئەوی پێویست بێ کە پێغەمبەران بیزانن هەر مەسائیلی دینییە لە عەقائید و شەریعەتی ئیسلامێ،غەیری ئەمانە وەك زانینی حەقیقەتیگیان و هەزاران شتیتر پێویست نییە بۆ پێغەمبەران کە بییانزانن .

لە « بوخاری »دا ئەفەرموێ کاتێك کە پێغەمبەر کۆچی کرد بۆ مەدینە ، بینی وا لەوێ تۆوی دار خورمای نێر ئەدەن لە دار خورمای مێ ، پێغەمبەر فەرموی : ئەمە چییە ئەیکەن ؟ وتیان لەکۆنەوە ئەمەمان هەر کردووە . فەرموی : ڕەنگبێ ئەگەر واشنەکەن هەر بەر بگرێ .

حەدیسی ( لی مَعَ اللهِ ) چ سیڕژێ بۆ لەبەینا چۆ
لە کەین‌وبەینی ئەم دوانە چزانن ئەم نەبی‌یانە (١٩)

کوڵا خەمر و قولی هەڵدا ، خوراشا جۆشی دا چەند ساڵ
موحەممەد ساغتر بادەی سەری نەو خومی گەردانە (٢٠)

لە ڕۆژێکۆ لە ڕۆژی ڕۆی ڕۆی گوهەر دەرجی دەمی دورجە
مەخاریج مەتڵەعی ڕۆژن هەمۆ یەك یەك جوداگانە (٢١)

---

ئەوانیش دەستیـان لێ هـەڵگرت . سـاڵی ئـایندە دار خورمـاکان بەرێکی‌وایان نەگرت کە بخورێ . ئەوانیش چۆن بە پێغەمبەریان وت . ئەمیش فەرمۆی : ئێوە لە کاروباری دنیایدا شارەزاترن .

(١٩) تەواوی فەرمۆدەکە ئەمەیە « لی مَعَ اللهِ وَقتٌ لایَسَعُنی فیهِ نَبیٌ مُرسَلٌ ولا مَلَكٌ مُقَرَّبٌ » واتە : وەختی‌وام هەیە لەگەڵ خودا ــ وەك کاتی هاتنە خوارەوەی سرۆش بێ بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەر ــ نە هیچ پێغەمبەرێکی خاوەن نامە ئەتوانێ ببێ بە هاوبەشم لەو کاتانەدا ، وە نە هیچ فریشتەیەکی بارەگا .

(٢٠) بادە : شەرابە . خوم : کۆپەیە . گەردان : لوغەتێکە لە گەردۆن . وا دەنگ بڵاوە کە شەراب تا بمێنێتەوە لە کۆپەدا جۆش ئەخوا و قولـپ ئەدا و پوختەتر و بەتین و تەوژمتر ئەبێ لەسەر هەستی ئادەمێ . لێرەدا شاعیر بەم شیعرە تەشبیهی دنیا ئەکات بە یەك کووپەی شـەراب کە لـە ساڵەهای ساڵەوە جوش‌بخوا و پوختە ببێ ، تا دەمی پێغەمبەری ئیسلام وە حەزرەتی موحەممەد «درۆدی خوای لێ‌بێ» پوختەتری شـەرابی ناو کۆپەی تازەی گەردۆنە ، واتە ئایینی ئیسلام و دەستۆری قورئان باشترین ئایین و دەستۆرن بۆ ئـادەمێ ، وە بەتـین‌تر و بەتـەوژمترە لەسـەر بیروباوەڕی .

(٢١) لەڕۆژێکۆ : لە ڕۆژێکەوە . لە ڕۆژی ڕۆی : واتە لە ڕۆی کە وەك ڕۆژ وایە . گوهەر : گەوهەر ، مەبەست دانی پـیرۆزی پێغەمبـەرە کە وەك گەوهەر دەرجن لەناو دەمیا ، واتە ڕیزکراون لەناویا . دورج :وتەیەکی عەرەبی‌یە بمەعنا قوتۆیەکی پچکۆلانەیـە کە ژنـان شۆشـەی عـەتری پچکۆلانەی تیا هەڵئەگرن ، تەشبـیهی دەمی پێغەمـبەری کردووە بەو

بەیانی بەینی (جاه) و (جا) لە بەینی ئەنبیادا کەم
ڕەیاحینن هەمۆ ئەمما موحەممەد ڕەوحی رەیحانە (٢٢)

شکاندی پشتی گا و ماهیٖ بە تەمکین وەختی دانیشتن
بە لەهجە و لەنجە سەد کەبکی دەریٖ و سەروی بەقوربانە (٢٣)

لەتەنگ ئاوێنەی ئەووەڵدا بە کەس ڕۆی خۆی تەواو نەنواند
دووەم باڵانما ڕۆنە بڕۆ ڕۆی ئەو لەوا ڕوانە (٢٤)

قوتووە لە پچوکیٖ و بۆنخۆشیدا . مەخاریج : جەمعی مەخرەجە ، واتە ئەو شوێنانەی لەناو دەما کە وتەی لیٖ دێتە دەرەوە . مەطلەع : شوێنێکە کە ئەستێرە یا ڕۆژی لیٖ هەڵدیٖ . جوداگانە : جیا جیا .

واتە : لەڕۆژێکەوە لەڕۆی ڕۆژینی پێغەمبەردا دانی گەوهەرینی ڕوواون هەرچی لە دەمی هاتبێتە دەرەوە هەمۆی وتاری بەرز و بەنرخن وەك ڕۆژ کە لە کەلۆ (برج)ی خۆی بێتە دەرەوە ، واتە : پێغەمبەر فەصیحترین عەرەب بووە وەك خۆی فەرمۆیەتی « انا أفصحُ مَنْ نَطَقَ بالضّاد » .

(٢٢) جاه : وتەیەکی عەرەبی‌یە بەمانا پایە و پلە و ڕێز . جا : شوێن .

(٢٣) گا : مەبەست ئەو گا گەورە خەرافی‌یەیە کە گۆیا ئەرز لەسەر پشتی ئەو وێستاوە . ماهیٖ : ئەو ماسی‌یە گەورە خەرافی‌یەیە کە گۆیا زەویٖ بە خۆی و بە گاکەی ژێریەوە لەسەر پشتی ئەو وێستاوە ، واتە پێغەمبەر لەکاتی دانیشتنا ئەوەندە سەنگین و گران بووە هەمۆ جاریٖ بە سەنگینیٖ و گرانیٖ خۆی پشتی ئەو گا و ماسی‌یەی هێناوەتە قرم و هۆڕ . لەهجە : شێوەی قسە و گفتوگۆ . لەنجە : ڕۆینە بە شانەوشان. کەبکی دەریٖ : وتەیەکی فارسی‌یە بەمانا جۆرە کەوێکی کوێستانی‌یە کە لە کەو گەورەتر و خوێندنی خۆشترە . بە کوردیٖ پێی ئەڵێن : کەودەر ، لە شاخەکانی قەندیل ئێجگار زۆرە .
کەبکی دەریٖ ڕۆنەکاتە لەهجە و سەرو ڕۆنەکاتە لەنجە .

(٢٤) شاعیر تەشبیهی دنیای کردووە بە پارچە ئاوێنەیەکی پچوك کە ئەگەر تەماشای خۆتی تیا بکەیت یا تاقە چاوێکت نیشان ئەدا یا لایەك لە گوێت ، چونکە ئاوێنەکە زۆر پچوکە وە ڕۆبەڕۆی هەمۆ ئەندامت ناوەستێت ، بەلام ئەگەر ئاوێنەکە گەورە و باڵانما بۆ ئەوا هەمۆ لەشت

له لەعلی نابی نایابی وتم ئاخر دەمێ دەم دەم
حەلاوەت خۆش دەم و لێومی بە هەم چەسپانە چەسپانە (٢٥)

لەپی خۆی ئەو کەسە پەل کرد له عیشقی یوسف ئەر دەیدێ
دڵی خۆی بێخەبەر ئەبڕێ لەجیاتێ دەستی ، مەستانە (٢٦)

له داغی جێبی ، گوڵ چاکی یەخەی خۆی برد هەتا دامەن
مەڵێن یاغێ بو باغێ بۆ ، ئەوا یاخێ بو خەندانە (٢٧)

نیشان ئەدات لە سەرەوە تا خوار ، ئنجا شاعیر مەبەستی ئەوەیە بڵێ دنیا وەك پارچــە ئاوێنەیــەکی پچوك وایــە بۆ نیشـــاندانی گەورەیێ پێغەمبەر . بەمڕەنگە لەسەدا یەکێکی نیشان نادات ، بەلام ڕۆژی قیامەت وەك ئاوێنەی باڵانما وایە هەمۆ گەورەیێ پێغەمبەری تیا دەرئەکەوێت ، نەخوازەلا لە مەیدانی شەفاعەتا .

(٢٥) لەعلی ناب : جۆرە لەعلێکی زۆر جوان و پەسەند و بەنرخــە . واتــە نیازم بۆ لە دەم و لێو و قسـه و گفت‌وگۆی شیرینی پێغەمبەر بدوێم و قسەی لێبکەم ، بەلام شیرینێ فەرمۆدە و فەرمایشەکانی دەم و لێومی بەیەکا نۆساند بەجۆرێك کە نەتوانم ئیتر قسە بکەم .

(٢٦) ژنە میسری‌یەکان کە هاوڕێی زولەیخای ژنی عەزیزی میسر بۆن ، لۆمەی زولەیخایان کرد کە بۆچی وا حەزی لە غولامێکی خۆی کردووە کە حەزرەتی یوسفە ؛ زولەیخاش کە ئەمەی بیست ناردی ئەو ژنانەی بانگ‌کرد بــۆ ماڵی خۆی ، وە لە ژوورێکی گەورەدا دانیان لەسەر دۆشەك و پشتی ، وە سەرو کێردی دایە دەستیان ، ئنجا بە یوسفی وت کە بچێتە ژوورەوە لە بەردەمیانا رابوەستێ . حەزرەتی یوسف کە چــووە ژوورەوە و ژنــەکان چاویان پێکەوت هەمۆ ئەبلەق بۆن لە جوانیی یوسف ، وە چاویان لێ نەئەترۆکاند ، وە ئاگایان لە کێردەکەی دەستیان نەما ، وە هەمۆ دەســتی خۆیان لە چەند لایەکەوە بڕێ . لێرەدا شاعیر ئەڵێ ئەوانەی کە بە چــاو پێکەوتنی یوسف دەستی خۆیــان بڕێ ، ئەگەر پێغەمبەریــان ئــەدێ سەرمەستانە لەجیاتیی دەستیان دڵی خۆیان ئەبڕێ .

(٢٧) جیب : یەخەو بەرۆکە . یەخەو بەرۆك بۆ ئادەمێ شتێکی زۆر گرنگە ، لەدوای ڕوخسار یەکەمجار یەخە دەرئەکەوێ . ئنجا ئەگەر پاك و تەمیز و ڕێکوپێك بۆ ئەوا ئەو ئادەمی‌یە ئەچێتە دڵەوە ، وە ئەگەر وانەبۆ ئــەوا

له ئەفکاری دەمێ ماته ، وەیا نەشئەی لەگەڵدا بێ
له بێچاو و دەمێ خونچه عەجەب کوڵ چاوی حەیرانه (٢٨)

ئەترسم بینه پامالی بڵند تەبعانی سەر فکرم
پەسین پایەی مەقاماتی بڵێم کەیوانی کەیوانه (٢٩)

---

هیچ . جا لەبەرئەوه پێغەمبەر هیچکاتێك یەخه داچەکاو نەبووه ، وه مۆی سەرسنگی دەرنەکەوتووه ، هەروەك کاڵای هەرگیز چڵکن نەبووه ، بەڵێ زۆرجار کاڵای پێنەکراو بووه . بەڵام پاك و تەمیز بووه ، چونکه خوا لـه قورئانا به ئایەتی « وثيابكَ فَطَهِّر » فەرمانی پێداوه به پاك و تەمیزێ بەرگ و کاڵای . شاعیر لێرەدا ئەڵێ گوڵ که پۆرکی خۆی لەت ئەکات و یەخەی خۆی دائەدڕێ تا خوار لەداخی جوانێ و ڕێكوپێکێ یەخـه و بەرۆکی پێغەمبەره ، کەواته مەڵێن گوڵ باغێ بۆ ، واته گوڵی باخـان بۆ . وه باغی بۆ واته خاوەن باغ بۆ ، بۆیه وا یاخێ بۆ ، وه پڕ بـەدەم پێ‌ئەکەنێ ، واته ئەمانه هیچیان نی‌یه ، بەڵکو لەداخانا یەخەی خـۆی دائەدڕێ . ئەم شیعره و شەش شیعری دوایی‌یەکەی له نوسخەی ژماره (١)دا نین .

(٢٨) له ئەفکاری دەمێ ماته : واته : پێغەمبەر لەبەر زۆر بیرکردنەوەی خۆی قسەی کەم کردووه ، سا مەگەر جوابی پرسیـارێکی دابێتـەوه ، یـا فەرمۆدەیەکی بەرزی فەرمۆبێ که بمێنێتەوه به سەرمەشق بۆ پاشەڕۆژی موسوڵمانان . ئەم فەرمۆدانەش زۆر کەم زەردەخەنەیان لەگەڵا بووه ، هەروەك تەمـاشا کردنی بەملا و بەولادا زۆر کەم بووه . خۆلاسـه وەك خونچـەی گوڵ وابووه نه چاوی سـەیر و سەیـاحەتی بووه ، نه دەمی قسەکردنی زۆری بووه ، بەڵکو چاوی هەر بۆ وردبۆنـەوه و تێگەیشـتن بـووه له نهێنێ بۆنەوەر و ڕاستێ شتان « حقايقى اشيـا » که ئەمـه خۆیەکی زۆر بەرز و پەسەنده ، بۆیه هەرچێ گوڵ هەیـه له بێچـاو و دەمیی خونچه سەرسام و ئەبلەقن ، وه لەسەر سامیدا چاویان داپچڕیوه له خونچـه .

(٢٩) کەیوان : به فارسێ ئەستێرەی زوحەله که ٨٨٦ ملیۆن میل له ڕۆژەوه دۆره ، وه به بیست و نۆ ساڵی ئێمه چەرخەیەك ئەکات بەدەوری ڕۆژا ، واته ئەگەر بڵێم دواهەمـین پایەی نزم و بچـوکی پێغەمبـەر گەلێ لـه

ئەمە مەعلومە خاکی ! نەعلی کەمتر بەندەی ئەو شاهە
کە دوڕڕی تاجی فەرقی فیرقەی ئەقطابی کەیانانە (٣٠)

لە دوی هەمڕەنگی بۆنێکی کەفی پێی پاکی ئەو وێلە
گولی چی ، بلبل ئیتر چی ئەوێ لەم سوری سەرپانە (٣١)

بە یادی ڕوی شەو ئەو ڕۆژە بە ڕۆژە ڕوی لە ڕوی ڕۆژە
کە دوری ئەسلی دەرد و دا بەڵێ هەر عەکسی دەرمانە (٣٢)

---

ئەستێرەی زوحەل بەرزترە، ئەترسم قسەکانم ببن بە پێخوستی ئەفکاری ئەو بلند سروشتانەی کە لەمەولا دێن کە بیروڕایان گەلێ لە بیروڕای من بەرزتر و بلندتر بێ ، وە قسەکانم بە درۆ بخەنەوە ، وە بە هیچی دەرکەن.

(٣٠) خاکی : واتە ئەی خاکی ! فەرق : تەپلەسەر . ئەقطاب : سەرۆکەکان . کەیانی : خێزانێکی گەورەن ، ماوەیەکی زۆر شای ئێران بوون لە زۆر کۆنا ، پێیان وتوون (کەیانی) چونکە ناوی شاکانیان بە وشەی ( کەی ) دەست پێئەکات کە بەمانا شایە ، وەك (کەیکاوس) و (کەیخوسرەو) و (کەیقوباد) .. هەتەد . واتە : ئەی خاکی ! سۆلی پچوکترین بەندەی ئەو شایە کە پێغەمبەرە ، دوڕی تاجی سەری گەورە گەورەی کەیانی یەکانە .

(٣١) واتە : هەرچی گوڵ و عەتر و عەبیری جیهان هەیە ، نەك بەدوی بۆنێکی بەری پێی ئەوا عەودالّ بن ، بەڵکو بەدوی بۆنێك کە لە بۆنی بەری پێی ئەو بچی وێڵ و سەرگەردانن ، ئیتر بۆنی گوڵ ئەبێ چی بێ ؟ و تاکەی بلبل بەدەوری ئەم گولە سەرپانانەدا ئەگری و ئەبارێنێ .

(٣٢) ڕۆژە بە ڕۆژە : وەك گولە بەڕۆژە وایە لە داڕشتن و دروستکردنا ، واتە چۆن گولە بەڕۆژە ناوی گوڵێکە کە هەمیشە ڕوی لە ڕۆژە ، ڕۆژە بە ڕۆژەش پێغەمبەرێکی پایەبەرزە کە هەمیشە ڕوی لە ڕۆژێکە کە خوایە تا ڕوناکی لێ وەرگرێ و بیدا بە موسولمانان تا لە تاریکی شەوی نادانی دوربکەونەوە ، نابینیت ئەگەر بتەوێ لە دەردودا بەدور بیت ئەبێ دەرمان بخۆیت ، وە تا دەرمان بخۆیت دورتر ئەکەویتەوە لە نەخۆشی و دەردودا ، ڕوناکیش تا لە پێغەمبەرەوە وەربگرن دور ئەکەونەوە لە تاریکی دین و دنیا .

موجەعەد گێسووی لولی بە لەولاوێ چ ژانی کرد
بە زەیلی هەر چلا دەستی دەپێچێ دەستە دامانە (٣٣)

دلارا ڕاستین سەروی قەدی دلجۆی عەتارید دێ
لە سەهمی سەهمی قەددی سەهمی قەددی خەم بو قەوسانە (٣٤)

جەنابی حەزرەتی بارێ بە تورڕەی ئەو ئەڵێ ( والـّلیل )
بە غورڕەی نەیری جەبهەی خوا خۆی ( والضحی ) خوانە (٣٥)

لە هەولی ڕۆژەکەی ( یَـوْمَ یَفِرّ المَرْء ) وا بیبین
ئەوی جێی گۆ و چەوگانە ، ئەوێ مەیدانی مەردانە (٣٦)

(٣٣) موجەعەد : کرژ . گێسو : پرچی پشتی گوێ . لەولاوێ : ئەم (ی)ی دوای لەولاوە لەسەر شـێوەی قەڵادزەیـە کە بـە (ئەحمـەد) ئەڵێـن ( ئەحمەدی ) و بە ( قادر ) ئەڵێن (قادری) . پێغەمبەر « درۆدی خوای لێ بێ » زۆرجار تۆکی سەری درێژ بووە تا گەیشتووەتە نەرمـایی گوێچکەی ، واتە پرچی کرژ و لولی ئەوەندە جوانە بە جوانیی خـۆی دەردی داوە بە لاولاو ، واتە لاولاو لەداخانا ژانی کردووە ، وە لەبـەر ژانی دلی خۆیەتی کە لەگەڵ دەستی بگاتە هەر چلێك دەسـتی تێـوە ئەپێچێ وەك دەستەو دامانی بێ وایە .

(٣٤) دلارا : کورتەی دڵئارامە . دلجۆ : دلخوا . سەهمی یەکەم بەمانا سام و ترسە . سەهمی دۆهەم و سێهەم بەمانا تیرە ، واتە ئەی ئارامی دڵ ، عەطارید کە یەکەمین ئەستێرەی گەڕۆکە ، کە چاوی کەوت بە ڕاستترین سەروی قەدی دلخوای تۆ ، لە سامی ئەو قەد و بالایەی کە ئەڵێی تیرە لە ڕاستیدا ، تیری قەدی عەطارید کۆمبووەوە وەك کەوان .

(٣٥) تورڕە : مۆی پێشانێ . غورڕە : ناوچەوان . واتە : خوای گەورە کـە سوێند ئەخوات بە شـەو لە سوورەتی « واللّیل »دا مەبەستی مۆی ڕەشی پێشانیی پێغەمبەرە کە وەك شەو وایە لە ڕەشـیدا ، وە کە سـوێند ئەخوات بە چێشتەنگاو لە سوورەتی « والضّحی »دا مەبەستی ناوچەوان و تەوێلی پاکی پێغەمبەرە کە وەك ڕۆژ لە چێشتەنگادا ڕۆناکە .

(٣٦) هەول : سام و ترس . یَومَ یَفِرُ المَرْء : ئامـاژە «ئیشـارە»بە بـۆ ئایەتی سوورەتی « عَبَسَ » کە ئەفەرموێت « یَـومَ یَفِرُ المَرءُ مِـنَ

لەلای هەر سەروەرێ سەد داد و بێداد و شەفاعەت کەی
ئەڵێ من نیمە حاشا تاقەتی ئەم داو و دیوانە

بناڵێنی وەکو بلبل ، یەخەی خۆت لەت بکەی وەك گوڵ
دەمێ ناپشکوێ وەك خونچە ، دڵ خوێنینی ئەحزانە

( صفي الله ) نی‌یە قابیل خەلاس کا (هابیل) و (قابیل)
لە نەسل و یاری بێزارە چ جێی ئەغیار و بێگانە (٣٧)

( نجیّ الله ) لە تۆفانی غەمی خۆیا وەها غەرقە
لە ساما (سام)ی لا (یافیث) وەزانی (حام) (کەنعان)ە (٣٨)

---

اخیه ، و امّه و ابیه و صاحبتِه و بَنیه » واتە کاتێك کە ڕۆژی دوایێ هات ، ئەو ڕۆژەی کە مەردوم ڕەو ئەکات لە برا و لە دایك و لە باوك و لە ژنی و لە کوڕانی ، کەس لەتاو خۆی ئاگای لە کەس نامێنێ . ببین : واتە ببینە وەبزانە چڕۆژێکی تەنگ و چەڵمەیە ، ڕۆژێکە کەس هیچی بەدەست نی‌یە تەنها خوا نەبێ ، وە کەس شەفاعەتی پێ ناکرێ تەنیا حەزرەتی موحەممەد نەبێ درۆدی خوای لێ بێ .

(٣٧) صَفِیُّ الله : حەزرەتی ئادەمە کە هەڵبژاردەی خوا بووە ، دوو کوڕی بووە (هابل) و (قابل) لەوڕۆژەدا ناتوانێ کوڕەکانی خۆی ڕزگار بکات چجای بێگانە .

قسەیەکی خۆش : لە گەڕەکی ئێمە کە سابونکەرانە ، یەکێك بوو ناوی (ئەحەی مەلا) بۆ پێنج فەرزە لە مزگەوتی ئێمە جەماعەتی ئەکرد . ڕەمەزانان بە دەنگی بەرز لەگەڵ ئەهلی جەماعەتەکەدا ویردی دوای تەراویحی ئەخوێند ، هەمو شەوێك کە ئەگەیشتە ئەم ویردە ( الله لا الهَ الاّ هو ، آدم صفیّ الله ) ئەو چونکە نەخوێندەوار بوو ، وە نەی‌ئەتوانی ( صاد ) بلێ هەر ئەیوت (ئادەم سەفیهوڵلا) . هەرچەند پێمان ئەوت وا مەڵێ و وا بلێ ئەو هەر ئەیوت ئادەم سەفیهوڵلا ، وە ئادەم هەر سەفیهوڵلا بوو تا ئەو مرد ، خوا لێی خۆش بێ .

(٣٨) نجیّ الله : نوح پێغەمبەرە کە خوا لە طۆفانی ڕزگار کرد ، چوار کوڕی بووە (سام) و (یافیث) و (حام) و (کەنعان) لە ترس و سامی ئەو ڕۆژە (سام)ی لا ئەبێ بە (یافیث) و (حام)ی لا ئەبێ بە (کەنعان) .

خەلەل تەرزی (خەلیل) گیرە ، خەیاڵی خێڵی خۆی ناکا
چ‌حاڵی بێ خەلیلیوا تەغافول وەرزی خوللانە (٣٩)

خۆ داوۆد دێ کەوا کردی زرێ لەم ئاسنی ساردە
لەتاوی خۆی تەواو دڵ سەردی ئەحواڵی سولەیمانە (٤٠)

لە بیمی ئینتیقامی قادری موختاری زوتتیقام
سولەیمان بیمی مارێکی هەیە لەم مورە وردانە (٤١)

(کلیم الله) کەلاموللاٰ ئەخۆی سەرسام و دەهشەت ما
بە خۆی مەشغوڵە ناپرسێ لە غەیری گەرچی عیمرانە (٤٢)

---

(٣٩) خەلەل : ناکۆکی . طەرز : جۆر . خەلیل : حەزرەتی ئیبراهیمی باپیرە گەورەی پێغەمبەر . وەرز : مایە . واتە ناکۆکی بە ڕەنگێکیوا ئیبراهیمی خەلیل دائەگرێ هەرگیز یادی خێڵ و کەس‌وکاری خۆی ناکات . ئنجا ئەبێ ئەو ڕۆژی قیامەتە چ‌ڕۆژێکی تەنگ و چەڵەمە بێ کە بۆ پێغەمبەرێکیوا گەورە و پایە بەرز بێ بە مایەی چاو قوچان و ڕوو وەرگێڕانی لە هەموو ئاشنا و ڕۆشنایەکی .

(٤٠) حەزرەتی داوۆد تاقە موعجیزەیەکی بووە ئەویش ئەمە بووە کە ئاسنی ساردی لە دەستا نەرم بووە ، وەك قورئان ئەفەرموێ « والنّا لهُ الحَدید » واتە ئاسنمان بۆ نەرم کردبوو ئەیکرد بە زرێ و ئەیفرۆشت ، وە بەوە ئەژیا . ئەم حەزرەتی داوۆدە تاقە کوڕێکی بووە کە حەزرەتی سولەیمانە ، ئەو ڕۆژە لەتاو خۆی ئاگای لە کوڕەکەی نامێنێ .

(٤١) ئەم شیعرە ئاماژەیە بۆ داستانەکەی حەزرەتی سولەیمان کە بە خۆی و لەشکرێکی ئێجگار زۆرەوە هات بەناو دۆڵ و دەرەیەکا کە هەموی هێلانە مێروولە بۆ وە شای مێروولەکان فەرمانی دا بە هەرچی مێروولەی ئەو ناوچەیە بۆ کە بچنەوە ناو شارەکانیان تا سولەیمان و لەشکرەکەی دایاننەشێلن ، ئنجا ئەفەرموێ حەزرەتی سولەیمان لەوڕۆژەدا کە خوا تۆڵەی بزنی شاخدار ئەسێنێ ــ ترسی ئەوەی هەیە کە مێروولەیەك لەو مێروولانەی کە بوون بە ژێر پێی لەشکری سولەیمانەوە ببن بە مار و بدەن بە سولەیمانەوە .

(٤٢) کلیم الله : حەزرەتی موسایە کە هەموجارێ لە کێوی تور قسەی لەگەڵ

مەسیح ئەرچێ لەجێی ئەولاد حەتتا باب و داکی بێ
لە مەریەم غافڵە لەو نەوعە ڕۆژە لەو مەقامانە (٤٣)

هەمێ‌یان نەفسی نەفسێ گۆن ، وەکێ گۆ موزتەریب حاڵن
هەمێ گەردەن‌خەمی غەمم و هەمی خۆن سەولەجانانە (٤٤)

موحەممەد یەعنی سەروی جۆیباری ڕاست کرداری
بە یاری باری دێ بێ ڕستگاری ئەم زەعیفانە (٤٥)

---

خوادا کردووە . کلام الله ئەخوێت سەرسام و دەهشەت ما : ئەمە ئیستیلاحێکی کوردی‌یە لەمجۆرە شوێنانەدا بەکارئەهێنرێت . ئەبێژرێ : ئەمڕێ فیسار کەسم دێ کلام الله ئەخوێت تازە لە گۆڕ هاتووەتە دەرەوە . واتە حەزرەتی مێسا لەوڕۆژەدا ئەوەندە ئەترسێ و سەرسامە ئاگای لە عیمرانی باوکی نی‌یە .

(٤٣) مەسیح : حەزرەتی عیسایە کە نە باوکی بووە و نە ڕۆڵەی بووە ، بەڵکو لەجێی هەموان هەر دایکی بووە لەگەڵ ئەوەشا لەوڕۆژەدا لە مەریەمی دایکی بێ‌ئاگایە . ئنجا لەلایەك پێغەمبەران لەوڕۆژەدا وا لە تەنگانەدا بن ئەبێ موسوڵمانان نەخوازەڵا گوناهبارەکانیان لە چ تەنگانە و خەم و خەفەتێکا بن . دیارە هیوای هەموان هەر شەفاعەتی پێغەمبەرە وەکو ئەڵێ : هەمێ‌یان نەفسی نەفسێ گۆن .. هەتەد .

(٤٤) نەفسی نەفسێ گۆن : واتە کەس ناتوانێ یارمەتیی کەس بدات وە هەمێ کەسێك ئەڵێ : هەر خێم ڕزگارم بێ ئیتر هیچی‌ترم ناوێ . گۆی یەکەم وتەیەکی فارسی‌یە بەمانا وتنە ، گۆی دێهەم کوردی‌یە بەمانا تێپێکی خڕە لە دار دروست کراوە ، فتبۆڵ چۆن یاری‌کەران ئەیانەوێ بە شەق تێی‌هەڵدەن ، وە لە کێڕی خێی دەری‌کەنە دەرەوە ، گۆش یاری‌کەران ئەیانەوێ بە دارێکی ئەستوری سەرچەماوە لێی‌دەن تا لە کێڕی خێی بیبەنە دەرەوە ، وە ئەم یاری‌یە پێی‌ئەڵێن : شەقێن . گەردەن‌خەم : واتە لەبەر خەم و تەمی خێیان سەریان شۆڕ و ملیان خوار بووەتەوە وەك صەولەجان کە گێچانە .

(٤٥) جێیبار : جێبارێکی درێژ و پان و پێڕە کە هەڵگیرابێ و ئاوی پیا بڕوا بە زۆری. ڕاست‌کرداری : خاوەنی کردەوەی ڕاست. باری : لە (باریء)ی

مەسەل تەمسیلی وەسفی ئەو بە زیهنی دڵ عەقیمی من
حیکایەی چاوی خەففاشە و ڕوخی میهری درەخشانە (٤٦)

لە تەشریحی بورۆجی وەسفی ئەودا هەر ئەمە چاکە
بکا ئیقراری نادانێ هەچێ داناوو نادانە (٤٧)

لە وەسفی پاکی ئەو ذاتە زوبان لاڵە وەکو لالە
چ جێگەی (قیس) و (سەحبان)ە سەناخوانی کە سوبحانە (٤٨)

عەرەبێ وەرگیراوە کە بەمانا خوایە . واتە : حەزرەتی موحەممەد کە وەك سەروێك وایە کە لە قەراغی جۆبارێکی ڕاستێ و ڕاستکرداریدا ڕوابێ و گەورە بوبێ ، بەیارمەتێ خوا دێ بۆ ڕزگارکردنی گوناهبارانی ئوممەتێ .

(٤٦) دڵ عەقیم : دڵێ کە هیچی لێ نەوەشێتەوە . خوففاش : شەمشەمە کوێرە . واتە : چاوی شەمشەمە کوێرە چەند تێ ئەگات لە گەورەیێ و ڕۆناکێ و پرشنگی ڕۆژی درەخشان بەئاسمانەوە ، ژیرێ و تێگەیشتنی منیش هەر ئەوەندە تێ ئەگات لە گەورەیێ پێغەمبەر .

(٤٧) بورۆج : جەمعی برجی بەمانا کەلوەە. شاعیر لێرەدا تەشبیهی پێغەمبەری کردووە بە ڕۆژ لە ئاسمانا کە دوانزە کەلۆی هەیە وەك (حەمەل) و (ثور) و (جەوزا) و (سەرەطان) و (ئەسەد) و (سونبولە) و (میزان) و (عەقرەب) و (قەوس) و (جەدی) و (دەلو) و (حوت) بێ . واتە : پلەی گەورەی پێغەمبەر بە کەس ناژمێررێ و نازانرێ کەواتە ڕەوا نییە کەس دەمی بۆ بەرێ ، بەڵکو واچاکە بۆ دانا و نادان کە دان بنێن بە نادانێ خۆیانا لەمڕووەوە .

(٤٨) قیس : کوڕی ساعیدەی کوڕی عەمرە ، یەکەمین دواندەر « خطیب » و شاعیری عەرەب بووە ، پێغەمبەر بە منداڵێ لە «عوکاظ» دیویەتی . سەحبان : کوڕی زوفەری وائیلییە ، شاعیری پێغەمبەر بووە ، سەد و هەشت ساڵ ژیاوە (*) . واتە یەکێك خوا لە قورئانا پێی بڵێ « واتك

(*) دائیرەتولمەعاریفی قەڕنی بیستەم .

لە وەسفی ذاتیکا عیللە لە خەلقی عالەما ئەو بێ
(نگفتە باشم) هەرچیم وت ، هەچیم وت دڵ پەشیمانە (٤٩)

سەنای (یاسین) و (تاها)ی حەق لەسەر ئەو خاتەمە خەتمە
نە هیچ کەس وەك ئەم ئەو ناسە ، نە کەس وەك ئەو لە ئەم زانە (٥٠)

ئەمان (یا خیرَ خَلقِ الله) دەخیل یا (ملجأ العاصین)
لەبۆ ئیفلاحی خۆم عەرزت ئەکەم بەیتی فەلاحانە (٥١)

فەلاحێ ئەم نۆ ئەفلاکی ڕەفیعە خەرمەنی ئەو بێ
دو دەنکە مرۆر و زیزانە لەلای کەی عەیبی خەرمانە ! (٥٢)

سەگی پیس لایقی دەرگای سەحابەی پاکی چاکی تۆ
نیـیە ، وەرنێ لە دەرگایان ئەکەوتم پاسەوانانە (٥٣)

---

لَعَلی خُلُقٍ عَظیمٍ » ئیتر چپێویستییەکی هەیە بە مـەدح و ثەنـای قیـس و سەحبـان .

(٤٩) واتە یەکێك مایەی هاتنە جیهانی ئەم جیهان و جیهانیـیانە بێ . نگفتـە باشم : گوفتارێکی فارسییە ، واتە ئیتر با هیچ نەڵێم .

(٥٠) یاسین : بەلای هێندێ زاناوە بەمانا گەورەیە . طاها : بەلای هێندێکەوە بەمانا ئەی خۆشەویـستم .

(٥١) ئیفلاحی خۆم : واتە ڕزگارکردنی خۆم . بەیتی فەلاحانە : واتە شیعرێك کە قسـە لە فەلاحەتی خوا ئەکات لەم بۆنەوەرەدا .

(٥٢) ئەم نۆ ئەفلاکە کە ناو ئەبات لەسـەر قسـەی حوکەمای کۆنی یۆنانە ، ئەگینا ئەمە ئێستا وا نیـیە بەڵکو هەمو ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەیەك لەسـەر چەمەرەیەك ئەسوڕێتەوە وەك قورئان ئەفەرمـوێ « کُـلٌ فی فَلَـكٍ یَسـبَحونَ » .

(٥٣) سەگیپیس : ئەم شیعرە لە نوسخەی ژمارە (٢)دا وایـە ، بـەڵام لـە نوسخەی ژمارە (١)دا ئاوایە .

**سەگی پیسم نەدێ قابیل بە قاپێ پاکی ئەصحابت**
**بە قیطمیر بۆن خۆشە وەرنێ لە دەور ئەو ئاستانانە**

قیطمیر ناوی ئەو سـەگەیە کە لەگەڵ ئەصحابولکەهف بۆ ، وە لەگەڵیانا

بەسە حیرمان و مەحرومی حەرێمی حورمەتت جێی
کەرەم کە تیا کە هەڵتوتێم لەبەر قاپی حەرەمخانە (٥٤)

تەعەللوق بەستەی ئەذیالی شەریفت بون وحوشی دەشت
دەسی من بێتو دامانت یەکێکم لەو وحوشانە (٥٥)

بەها ، نە ، بەڵ بەهانەی پێ ئەوێ قوربان شەفاعەی تۆ
بەهانەم جورمە ، دەسمایەم تەواوە لەم بەهانانە (٥٦)

ڕجای تاجی شەفاعەتیە ئەگەر هەر سەر بە سەودایێ
منی عاصی ئومێدێکم ئەگەر بێ هەر گوناهانە

سوهایی بێ بەهام ، عەزمە حوزوری حەزرەتی ڕۆژ بم
دیاری نادیاری حەسبی حاڵی نادیارانە (٥٧)

---

چووە ناو ئەشکەوتەکەوە . وەرنێ : ئەگینا . واتە سەگی پیس شایستەی پاسەوانی هاوڕێیانی ئێوەی نیە ئەگینا زۆرم پێ خۆش بو ببومایە بە قیطمیر لە دەوری ئەو ئاستانانە .

(٥٤) لەم شیعرەدا دەرئەکەوێ کە خاکی خانوی سەربەخۆی بە موڵکایەتی نەبووە ، وە زۆر ئەم ماڵ و ئەو ماڵی کردووە بە کرێ ، وە لە هیچ ماڵێکا نەحەساوەتەوە کە واش بووە .

(٥٥) ئەذیال : جەمعی ذەیلە بەمانا داوێن . زۆر جار بینراوە کە مەل و گیانلەبەرانی دەشتی سلێمان لە پێغەمبەر نەکردووە ، وە هاتوون دەوریان داوە ، وە ئەمیش زۆر بە نەرم و شل بووە لەگەڵیانا ، ئنجا شاعیر ئەڵێ دەستی من بێت و دامێنت بە یەکێکم بزانە لەو گیان لەبەرانە ، وە ئاوڕێکی بەخێرم لێ بدەرەوە .

(٥٦) بەها : نرخ . نە : نەء . واتە شەفاعەتی پێغەمبەر بە نرخ و بە بەها نیە بەڵکو بە بەهانەیە ، بەمڕەنگە هەرکەسێك خوا بیەوێ شەفاعەتی پێغەمبەری ئەکات بە نسیب ، وە هەرکەسێکیشی نەوێ نایکات بە نسیبی . ئنجا شاعیر لێرەدا ئەڵێ بەهانەم ــ کە گوناهە ــ ئێجگار زۆرە ، وەك لە شیعری دوایدا بەتەواوی دانی پیا ئەنێ .

(٥٧) سوها : وەك لەپێشەوە وتمان ئەستێرەیەکی ئێجگار دورە لەتەنیشت

گەدا دیاریێ ئەبا بۆ شا ولێکین کەم بە فکری زۆر
قوبوڵ فەرمۆ کەریمانە لە من دیاریێ فەقیرانە

ئەبێ (خاکی) ئەتۆ خۆت چیێ و دیاریێ تۆ ئەبێ چیێ بێ ؟
لە بۆ شاهی عەرەب هەرگیز نەڵێی ئەم شیعرە کوردانە

مەگەر شاهی ڕوسول هادیێ سوبول ، سەرخێڵی جوملە و کول
بە ئیحسانی بکا تەحسین بڵێ وەك شیعری حەسسانە (٥٨)



ئەستێرەی حەوتەمی حەوتەوانەوەیە لەسەری لای خوارۆی ، بەعاستەم هێندێ چاوی زۆر تیژ بەدیێ ئەکات . شاعیر ئەڵێ : من ئەو ئەستێرە بێنرخەم لەگەڵ ئەوەدا ئەمەوێ بچمە حوزوری ڕۆژ کە پێغەمبەرە دیاریێ بێنرخی نادیاریش پیشەی مەردومی هیچوپوچی نادیارە ، کەوابۆ هیچ نەنگێکی تیا نی‌یە ئەگەر من ئەم چەکامە کوردی‌یە بکەم بە دیاریێ دەستم وەك لە سێ شیعری پاشۆدا ڕۆناکی ئەکاتەوە .

(٥٨) ڕوسول : جەمعی ڕەسوڵە . سوبول : جەمعی سەبیلی بەمەعنا ڕێی ڕاست و صیراطی موستەقیم .

بەشی یەکەمی ئەم چەکامەیە تەواو بۆ . بەشی دۆهەمی ــ خوا یار بێ ــ لە ژمارەیەکی‌تری ئەم گۆڤارەدا بڵاو ئەکرێتەوە کە سەرەتاکەی باسی میعراجە .

## ملخص المقال

# الملا خـــاكي

ولد هذا الشاعر في قرية (احمد برنده) التابعة لقضاء حلبجـــة في حدود ١٢٦٠ الهجرية ودرس الفارسية ومباديء العلوم في السليمانية ، ثم رحل الى (سنه ـــ سنندج) وبقى هناك ردحا من الزمن الى ان تضلع في العلوم العربيـــة والاسلامية وتخصص في الادب الفارسي بنظمه ونثره ، وبعد أن أتم الدراسة وأخذ الاجازة العلمية رجع الى السليمانية واشتغل في داره بالتدريس وتربية الطلاب وتثقيفهم ، ولم يتمكن من تحصيل وظيفة اسمية كالتدريس او الامامة في احدى المساجد لعدم وجود شاغر آنذاك ، وبقي في داره ينشر العلم والادب العربي والفارسي بكل اتقان ومهارة ، وممن تتلمذ عنده محمود المفتي الملقب ببيخود والملا محيالدين ابن الحـــاج الملا سعيد الزلزلهئي والشـــيخ سلام وغيرهم ، انهم اخذوا منه علاوة على دروسهم العلمية الهام الشـــعر و وحي الادب ، ويظهر لي انه كان يدرسهم بالاجرة الشهرية حيث انه لم يكن لديـــه مورد آخر للمعيشة .

كان رحمه الله ذا ذكاء وقـّاد وكان متمسـكا بالطريقة النقشبندية على بالفارسية . وله ديوان شعر بخط يده في مكتبتي .

كان رحمه الله ذا ذكاء وقاد وكان متمسكا بالطريقـــة النقشبنديـــة على ماقاله المرحوم محمد امين زكي في تاريخ السليمانية وانحـــائها ، ومتخلقـــا بالاخلاق الكريمة والاداب الاسلامية الراقية ، وكان قلبه ممتلئا من محبـــة رسول الله صلى الله عليه وسلم ، الامر الذي حدا به الى انشـــاء قصيدتـــه

المشهورة بقصيدة النور والمؤلفة من مئة وتسعة وستين بيتا في بيان شيء من معجزاته ومعراجه وشفاعته يوم القيامة وفي عظمة أصحابه وخلفائه الراشدين، وبعد أن أتمها ونقحها قدمها اليه صلى الله عليه وسلم بأبيات من نفس القصيدة، وكان رحمه الله ينتظر منه صلى الله عليه وسلم القبول الى ان مرض مرض الموت ورأى رسول الله صلى الله عليه وسلم في منامه قبيل وفاته بيوم وليلة مخبرا اياه بان قصيدته قد قبلت ونالت منه صلى الله عليه وسلم الرضا فاستيقظ فرحا مستبشرا ، وبعد سويعات جاءه أحد أصدقائه المدعو (ملا حمه‌سور) وأخبره بذلك ، وتوفي بعد ذلك بيوم وليلة في سنة ١٣٢٦ الهجرية ـــ ١٩٠٨ الميلادية في السليمانية رحمه الله ، وبعد أيام أرسلت زوجته پيروزه بنت احمد ديوانه الى والدي بوصيته منه . وبما ان هذه القصيدة معقدة وصعبة المنال مع مالها من القيمة الادبية والتحلي بروائع البلاغة ونسختها نادرة الوجود وانها غير مشروحة ، فعليه وتلبية لرغبة كثير من الاصدقاء نشرحها شرحا مفصلا ، مع العلم بأنني عثرت على نسخة اخرى كتبت بخط الشيخ محمد المحوي حفظه الله ، كتبها على نسخة اخرى بخط الناظم فيها اثنا عشر بيتا لم يكن موجودا في النسخة الموجودة لدينا ، وسنشير الى تلك الاشعار اثناء الشرح ان شاء الله .



# سۆفیەتی
# لە
# هۆنراوی کوردیدا

ئەندامی کارا :   عەلائەدین سەجادی

مەبەست بە سۆفیێتی ئەو «تصوفە»یە کە سەرچاوەکەی لە عالەمێکی رۆحی و لەو جم و جۆڵە نەفسیەوە پەیدا دەبێ کە لە عـالەمی ئیسـلامێدا دەورێکی زۆری گێڕاوە • نەوەك هەر لە عالەمی ئیسلامێدا ، بەڵکو لـە عالەمی ئایینەکانی تریشا ئەم دیمەنە هەر بوە و لەمە زیاتریش لە دنیـای هەمو ئادەمیزادا هەر تاکە تاکەی ئادەمیزاد سەر بە هەر ئایینێك بوبێت ئـەو پەردەیەی پیشان داوە •

مەیدانی فەلسەفەی جەوهەری ئادەمیزاد فەلسەفەیەکی ئێجگار پان و بەرینە • ئەندێشـەی تا ئەندازەیەك بێ پایانی ئادەمی ئەندێشـەیەکی زۆر زۆر بە گورژە بۆ بازدان و بۆ گەڕان و سوڕان • تەکوینەکەی تەکوینێکی وایـە هێشتا نەوەك ئێستە ، بەڵکو زەمان بە سەدها ئەوەندەی تر درێژ ببێتـەوە نهێنی ئەو تەکوینە هەر دەرناکەوێ !•

دو سروشتی دژی یەك لەم ئادەمیزادەدا کۆ بونەتـەوە ؛ سروشـتی ماددی ، سروشتی مەعنەوی • کە دەڵێین کۆبونەتەوە مەبەست ئەوە نیـە کە هەردوکیان لە یەك کاتدا تێیدا هەیە • دژایەتی کە هەبێ راست لەم دووەدا

هەیە !• یەکێکیان کە هەبێ ، ئەویکەیان نیە • کە شەو هەبێ رۆژ نیە ، کە رۆژ هەبێ شەو نیە •

بەلام بە جۆرێکی تێکڕایی کە دەلێین ئەم دووە هەیە ، واتە تەکوینەکە بە پێویستی دەزانێ یەکێك لەو دووە هەبێ • وەکو دەلێ : دنیا بریتییە لـە شەو و رۆژ ، ئەمە مەعنای وا نیە کە شەو و رۆژ هەردوو لایان لە یەك کاتـا کۆ دەبنەوە ، بەلکو مەعنای ئەوەیە کە دنیا ، دنیا بۆ شایانی ئەوەی هەیـە شەو و رۆژی تێدا پەیدا ببێ • ئەمجا هەندێکی شەوە و هـەندێکی رۆژە ئەمە بابەتێکی ترە •

ئادەمیزادیش کە ئادەمیزاد بێ ، دوو زاهیرەی تێدا پەیدا دەبێ ؛ یەکێ ماددی ، یەکێ مەعنەوی • کۆبوونەوەی هەردووکیان پێکەوە لە یەك کاتدا گەلێ جار ــ بەو چەمکە کە ئێمە دەیلێین ــ پێکەوە نابێ ، بەلکو یا ئەمەیە ماددییەکە دەبێ ، یا مەعنەوییەکە • دیارە ئەمە لەسەر ئەو فەلسەفەیـە کە لەمەودوا باسی لێوە دەکەین •

جێگای بەربەرەکانێ نیە کە ئادەمیزاد خۆی لە خۆیا لە ماددیاتە، چونکە ئەم تەشکە کە هەیەتی گۆشـت و خوێن و ئێسقانە ، ئەمانە هەموویان لـە ماددەن • هەر لەم ئادەمیزادەدا ئەندێشە و بیروباوەڕ هەیە ، ئەمانە هەمـوو لە مەعنەوین • کاتێ کە ئەو ئەندێشەیە روبەڕووی جەوهەرێکی واقعی بووەوە، وردە وردە لەو جەوهەرە روناکی وەردەگرێ تا وای لێدێ خۆی دەبێ بـە کۆگایەکی نور • کە گەیشتە ئەم پلەیە ، ئەو بەرەیە زاڵ دەبێ بە سەر بەرەی ماددیاتەکەیا و ئەو ماددیاتە ئیتر نموودێکی نامێنێ !• ماددیاتەکە ، کە بریتی بوو لەو ئێسك و گۆشت و خوێنە ، هەرچەندە لەبەر چاوی ئێمە ئەو شتانـە ماددەیە ، بەلام لەلای خاوەنەکەی خۆی ئەو فەسالەی نیە ، بەلکو هـەر

نایەتە بەرچاوی و بە هیچی دەزانیؒ • پیاوانی وەکو «منصور» و «جنید» ئەم رِوداوەیان تێدا پەیدا بووە بۆیە کەوتونەتە هەردەی خۆنەناسینەوە و خواناسینەوە !••

زەمان هەتا درێژتر بیێتەوە فەلسەفەی ماددیؒ و مەعنەویؒ زیاتر رِوَن دەبێتەوە • دوَر نیە ئەوەی کە ئێستە بە مادده ئیسباتی مەعنەویات دەکریؒ، پێش سەد ساڵ لەمەوبەر ئەو ئیسباتە بەو جۆرە نەدەکرا •

ئەو پیاوانە کە لەم چەرخەدا باڵیان گرتەوە و چوَن بۆ مانگ • ــ ئێمە لە لایەن پیشە و زانیارتیەوە قسەیان لێوە ناکەین ، قسەکەمان تەنیا رِوَ لە باری ماددیات و مەعنەویاتەوەیە ــ • باڵیان گرتەوە و رِۆیشتن ؛ رِۆیشتن تا لە سەر مانگ نیشتنەوە • تەماشا دەکەن هەڵدەپەرِن ، جڵەوی خۆیان بۆ ناگیرێتەوە بۆ ئەوە بتوانن نەجوڵێن وەکو لە سەر ئەرز نەدەجوڵان • ئەم کارەساتە کە رِوَی لێدان چی بۆ وای لیؒکردن ؟•

ئەوە بۆ کە لە هێزی مەقناتیسیؒ و جازبیبەتی ئەرز دوَرکەوتنەوە ، دەسەڵاتی ئەرز نەما بە سەریانا بۆ ئەوە رِایانبوەستێنیؒ ، بە ناچار ئەوان کەوتنە ئەو جموجوڵە ، کە هاتنەوە بۆ سەر زەویؒ دۆخەکەی خۆیانیان وەرگرتەوە •

لێرەدا قیاسەکە لە ماددیؒ و مەعنەویدا نیە ، بەڵکو قیاسەکە لە « مانع و مقتضی»دایە ؛ مانع بۆ ئەوە کە ئەوان بەو جۆرە خۆیان بۆ رِانەگیریؒ و بکەونە جوڵە جازبیبەتیؒ ئەرز و مەداری ئەرز بۆ ، کە ئەو مانعە نەما ــ وەکو نەما ــ چونکە لەبەر پەلی ئەرز و مەداری ئەرز دەرچوبوَن ــ « مقتضی »یەکە ــ کە خۆرِانەگرتنیانە ــ بۆیان گەرِایەوە •کە هاتنەوە سەر زەویؒ مانعەکە پەیدا بوەوە ، ئیتر مقتضیەکە نەما !•

وەکو وتم قیاسەکە لە نێوانی «مانع و مقتضی»دایە ، تەك لە نێوانی نەفسی ماددییەت و مەعنەوییەتدا ، چونکە ئەوان بە هێزی علم گەیشتنە ئەو شوێنە ، نەوەك بە مەعنەوییاتەوە ؛ ماددەیەك کە لە من و تۆدایە چەشنی ماددەیە کە لەوانیشدایە ؛ وەکو چۆن من و تۆ گۆشت و ئێسقانین ئەوانیش هەر وانە •

جا دۆ پەردەکەی ئادەمیزاد کە وترا ماددیێ و مەعنەوتیە ، ئەگەر ئەو ماددەیە نەمێنێ ، مەعنەوییات دەگەڕێتەوە • ئەسڵ لەم کەونەدا ئەو مەعنەوییاتەیە کە بەرانبەر ماددیاتە ، ماددیات پەردەیەکە و هاتوە بە سەریا!•

قسەکەم زۆر بە زیاد رۆیشتن نەزانێ ! ؛ ئەجرامی کەونێ بە هەزاران ملیۆن ئەستێرەوە ، بە ئەرز و مانگ و رۆژەوە ـــ کە ئەمانە هەمو ماددەن ـــ سەرەتا بوێکیان نەبوە ، پاشان بەرە بەرە پەیدا بون و کەوتونەتە ناو ئەم «فضا»یەوە ؛ فەزایەکی وەها ئەگەر هەزار ئەوەندەی تر ئەجرام بکەوێتە ناویەوە هەر قوتی دەدا !• راستە قوتی دەدا چونکە دەبێ تۆ چۆن ئەمە لێك بدەیتەوە کە بەینی ئەستێرەیەك و ئەستێرەیەك چەندە ماوەیە و چەندە دوورن لە یەك ؟!• کەچێ لەبەر چاوی ئێمەی ئێستەی سەر زەوێ دوریەکەیان لە یەك وا دەزانین هەر بستێکە ، وەیا کەمترە لە بستێك ! •

ئەو خەوەی تۆ دەیبینی ، ئەو کارەساتانە کە تۆ لە ماوەی چارەك سەعاتی خەوەکەتا دەیبینی ؛ کە لەم باسك دەچی بۆ ئەو باسك ، لەم شار بۆ ئەو شار ، لەم دەریا بۆ ئەو دەریا ، قسەکردن لەگەڵ ئەوانەی کە ساڵەهای ساڵە مردون ، ئەمە ئەگەر لەو خەوەدا نەبێ چەند ساڵی زەمانی ئێمەی ئەوێ تا تۆ ئەو شوێنانە بەو جۆرە ببینی ؟! و بۆت بێنە ئەنجام ! •

ئەمە مەعنای وایە زەمان جیایە و نێوانی ئەستێرەکانیش جیان • بزانە

ئەو دورییە ماوەی بەینی ئەو ئەجرامانەی چۆن تەسك‌کردۆتەوە ؟!• ئەو خەوە ئەو ڕێگا دورانەی چۆن نزیك کردۆتەوە ؟!•

ئەوانەی کە دەکەونە ناو دەریای مەعنەویاتەوە و مەلەوانی تێدا دەکەن ، ئەوانە بە هۆی چەوسانەوەی نەفسەکەیانەوە دەکەونە ناو ئەو دەریایە • ریازەی نەفسی دەیانگەیەنێتە شوێنێك کە بەر ، بەرەلاّ دەبێ بۆیان ؛ کاتێ کە دڵەکەیان ڕو دەکاتە نوری مەعنەویات ، وەیا کاتێ تیشکێ لەو نورە ئەسلیە مەعنەوییە ڕو دەکاتە ئەمان و نیهایەتی ئەو تیشکە لە دڵی ئەمانا دێت، چی ، لە نێوانی دڵەکەی ئەمان و نورە حەقیقیەکەدا هەبێت ، ئەمان بە هۆی ڕوناکی ئەو تیشکەوە ئەو شتە دەبینن • ئەو شتە ئایا شتە ماددیە ڕواڵەتیەکە بێ کە لەو شوێنەدایە ، وەیا عەکسی ئەو شتە بێ ، کە ئەو عەکسە کەوتۆتە ئەوێ ! •

ئەم عەکسەش لە سەر باوەڕی ئەو کەسانە کە دەڵێن : هەرچێ ، شت هەیە وێنەکەی لە «فضا»دا هەیە ، دیارە کە وێنە هەبێ ، وە یا بڵێین تاپۆ بێ ، دەبێ بە پەرژین لە بەینی ماددیی حەقیقیدا و لە بەینی مەعنەویەکی بێ جسمدا ، ڕێگای دور و ماوەی درێژ هەمو نزیك دەبێتەوە •

دڵەکەی ئەمان ، واتە ئەهلی مەعنەویات هەرچەندە لە ناو چوار دیواری لەشەکەیاندایە ــ کە ئەم لەشە ماددییە ــ بەلاّم ئەو پاڵ دەنێ بەم لەشەوە و دەچێ حەقیقەتەکە دەبینێ ! •

وەکو یەکێ لە ناو ژورێکی بلوریدا بێ ، هەرچەندە بلورەکان ــ کەبون بە دیوار ــ نایەڵن یەکەکەی تێدا دەرچێ ، بەلاّم ئەو کەسە چی لە دەرەوەی دیوارە بلورینەکەدا هەبێ دەیبینێ • خاوەنانی نەفسی مەعنەویاتیش وانە ، هەرچەندە لەشەکەیان دیوارە بۆیان ، بەلاّم بە هۆی ریازە و

چەوسانەوەی نەفسەکەیانەوە پەردە لە بەینی خۆیان و غەیردا هەڵدەدرێتەوە و ئاگاداری پەیدا دەکەن بە سەر ئەو دیوی پەردەکەدا •

بۆ ئەو جۆرە کەسانە دوو جۆرە دیواری ماددی پەیدا دەبێ ؛ یەکێ دیواری لەشەکەی خۆیان ، یەکێ دیواری رواڵەتی و دیواری دیوار ئاسایی• من و تۆ و خاوەن مەعنەوییاتێك لە ژوورەکەدا دانیشتویین • کە وترا زۆر مەعنای وایە دیوارێك هەیە ، کارەساتی ئەو دیوی دیوارەکە من و تۆ نایبینین ، بەڵام خاوەنی مەعنەویاتەکە وەکو چۆن ئێمە ئەگەر شتەکە لەبەر چاومانەوە بێ دەیبینین ، ئەو بەو بینینەی ئێمە لەو دیوی دیوارەکەوە دەیبینێ • ئەم جیاییە لە بەینی ئێمە و ئەودا ریازە نەفسیەکە و چەوسانەوە نەفسیەکەیە • ئەو ئەوەی کردووە ، ئێمە ئەوەمان نەکردووە •



ئەمە ئادەمیزاد و رۆحیات ، ئادەمیزاد و پەردە ، ئادەمیزاد و ماددە • ئەمجا ئادەمیزاد و ئایین ، ئادەمیزاد و رۆحیات •

ئەوە بۆ رۆحیات و مەعنەویات بەشێك بوو لە تەکوینی ئادەمیزاد ، ئیتر بە بێ ئەوە کە شتێکی تر هەبێ ئەو رۆحەی تێدا ببوژێنێتەوە و خۆشەی بکا •

سەردەمی ئایین هاتە ناوەوە ، ئەم ئایینە بۆی بوو بە زاخاوێك بۆ ئەوە ژەنگەکەی لێ بکاتەوە • چۆن خنجەرێکی دەبان ژەنگ دەیگرێ و زاخاو دەدرێتەوە ، ئەو زاخاوە جەوهەری خنجەرەکە دەر دەخا ، ئایینیش بەرانبەر بەو مەعنەوییاتە ئەو سەمەرەیەی هەیە • وە یا وەکو کێڵگەیەك ، ئەرزەکەی هەیە و ئاوەکەی هەیە ، هەروا بە جۆرێکی ناشیانە بێستانەوان ، وە یا رەزەوان ، وە یا جوتیارەکە بە رەمەکیانە خەریکی

دەبێ و بەرهەمێکی لێ وەردەگرن ، کەچی هەر عەینی زەوی و ئــاو بــە چەشنێکی عیلمی تیایا خەریك دەبێ تەماشا دەکەی بەرهەمــەکەی چەنــد بەرابەری بەرهەمی جارانە • دینیش بۆ ئەو رۆحیات و مەعنەویاتە وایــە •

پێشوتر تا ئایینەکە نەبێ ، مەعنەویاتەکە ئەو بەرهــەمەی نەدەدا بــە دەستەوە، کە ئایین تێکلاوی بێ و رێ و شوێنی بێ دانا بەرهەم گەلێ گەلێ زیادی کرد ، لەو شکلە تەبیعیەی پێشوی کەوتە شکلێکی رێك و پێکەوە •

باسەکەمان باسی مەعنەویات و ماددیاتە • ئەو قسەیە بە لای منــەوە رەوا نیە کە بوترێ :

مەعنەویات بێ بەهۆی زیانی مادديات ، وە یا دەبێ بە هۆی لەناوچوونی مادديات • ئەمە رەوا نیە چونکە نە مادديات بە بێ مەعنەویات دەیکرێ ، وە نە مەعنەویاتیش بە بێ مادديات دەیکرێ • نە شەو بە بێ رۆژ دەتــوانێ بەرهەمی خۆی بدا بە دەستەوە ، وە نە رۆژیش بە بێ شەو دەتوانێ بــگا بە ئارەزوی خۆی • دەبێ شەو هــەبێ و دەبێ رۆژیش هــەبێ • دەبــێ ماددیاتیش هەبێ و ئەبێ مەعنەویاتیش هەبێ •

قسەکەی منیش بابەتێکی عیلمیە ، لە لایەن عیلمەوە لەو دوو شــتەوە قسە دەکا • هەر مەیدانێ سواری خۆی جیایە ، هەر عیلمێکیش بابەتی خۆی جیایە • ئاسنگەرێك فێری ئاسنگەری دەبێ ، دەبێ کەرەستەی ئاسنگەری لە بەر دەستابێ ، نــابێ هی بەرگدرویتی بێ ، چونکە ئــەو دوو پیشــەیە کەرەستەکانیان جیایە • بابەتێکی ئەدەبی دەبێ ناوەرۆکەکەی ئەدەبی بێ ، دەبێ کەرەستەکەی ئەدەبی بێ • بابەتێکی عیلمی کەرەستەکەی دەبێ عیلمی بێ • نابێ رەخنە روو بکاتە ئاسنگەرەکە ، کە بۆچی کەرەستەی بەرگدرویتی بەکار نایەنێ !••

کە دەوترێ مەعنەویات زیانی هــەیە بۆ ئادەمیزاد ، ئەو وتنــە وای خستۆتە دڵەوە کە ئادەمیزاد هەر بۆ ماددیات دروست بووە !• ئەمە وا نیە ، هەمۆ شتێکی ئادەمیزاد هەر ماددە نیە ، وەکو پارە هــەمۆ شــت نیــە • هەروەها ئادەمیزاد هەر بۆ مەعنەویاتیش دروست نەبووە ، مەعنەویات هەمۆ شت نیە ، وەکو رۆناکی هەمۆ شت نیە • کەوابۆ مەعنەویات و ماددیات وەکو یەك پێویست بۆ •

یەکێك لەو ئاینانە ئاینی ئیسلامە و دوای ئەو ئاینێکی تر نەهــات کە وەکو ئەو سەرکەوێ و پەل بڵاو بکاتەوە • وە دەوترێ ئاینی ئیسلام لایەنی رۆحیاتی زۆر گرتوە • ئەم وتنــە ئەوەندەی راســتە کە لایــەنی مەعنەویات و رۆحیاتی گرتوە ، بەڵام وەنەبێ پشتی لە ماددیات کردبێتەوە ، بەلکو ئیسلام دەچێتە سەر فەلسەفە ئەساسیەکە و دەڵێ : حاڵی مەعنەویات ئاوایە ــ کە باسکرا ــ • لە هەمانکاتا هەر بەو فەلسەفەیە دەڵێ : دەبــێ ماددیاتیش بگیرێ ، چونکە مەعنەویات دیوی ناوەوەی ماددیاتە و ماددیات دیوی دەرەوەی مەعنەویاتە ، ئەگەر تا هەر دۆ شتەکە نەبێ ، هیچ یەکێك لە شتەکان نابێ ! •

ئەمە باوەڕی ئیسلامە بەم دۆ شتە • لەبەر تیشکی رۆناکی ئەو باوەڕەدا باوەڕی من ئەوەیە :

ئەگەر تا ئەو ئەندازەیە کە ئیسلام رۆحیات و مەعنەویاتی خستۆتە رۆ ، وە ئەو ئەندازەیە کە قوتابخانەی ماددی ــ گوایە بۆ سۆدی ئادەمیزاد ــ ماددەیان گرتووە و مەعنەویاتیان بــەرەڵا کردوە ، ئــەگەر ئەو رۆحیــاتی ئیسلامیە و ماددیاتی قوتابخانەی ماددە قۆڵیان بکردایە بە قــۆڵی یەکا ،

ئادەمیزاد گەلێ بەهرەوەر تر دەبێ لەم پلەیە کە ئێستە هەیەتی • با بچینەوە سەر سۆفیەتیەکە •



بەڵێ ! ئیسلام هاتە ناوەوە . ئەوانەی کە خەریکی بڵاوبونەوەی ئیسلام بون رێگای خۆیانیان گرت و لە سەری رۆیشتن • ئەوانەی کە شیر بە دەست نەبون ، دەبێ ئەوانیش بکەونە مەیدانێکەوە کە بتوانن بە بێ شیر خزمەتی ئەو ئیسلامەتیە بکەن • ئەگەر خزمەتێك لێیانەوە رو نەدا دەبن بە ئەندامێکی بێ کەڵك لە زانکۆی ئیسلامیدا •

لێرەدا ئەم دەستەیە بون بە دو لقەوە ؛ لقێکی ئەوە بو کە لە رێگای عیلمەوە خزمەتەکەی کرد ــ کە رێبازی ئەمانە ناونرایە « شەریعەت » ــ • لقەکەی تر ئەوە بو کە لە رێگای رۆحیاتەوە خزمەتەکەی کرد • رێبازی ئەمانەش ناونرایە رێبازی « تەریقەت » • هەر دو رێبازەکە هەر قانونی ئیسلامی ناوی بۆ دانا •

نابێ واش بزانرێ کە ئەم رێبازانە ئاشنای یەك نەبون ، وەیا لە روی یەکا وەستاون !• لە روی یەکا نەوەستاون ؛ چونکە رێگاکەی هەردولایان هەر بۆ ئەو شارە دەچێتەوە کە ئیسلامە ، هەردولایان خزمەتی ئەو جەوهەرەیان کردوە کە ئیسلامە ، هەردولایان گەیشتونەتەوە بەو نوختەیە کە باوەڕی داهێنەری ئیسلام بوە ــ کە پێغەمبەرە «د•خ» لە سەربێ ــ • کەوابو تەنیا بۆ وێنە «نالی» دەڵێ :

**« کە جێگەت بۆ عبادەت بێ ، چ فەوقانی ، چ تەحتانی »**
**« کە حوببت بۆ سیادەت بێ ، چ بەرزنجی ، چ باراوی »**

شێخ عبدالقادری گەیلانی، شاهی نەقشبەند «شێخ محمد بهاءالدین» و

شێخ احمدی رفاعی ، وەکو سۆفی بۆن ، زانا و عـالمیش بوون • ئیمـامی غزالی ، ئیمام الحرمین و محیالدین ابن العربی وەکو عالم بوون سۆفیـش بوون، بەلام لەسەر گوزارشتی ئێستە ئەوان لە تەریقەتا و ئەمان لە شەریعەتا « اختصاص » یان پەیداکردوە •

سۆفێتی لە عالەمی ئیسلامیدا بلاو بوەوە ، دەنگی زەنگەکەی هەمـو لایەکی گرتەوە • ئەم گرتنەوەیە ئایا لەبەر ئەوە بوبێ کە رۆحە بناغەییەکە لە ناو نەتەوەکانی ئیسلامدا ــ بەو ناوەوە کە ئادەمیزادن ــ دەستی تێـوە ژەندن و ئەمانیش لە ژێر سێبەری ئەو خێـوەتەدا حەسـانەوە ، یـا وەکو گۆشـەگیری هەندێکیان بوبێ لە فەرمانڕەوایی و گڕە و کلپەی دەرونیان بەم ناوەوە دەربڕیبێ ، وەیا هــەر دوکیان بو بێ ، سۆفێتی ئالای خـۆی هەلکرد و کەوتە جم و جۆلێکی بێ پشو ، هەوراز و نشێوی بڕی ، لــەم نەتەوە بۆ ئەو نەتەوە تەنیەوە • تا وای لێ هات هەمو ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی داگرت و لە هەمو لایەکەوە گمەی خەرقەپۆشان بو بە سەمتوری دلسۆزان!• کۆڕی زکری ئاشکرا و نهێنی ، سەردەمی «دار الارقم» و «دار الندوه» ی دەهێنایەوە یاد !•

شێخانی تەریقەت و پیرانی هونــەروەر ، زانــایانی علمی زاهری و دانایانی علمی باتنی لە وێنەی دەنگی پۆرەی هەنگ بە هۆنراوی سۆفیانەیان کەوتنە خۆشخوانی و نەواخوانی ! • ئەو دەنگە و ئەو ســۆزە کەوتە ناو کوردیشەوە ، پیران دەستی یەکیان گرت و چونە کۆڕی مەیگێڕانەوە . هۆنەران دەنگیان کرد بە یەك و چونە ئەو مەیدانەوە ، بە سۆزی ئەوان و بە زاری ئەمان کالای سۆفێتی کەوتـە بازاڕی کوردەوە ، لە هــەر تەلــە ئاوازێك و لە هەر هەردە سۆزێك پەیدا بو !• فەلسەفەی سۆفێتی بە زمانی

کوردیێ سنگی نا بۆ پێشەوە ! •

جا بۆ ئەوە بزانین سۆفێتیێ تا چ ئەندازە کاری کردۆتـە سـەر دڵی هۆنەرانی کورد ، وەیا هۆنەرانی کورد تا چ ئەندازە ئـاڵاون بە بـاڵای سۆفێتیدا و چۆن ئەو فەلسەفەیانە دەربڕیوە ، چەند نمۆنـەیەك لەوانـە دێنینەوە •



دا بزانین (مەلای جزیریێ) لەم رووەوە چیێ دەڵێ :

**« ئەوەل کو یـار دامە ، یـەك زەڕەیەك عنـایەت »**
**« قسمت مـە خەمر و جـامە ، د دەفتەری هدایەت »**

**« حوسـن و جەمـال جانـان نـادیرتن تو پـایـان »**
**« هەرچی نەبت بدایـەت ، اصـلا نهین نهـایەت »**

**« فەیضـا علوم و حکمەت جامـا سـەدەف کو گیرا »**
**«مەهـ ژ دەست مغبەچان دێت،بە مصحف و بە ئایەت»**

**«عارف حەتی نەنوشیێ مەی ژ دەست مەی فروشیێ»**
**« غائب نە بۆ ژ هۆشیێ ، پەیـدا نەکر ولایـەت »**

**« گۆناهـ و زوهد و تـاعات هەڵنـاگرت خرابات »**
**« کەسـیێ بقی دەریێ دت ، دقێ بکـت رعـایەت »**

**« عشقی ژ هەردو چەشمان ئەوەل د دل اثر کر »**
**« لێ زەڕە زەڕە ئـاخر سـۆتن کرە سرایـەت »**

**« شـاکیالسلاح هەردەم بکوشتنـا « ملێ » دێـت »**
**« گازندەیـا ژ کێ کەم ، بـە کێ بـکەم شکایەت ؟ »**

**« جامـا ژ دەست شـاهد ژەنگێ ژ دل دشۆتـن »**
**« پیری موغان ژ رەنـدان وەهـ وەهـ دکر روایـەت »**

**« اطوار عشـــق و مەستی ، ئەسرار بـــوت پەرستی »**
**« تەقریر ســـەد روایـــەت نـــاکت ژ بـــو کفایـــەت »**

**« « لیطمئن قلبی » عین الیقـــین د بەخشیـــــت »**
**« عین العیان دڤێتـــن ، کـــافی نهـــین درایـــەت »**

**« گەر مـــیر و پادشـــاهی ، مویـــك لنك « مەلایی» »**
**« نـــادەم بە ملك عـــالەم ، بالله یـــەك عنـــایەت »**

واتە لە ســـەرەتاوە ، کە یار « خوا » دای بـــە ئێمە تۆزێ عنایەت و چاوێری بەشی ئێمە مەی و جام بۆ لە دەفتەری هدایەتدا ٠

جوانی و جەماڵی جانان پایانی بۆ نیە ، هەر شتێك ســـەرەتای بـــۆ نەبێت ، دواییشی بۆ نیە ٠

بە ئایەت و بە قرآن سوێند دەخۆم ئێمە بەهرەی علوم و حکمەتمان چاوپێ نەدەکەوت مەگەر لە سەر دەستی بەچکە موغانەکان نەبێ ـــ یا ئـــەو کوڕانە کە لە مەیخانەکاندان ـــ ٠

پیاوی زانا تا نەنۆشێ مەی لە دەست مەی فرۆشێ ، لە هۆشی خـــۆی ناچێ و ولایەت پەیدا ناکا ٠

گوناح و زوهد و عبادەت مەیخانەکان ئاشنایەتیان لە گەڵیا نیە ٠ یەکێ کە هاتە بەر ئەم دەرگایە دەبێ تەماشای وێڵێ و یاسا بکا ٠

عەشقێ کە لە دوو چاوەوە گزنگی دا لە پێشا کار دەکاتە دڵ ، لەوەوە وردە وردە دەتەنێتەوە بۆ لەش و دەیسوتێنێ ٠

بە چەکی ڕوتەوە هەموو جار بۆ کوشتنی مەلا دێت ٠ بانگی کێ بکەم و پەنا بەرمە لای کێ و دەردە دڵ لای کێ بکەم ؟٠

جامێ کە لە دەستی شاهد ـــ یار ـــ بێت ژەنگی دڵ دەشواتـــەوە ٠

پیری موغان لە رەندانی خەراباتەوە ئاوای دەگێڕایەوە •

باسی عشق و سەرخۆشی و نهێنی بوتپەرستی ، ئەگەر سەد تۆمار و دەفتەری بۆ پڕبکرێتەوە هێشتا هەر بەش ناکا •

ئایەتی (لیطمئن قلبی) پایەی (عین الیقین)مان پێ دەبەخشێ ، بـەلام ئەوەی ئێمە دەمانەوێ (عین العیان)ە ، روایەتکردن بە کەلك نـایە •

ئەگەر میر بێ و ئەگەر پادشا بێت لە لای «مەلا» وەکو یەك وایـە ، سوێندم بە خوابێ بە هەمو ملکی دنیای نادەم تۆزێ چاوێری خوا •

لێرەدا مەلا بە تەواوی چوەتە ناو جەرگەی فەلسەفەی سۆفیەتیەوە و بە هەمو سۆزێکیەوە ئەو باوەڕە دەخاتە سەر گازی پشت و دەلێ :

مەعشوقی راستەقینە کە نوری بارەگای یەزدانە سەرەتـا ، کە تۆزێ لای لێکردینەوە کەوتینە ریزی ئەو کەسانە کە ناویان لە دەفتەری رزگاربونا نوسراوە و لە کۆڕی سەر خۆشانی ئاشنای بارەگای یەزدانیدا بە بـادەی تاقیکردنەوە شەرابی معرفةاللهـمان نۆشکرد ، بوین بە یەکێ لەو کەسـانە کە لە عالەمی ماددەوە کەوتنە عالەمی مەعنەویات ؛ کەوتینە ئەو عالەمەوە کە قاپی نوری بارەگای کردگارمان بۆ کرایەوە و پەردە لە روی کار لادار ، هەرچەندە تەماشامان کرد ئەو پەڕی ئەو نورەمان بەدی نەکرد !• چـۆنی بەدی ئەکەین ؟ :

شتێك کە سەرەتای نە لە عالەمی ماددەوە ، وە نە لە عالەمی ئەرواحەوە دیار نەبێ ، بێگومان سەرەکەی تری هەر بە جارێ دیار نابێ ! •

ئیتر بە بێ پەروا بوین بە پەروانەی ئەو نورە کە تیشکێك بو لە زاتی پاکی خوا و بو بە خۆشەویستێکی راستەقینەمان • وەنەبێ من ئەم ئیشـەم

سەربەخۆ کردبێ ، بەڵکو ، کە چومە کۆڕی بادەنۆشانەوە سەیرم کرد ، کۆگا کۆگا حیکمەت و زانیاریێ لەوێدا مەخشەڵانیەتی ، تەماشا دەکەم ئەمە هەمو لەو کەسانەوە بەرز دەبێتەوە کە بادەگێڕی ئەو کۆڕەن !• ئەوانەش هەمو نەونهالانی مەیخانەی حەقپەرستین و بە جامی ئیخلاس و دڵپاکیێ شەرابی حەقیقەتی وەحدانیەت بڵاو دەکەنەوە • لەزەتی ئەو شەرابە سەرخۆشی ئەکردم و بۆ ئەوە کە زیاتر لەو مەیخانەیە و لەو نەونهالانە نزیك بکەومەوە ! •

بۆیەش وام دەکرد چونکە ئەوانە کە ئارەزوی حەقپەرستیان لە سەردایە تا شەرابی حەقیقی لە دەست ئەو مەیفرۆشە حەقیقیانە ــ کە شارەزای جەمالی وەحدانیەتن ــ وەرنەگرن و نەنۆشن لە عالەمی مادده دور ناکەونەوە و ناکەونە ئەو عالەمەوە کە هەمو نهێنیێ کەونیان وەکو رۆژ بۆ دەرکەوێ و ناکەونە دەریای مەعنەویاتەوە و ناچنە ریزی ئەو پادشایانە کە بە چاو لەیەك نانێك ئەم پەڕ و ئەوپەڕی دنیایان بۆ رون دەبێتەوە •

بارەگای کۆڕی سەرخۆشانی خواناسان وەنەبێ پیاو بە گوناح یا بە عبادەت دەستی کەوێ ، چونکە ئەو شوێنە شوێنێك نیە ببێ بە جەزای ئەو کەسانە کە لە گوناح دور کەوتونەتەوە • تۆڵە ئەوەیە بە ئەندازەی کردەوەبێت ، تۆڵەی ئەو کەسانە کە لە خراپە دور کەوتونەتەوە هەر ئەوەیە کە خوا بیانبەخشێ ، ئەو شوێنە کە دانیشتوەکانی لە لەزەتێکی ئەبەدیێدان ، ئەمە تۆڵەی کردەوە نیە ، بەڵکو زیادە میهرەبانیەکە ، کە خوا لەگەڵ هەندێ کەسا دەیکا • جا ئەو کەسە کە رو دەکاتە ئەو قاپیە و بە تەمای ئەوەیە کە بچێتە ژورەوە و بە لەزەتی نوری خوا شاد ببێ ، نابێ بۆ بونەکەی عبادەت بکاو بۆ نەبونەکەی گوناح ، چونکە شوێنەکە شوێنی عبادەت و گوناح

نیە ، بەڵکو تەنیا هێلانەی میهرەبانیی خوایە •

بەڵێ ! • راستە سەرەتای عشق لە تیشکی دوو چاوی رواڵەتەوە دەتەتێتەوە بۆ لەش و دەیسووتێنێ ، بەڵام ئەمە وەنەبێ کارەساتی هەموو مەعشووقێك بێت ، ئەمە تەنیا لە دەست ئەو مەعشووقە حەقیقیە دێت کە سەرەتا لە هەیکەلی تۆری دوو چاودا دەردەکەوێ • جا ئەگەر یەکێ توانی ئەو ئەرکە بە رێوە بەرێ و خۆی لەبەریا رابگرێ ، ئەوا رزگار دەبێ • خۆ ئەگەر نەیتوانی وردە وردە دەتەتێتەوە بۆ دڵ و بۆ لەشی تا بە جارێ دەیسووتێنێ و دەیخاتە ناو ریزی گومڕاهانەوە ! •

من لەم لاوە ئەمە کارەساتمە ، لەولاشەوە نەفسێکی پیسم لەگەڵایە ، ماددیاتی بە فیکری خۆی بۆ رازاندوومەتەوە ، وە بە فیکری من بۆی کردووم بە خنجەرێکی رووت و بەو خنجەرە پەلامارم دەدا بۆ ئەوە لە لەزەتی مەعنەویات بێ بەشم بکا و لە دەشتی سەرگەردانیدا بمسووڕێنێتەوە ! •

جا کە نەفسێکی وام لەگەڵا بێت نازانم ئایا ئەگەر پەنا نەبەمە بەر بارەگای وەحدانیەت و بانگ لەو نەکەم هاوار بۆ کێ بەرم و شکات بخەمە بەرکێ ؟

ناچارم هەر دەبێ پەنا بەرمە ئەوێ بۆ ئەوە هەرکە نزیك بوومەوە بتوانم بە هۆی ئەو کەسانەوە کە لە سێبەری عەرشی خوادا بە جەلالێکەوە راوەستاون ، هەندێ لە ئاوی مەعرفەتی حەقێقیم دەستکەوێ و وەسوەسەی شەیتانیی و نەفسانیی بەو ئاوە بشۆمەوە و خۆم پاك کەمەوە •

سەربەخۆش ئەمەم نەکردوە و نایکەم ، پیری سەرخۆشیی ئەو راوێژەم بۆ دەکا ! • ئەو هەر ئەوەندە ئامۆژگاریەکە ئەکا ئەگینا من لەبەر ئەوە کە

هێشتا لە بۆتەدا قاڵ نەبۆمەتەوە ناتوانم نە باسی عشق بکەم ، وە نە باسی زانینی سەرخۆشانی ئەو مەیدانە بکەم ، چونکە ؛ نە من ، وە نە ، ئـەوان هیچی لێ نازانین ؛ من لێی نـازانم چـونکە هێشتا نەکەوتۆمەتە نـاویان ئەوانیش لێی نازانن چونکە لەزەتی رواڵەتی تۆرەکە وای سەرخۆش کردۆن لـە حەقیقەتەکەی هیچ تێنەگەیشتۆن !• کارەساتێ کە ئەمە بێ چۆن بـە هەزار تۆمار و دەفتەریش دەتۆسرێتەوە ؟!•

ئێمە خۆ نەچۆینە ریزی ئەو کەسانە ، یا یەکێ لەو کەسانە کە خوا پێی وت «او لم تؤمن •؟ »• ئەویـش وتی « بلی ولکن لیطمئن قلبی » ؛ بەڵێ ، بەلام بۆ ئەوە دڵم دامرکێتەوە • جا ئەو دڵدامرکاندنەوەی ئەوان یەقـین و بڕوایەکیان بۆ دروست دەکا • ئەو ئیبراهیمی خەلیل بۆ ، پێغەمبەری خـوا بۆ ، ئێمە بەندەیەکی شەرمەزارین ، تا بە چـاوی خۆمان شـت نەبینـین بەگێڕانەوە بڕوا ناکەین • ئێجگار بۆیەش واینە چونکە نەفسمـان پـاك نەبوەتـەوە •

کەوابۆ دەبێ ئێمە بۆ ئەوە کۆشش بکەین کە سەربەخۆ بگەین بـە بارەگای وەحدەتپەرست و خۆمان بخەینە کۆڕی سەرخۆشانی وەحدەت پەرستەوە ، ئەگینا بە گێڕانەوە بڵێین شت هەیە ئەمە دادێکمان ناداتێ ! •

من کە «مەلا»م ئەگەر بگەمە ئەو پایەیە کە خوا لایەکم لێ بـکاتەوە ئەوە هەمۆ عالەمی مەعنەویاتم رۆن دەبێتەوە ، دەست لە دنیـا دەشـۆم و هەمۆم بەلاوە هیچە • کە گەیشتمـە ئەو پایەیە پادشـاهێ و هـەژارێ ، ئەمیرێ و رەجالیم بەلاوە یەکە و وەکۆ یەك دێتە بەرچاو ، چونکە هەمۆیـان بەو رەگەزە دەزانم کە لە من خرابتر ئاتاجی لوێچێکن لەو دەریای مەعرفەتی خوایە ! ••



دابزانین «مەولەویٚ» لە « العقيدة المرضيــة »کەیدا ، لــەم بــاری سۆفیێتیەوە چۆن چوەتە مەیدانەوە ؟.

« نــەزەر عــادەتــا مەعرفــەت دەدات »
« تەسدیق بــە وجــوّد بە وجوّب ذات »

« بە سفــات پــاك سەلبیٚ و سبوّتیٚ »
« بە قەدەر تــاقەت قووەی نــاسوّتیٚ »

« هیچ بــە موعەللم حـــاجەت ناکەویٚ »
« ئەگەرچیٚ بــە ئەو ئاســانتر ئــەویٚ »

« روتبــەی ئەوەلیــچ ئەونــد ئــەعلایە »
« دەسی ئـــارەزوّی مــن لیٚ کوّتـــایە »

« چ یــارای روتبەی کەشفی حــالیمە ! »
« تەمەننـــای روتبەی ئیستدلالیمە ؟! »

« بەڵکەم هەڵــکەویٚ لـــە زەمانێــدا »
« سەرپەنجەی عەقڵــم وە بورهانێدا »

« بەو هەڵکەوتنە « مەعدوّم » راجی‌یــە »
« « هویدا أنا » و فــیرقەی ناجی‌یــە »

« ...  ...  ...  ... »
« ...  ...  ...  ... »

« لە دوّی ئەنفـــاسم « ولاسیمـــا » »
« ئەنفــاسی ئــەنفەس قــودسی ئەولیا »

« «خصوصا منهم» شیــوخ الارشـــاد »
« حــەق بەرەکەتیـــان زیــادکا زیــاد »

« بیٚ ئەوان نــاویٚ بەقەولی فحــوّل »
«نە عیلم و عەمەل ، نە روتبەی «وصول»»

« مونتەهای علــوّم عیلــمی ئەوانـــە »
« موقتـــەدای عەمــەل ئــەوان بزانـــە »

**« عیلمی ئەفواهی و قالی و ئیستدلال »**
**« عیلمیالاهی و کەشف و زەوقی و حال »**

« ... ... ... ... »
« ... ... ... ... »

**« بۆ جۆگەی عیلم و بۆ نەقدی عەمەل »**
**«مەنبەعی «کان»ن ، ئەولیای «کەمەل» »**

**« لەوێــوە نەوێ جــۆگە هەر لێڵـــە »**
**« نەقد کان نـــەوێ لـــە رەواج وێڵە ! »**

« ... ... ... ... »
« ... ... ... ... »

واتە وردبۆنەوە لە شت بە عادەتی زانین و ناسین دەدا بە دەستەوە • ئەم وردبۆنەوە و سەیرکردنە ئەوە دەدا بە ئینسان کە بڕوای بە « واجب الوجود ـــ خوا » بێ •

بڕوای بە سفەتەکانی خـــوا بێ ؛ ئەو سفەتـــانەی کە هەندێکیـــان «سەلبی»ن ، یەعنی حدوث و شەریك بۆ ئەو نیە ، بەڵکو قەدیم و واحدە • وە هەندێکیان « ئیجـــابی »ن ، وەکو ئەوە کە بەخشندەیە ، رۆزی دەرە ، لێبۆردەیە • ئەم وردبۆنەوەیە هەر بە قەدەر توانـــای بەشـــەرە ، ئـــەگینە ئینسان ناتوانێ بگا بە حەقایقی ئەوانە •

وردبۆنەوە لە زاتی خوا و لە سفاتی خوا هیچ پێویستی بە مامۆستـــا نیە ، هەرچەندە بونی مامۆستا ئیشەکە ئاسانتر دەکا •

وردبۆنەوە لە پایەی وەحدانیەت ئەوەندە بەرزە دەستی ئارەزۆی منی نـــاگاتێ ! •

من یارای ئەوەم نیە کە بگەمە شوێنێك بتوانم کەشفی چۆنیەتی ئـەو شوێنە بکەم ــ کە مەقامی جەلالی خوایە ــ تەنیا ئارەزوی ئەوە دەکەم کـە بە بەڵگە بگەمە شوێنێك تۆزێ دڵم فێنك ببێتەوە .

بەڵکو بۆم ڕێکەوێ لە وەختێکا سەرپەنجەی عەقڵم بدا لە بەڵگە و بورهانێك بۆ ئیسباتی ئەو مەقاماتە .

ئەگەر ئەوە بۆ «مەعدوم» ڕێکەوێ ــ کە ئارەزووەکەی هەر ئەوەیە ــ ئەو وەختە ئیتر من ئاشکرا دەبم لە ناو دەستەی سەرکەوتوانا و دەکەومــە ریزی رزگاربوەکانەوە .

بە شوێن نەفسما بە تایبەتی ئەنفاس و بەرەکەتی بە نرخی بەرزی ئەولیا بێت .

لە وەلیەکانیشا شێخەکانی تەریقەت ، خوابەرەکەت و نفوسیان هەر زیاد بکا بۆ مریدەکانیان .

بە قسەی عالمانی زۆر بەرز ، بە بێ بونی شێخان و پیران ، نە عیلــم و عەمەل دەبێ ، نەگەیشتن بە پایەی مەعنەویات دەبێ .

عیلمی ئەهلی تەریقەت ئەو پەڕی عیلمە ، کەوابو دەبێ بکەویتە شوێن عیلمی ئەوان و ئیشی ئەوان بزانی .

دەبێ عیلمی دەرس وەرگرتن بە دەم و بە قسە و بە بەڵگە ، عیلمــی ئیلاهیات و کەشف و کەرامەت و شەوقی حاڵی ئەهلی تەریقــەت ، هەمــو لەوان وەربگیرێ .

بۆ جۆگەی عیلم و بۆ هەڵسەنگاندنی کردەوە و عەمــەل ، ئــەوان ؛

واتە ئەو وەلیانە و ئەو شێخـانە ، سەرچـاوەی « کان »ی مەعریفـەت و خواناسینن • ئەو وەلیانە کە هەمۆشتێکیان تەواوکردوە •

ئەگەر لەو سەرچاوەوە نەبێ جۆگەی علم و عەمەلەکە هـەر لێـل دەبێت ، سەرمایەی عەمەل ئەگەر لەو کانەوە نەبێ رەواجی نابێت ! ••

تەماشا دەکەین مەولەوێ بە دڵ و دەرۆنێکی زۆر سەیرەوە چوەتە ناو باسی سۆفێتییەوە • بەلای ئەوەوە رێگای سۆفێتی گەلێ لە پێشترە لـە رێگای زانینی عیلمیتر ! ، بەلای ئەوەوە لقی تەرێقەت ئەگەر نەزانرێ ، لقی شەرێعەت دەرناکەوێ ، چونکە هەر زانیارییەك کە لە بـارەی عیلمی « کلام و الهیات »ەوەیە سەرچاوەی هەمۆی بۆ رێگای سۆفێتی و تەرێقەت دەچێتەوە •

بەڵێ !• مەولەوێ هۆنەرێکی «ابداعی» بوە • لەبارەی سۆفێتیشەوە ئەو ئیبداعەی هەر نواندوە !• دۆر نیە کەم کەس لە سۆفیەکان بە جۆرەکەی ئەو ، وا چۆبنە ناو جەرگەی سۆفیتییەوە ؛ بە جۆرێکی وا کە وەکو ئـەو سەرچاوەی هەمۆ شت بەرنەوە سەر سۆفێتی ! •

وا دیارە مەولەوێ لێرەدا نەفسیەتەکەی هەر بەلای بەشی مەعنەویاتـا رۆیشتووە لە بارەی فەلسەفەی تەکوینی ئینسانیەوە ، چونـکە ئەوە بـۆ وترا : مەعنەویات و ماددیات لە ئینسانەکەدا هەن ، بە بێ یەك نایانکرێ •

بەڵام لەگەڵ ئەمەشا دەبێ پیاو هەقبێژبێ • مەولەوێ وەنـەبێ بـە تەواوێ لێرەدا رێگای لە ماددیات گرتبێ ، بەلکو هەر تەنیا رێـگای لـە لقەکەیتری مەعنەویات گرتووە ــ کە عیلمە ــ • دەڵێ سەرچاوەی ئـەو عیلمەش هەر سۆفێتییە ، ئەگەر ئەم نەبێ ، ئەویـش نـابێ !• ئەمـە بۆ

فەلسەفەی مەولەوی لە باری فەلسەفەی سۆفێتی‌یەوە •



با بزانین هۆنەری فەلسەفەبێژی سۆفیەتی «مەحوی» لەم رۆەوە چۆن چوەتە ئەو مەیدانەوە ؟ • چۆن ئەو فەلسەفـەیە دەر دەبڕێ لە کاتێـکا کە دەڵێ :

**« تێ دەگا هەر کەس بکا فەهمی رمـوزی مەعنـەوی »**
**« هجر و وصلە ، نار و جەننەت ئایەتی « لایستوی » »**

**« کێوی غەم ، وادی جەفا طەی‌کردنە ئەشراطی عشق »**
**« باکی هەوراز و نشێوت کەی دەبێ گەر رەهرەوی ؟ »**

**« ناوی هارون ، ئیسمی قارون ، ئیبتدا ئیما دەکەن »**
**«سەرفرازە ، سەرکزە ئاخر ، سەرنگونە سەر قەوی»**

**« ئەی لەسەر تەختی غینا ئەمڕۆ ، سبەینێ تێ‌دەگەی »**
**«ئەو گەدایەی تۆ ، کەوا موحتاجی شێوی یەك شەوی»**

**« دەنگی پێی ئەحبابی رۆی و پڕ بە عالەم مەوج ئەدا »**
**«تۆ بە غەفلەت موبتەلا،گەر نەیبییەی مەستی خەوی»**

**«تف لە چارەی خەندە،گریە و شیوەنی پێ‌خۆشە دۆست»**
**« داکە ئەی بارانی ئەشك ، ئەی بەرقی نالە ، نەسرەوی »**

**« باسی چبکەم بێ‌کەناری بەحری پڕ تەشویری عشق »**
**« تاقە ، قەطرێکە « فتوحات »ە ، نمێکە «مەثنەوی» »**

**«ساعدی دەرکەوت و عالەم بۆ بە مۆسایێ هەمو »**
**« موعجزەی لێوی کە دەرخا ، جوملە دەبنە عیسەوی »**

**« رامی عاشق‌بوونی ئەو وەحشی نیگایە موشـکلە »**
**«مەبیە هەرگیز ئەم قسە : عەنقا دەبێ وەك کەو،کەوی»**

**« چاوی بیماری بـە وەعدی تیرەبـارانی نیگـاه »**
**«گفتی دا،جەهدێ کە ئەی دڵ،بەڵکێ تۆیشی بەرکەوی»**

**«(مەحویا)هەر ئەشك و ئاهی تۆ لەجێ،جوێ بۆنەوەت»**
**« چۆنە بەر بادی فەنایە ، دەرکەوی ، یــا سەرکەوی »**

واتە : هەر کەس ئەو هێما و رمۆزانە کە لە «قرآن»دایە تێی بگا لێیان، دەزانێ و بۆی دەردەکەوێ ، کە بە یەك گەیشتن لەگەڵ دۆستا و دورکەوتنەوە لێی بەهەشت و دۆزەخە و ئایەتی ( لایستوی اصحاب النار واصحاب الجنة ، اصحاب الجنة هم الفائزون) ئەمەی بۆ دەرخستون • یەعنی ئەهلی دۆزەخ و ئەهلی بەهەشت وەکو یەك نین ، بەڵکو ســەرکەوتوان ئەهلی بەهــەشتن • دۆست کە خوایە و بڕیاری داوە بە دۆستانی خۆی بەو بەهەشتە ، ئەوانەی بیانەوێ پێی شاد بین دەبێ نزیك بکەونــەوە لە خــوا بۆ ئەوە بچنــە ئەو بەهەشتە ، کە نیعمەتی خوایە •

عشق گەلێ کۆسپی لە رێدایە و بۆ چۆنە ناو ئەو عەشقە راستەقینــە گەلێ تەنگ و چەڵەمە دێتە رێ ، بۆ گەیشتن بەو ئامانجە ــ کە عشقــە و قاڵبۆنەوەیە لە ناو ئەو بۆتەیە ــ غەم و مەینەت بە قورسایێ کێو لەسەر شانی ئینسان بار دەبێ ، دەبێ پیاو ئەو کێوە هەڵبگرێ و دەشت و بیابانی نارەحەتێ ببڕێ • جا تۆ ئەگەر بتەوێ بگەی بەو ئارەزووە ــ کە دیداری یارە ــ نابێ ترست لە هەوراز و نشێوی غەم و جەفا هەبێ • تۆ عاشق بۆیت بە نۆری جەمالی خوا ، گەیشتن بەو نۆرە چەوسانەوەیەکی زۆرت دێتە سەر رێگا ، تۆیش تا دەیگەیتێ دەبێ هەمۆی قبۆڵ بکەی •

هارۆن برای حەزرەتی مۆسا و قــارۆن خزمی حــەزرەتی مــۆسا ، هەردۆکیان لە سەردەمی ئەو پێغەمبەرەدا بۆن • هارۆن هەژار بۆ ، قارۆن دەوڵەمەند بۆ • دۆ پیتەی «ه» و «ق» ــ کە لە سەرەتای دۆ ناوەکەوەن ــ ئیشارەیە بۆ ئەوان و بۆ ئەوە ئەو کەسەی سەری خۆی کزبگرێ و لــە

خۆی بایێ نەبێ سەرفراز و سەرکەوتو دەبێ وەکو هارۆن ‌• ئەوەش کــە خۆی بە زل بزانێ و لە خۆی بایێ ببێ سەرەوژێر دەبێتەوە وەکو قارۆن •

لە دەستوری «تجوید»ی عەرەبیدا چەند راوێژێك هەیە بۆ «۲۸» پیتە عەرەبی‌یەکان ؛ لێرەدا «ه» و «ق» هەیە ؛ واتە لە سەرەتای ناوی هارۆن و قارۆندا • لەو دەستورەدا «ه» لە پیتی بێ دەنگە ، واتە «همس»ە • «ق» لە پیتی دەنگدارە، واتە «قەلقەلە»یە لە دەستورەکەی ئەواناء جا دەڵێ هەر لە سەرەتای ناوەکانیـانەوە ئەو فەرمانبـەرێ و گومڕاییـە دەردەکەوێ ؛ «هارۆن» فەرمانبەرێ کرد سەرفراز و سەرکەوتو بو ، «قارۆن» گومڕایێ کرد ، لە ئەنجاما خۆی و هەمو خەزنە و سامانەکەی چون بە ناخی ئەرزا و نقوم بون ! •

ئەی ئەو کەسەی کە ئیمڕۆ لەسەر تەختی دەوڵەمەندێ و سامان پاڵت لێداوەتەوە ، سبەینێ کە مــردیت تێ دەگەی و بــۆت دەردەکەوێ کە وا ئاتاجی ژەمە نانێکی ئێوارانیت ؛ واتە دنیا پشتی پێ نابەسترێ ، دەوڵەمەندێ دنیا نابێ پیاو لە رێ دەرکا ، مردن بە شوێن ئەم ژیانەدا دێت • ئەگەر تا لە دنیادایت چاکەیەك نەکەی بۆ دنیاکەی ترت ـــ کە پاش مردنــە ـــ لەوێــدا موحتاج دەبی بە تاقە شێوێك بۆ تاقە شەوێکت • کەچێ لە دنیادا ئــەوەت نەدەهات بە بیرا کە ئەو دارایی‌یەت بۆ نامێنێتەوە ! •

دۆستان و خۆشەویستانت هەمو رۆیشتن و دنیایان بەجێ هێشت • کە رۆیشتنیش وەنەبێ یەکە یەکە رۆیشتبن ، بەڵکو بە کۆمەڵ کۆمەڵ رۆیشتن، دەنگی ترپەی پێیان لەکاتی رۆیشتنەکەدا زرمەی دەهات ، واتە ئەوەندە بە زۆرێ دەڕۆن ، کەچێ تۆ توشی بێ ئاگایێ و بێ خەبەرێ بویت لێیــان • ئەگەر ئەو دەنگی زرمە زرمی پێیەیان نەیەتە گوێت و نەیبیستی بەراستێ تۆ

ئینسانێکی کە سەرخۆشی پرخەی نوستنیت و ئاگات لە هیچ نیە ! •

دۆست ، کە خوایە ، گریان و زاری پێ‌خۆشە ، چونکە گریان و زاری نیشانەی پاڕانەوەیە لەو ، ئیتر تۆ چۆن دڵت بڕوایێ دەدا بۆ شتێکی بێ ئەنجام و بێ مانەوە دەست دەکەی بە پێکەنین ، شتە بێ ئەنجامەکەش دنیا و دەوڵەتی دنیایە !• کە ، دۆست گریانی پێ‌خۆشە و پاڕانەوە لەوی پێ‌خۆشە، ئەی فرمێسك بارانی خۆت بڕێژە و لەبەر ناڵەناڵی سۆزی عاشقانی بارەگای خوایێ بروسکە لێدانەکەت با نەسرەوێ بگری بە خۆڕ ، چەخماخە لێدە بە گوڕ ! •

دەریای عەشق ئەوەندە بێ پەی و فراوانە ، کەنار و رۆخێکی نیە • نازانم قسە لە چیەوە بکەم ؟• نازانم قسە لە شەرمەزاری و سەرلێ‌شێوان و سەرگەردانیەوە بکەم ؟ لەو رێگای عەشقەدا !• یا لە خۆشی و لەزەت و کامەرانیەوە بکەم ؟• لە کاتێکا کە نزیك دەکەومەوە لە نوری جەمالی خوا !• نازانم قسە لە کامیانەوە بکەم !• بەحری عەشقی کە وابێ و ئەوەندە بێ بن بێ ، باسکردنی «محی‌الدینی عەرەبی» لە « الفتوحـات المكيـة »ی دا و باسکردنی جلال‌الدینی رۆمی لە «مثنوی»یەکەی‌دا دەربارەی ئەو دەریای سۆفیەتیەدا ، وەکو قەترە بە دەریا وایە ، کە ئەوان وا بوون ئیتر من باسی چی بکەم و دەگەمە کوێ ؟!•

چۆن من دەتوانم بچمە ناو ئەو لێشاوی سۆفیەتیەوە و ئەو مەیدانە کە نزیك‌بونەوەیە لە نوری خوا !• لە کاتێکا کە یەکێکی وەکو حەزرەتی موسا کە دەستی سپی پڕ لە نوری دەرخست هەمو عالەم چونە سەر دینەکەی • وە یەکێکی وەکو حەزرەتی عیسا بە وتەیەکی بەینی دو لێوی مردوی زیندو دەکردەوە ، ئەویش زوربەی عالەمی ئەو وەختە چونە سەر

دینەکەی • بە مەرجیّ کە دەستی مۆسا و دەمی عیسا ئەوە تیشکی عەکسی نۆری خوایێ بۆ لێی دابۆن ، بۆیە ئەو موعجزانەیان بۆ پەیدا بۆ • کەوا بۆ من چۆن یارای ئەوەم دەبێت کە بچمە ئەو مەیدانەوە و چۆن دەتوانم لەبەر ئەو تیشکەدا خۆم رابگرم ؟!•

گورۆکردن و رامکردنی ئەو دۆستەم کە لە سڵکردن و رەوینەوەیا وەکو هەندیّ لە گیانلەبەرە جوانەکانی کێو وایە ، ئەم گورۆکردنەی شتێکی زۆر دیژوارە • ئەگەر وتیان تەیری عەنقا وەکو کەوی ماڵیّ کەویّ دەکریّ هەرگیز بڕوا بەم قسەیە مەکە ، عەنقا کەویّ ناکریّ • لە ئەفسانەدا هەیە کە عەنقا باڵندەیەکە گەلیّ ئەوسافی بۆ وتراوە • ئەو عەنقایە ناوی هەیە و خۆی نیە !•

چاوی بیمار لە راوێژی هۆنەرەکانا چاوێکە کە نیوەی هەڵێنێتەوە • ئەمە بۆ وەسفی یار وەسفێکی زۆر باڵایە ، وەکو ئەوەی پێی دەڵێن چاوی نەرم-یشی پیّ دەڵێن • جا ئەو چاوە نەرمە بیماریّیە گفتی دا کاتیّ کە سەیری شتێك بکا ، ئەو سەیرەی بیّ بە تیرەباران بۆ ئەو شتەو ئەو شتە لە ناو بەریّ • سەیرکردنەکەش چونکە لە نێوانی برژانگەکانەوە بە ئەندازەی زۆریّ ئەو برژانگانە ئەوەندە نیگای لیّ دەبێتەوە ، وەکو بارانی تیری لیّ دیّ !• کەواتە ئەی دڵ !• تۆیش کۆشش بکە بۆ ئەوە نیگایەکیش رۆ بە رۆی تۆ بکاتەوە و تۆیش بەر ئەو تیربارانە بکەوی •

« من لەم شوێنەدا لە سەر هۆنراوی نۆیەم و دەیەم ناژۆم ، چونکە یا من نەمزانیوە ، یا ئەو زنجیرەی باسەکەی بە باوەڕی من گۆڕی !• هەر ئەوەندە دەڵێم لە راوێژی سۆفیەتیّ‌دا خوا مەعشوقە ، عاشق نیە !• »

ئەی مەحویّ لەو کاتەدا و لەو شوێنەدا کە تۆ لەم دنیایە جیا دەبیتەوە و

دەکەویتە بەر «با»ی لەناوچۆن • ئا لەو کات و شوێنەدا هەر فرمێسك و ئاهێك لەبەر پەشیمانی دەرکەوێ ئەو فرمێسکە و سەرکەوێ ئەو ئـاهە ، هەر تۆ دەچیتەوە بۆ دەشتی نەبوونی • فرمێسك و ئاهت کەڵك ناگرێ • بۆیە کەڵك ناگرێ چونکە ئاه و گریانت بۆ ئەوەیە کە تا هێزت تیا بو لە دنیـادا ئیشی چاکەت نەکرد و ئاه و ناسۆری ئێستەشت بۆ ئەوەیە کە چاکەیەکت نەکرد ، تازەش ئەوە کەڵك ناگرێ • کەواتە پێش ئەوە بکەویتە ئەو ڕۆژەوە بکەوەرە سەر کرد و کۆشی چاکەکردن بۆ ئەوە ئەو وەختە بە کەڵکت بێ •

لە پایانی ئەم لێکدانەوەیەدا و لە ئەنجامی ئەم هۆنراوانەدا بۆمـان دەرکەوت کە چۆن هۆنراوی مەحوی لە کورەی دەروونێکی بەجۆشەوە بووە بە نموونەی سۆفێتی لە هۆنراوی کوردیدا ؟• و چۆن خـویشی بووە بـە گوڵدەستەی کۆڕی مەی نۆشانی سۆفێتی ؟• بە خـۆی و بە هۆنراویـەوە کەوتوونەتە عالەمێکی ترەوە ؛ لەو عالەمەوە فەلسەفەی سۆفیانەیان هێناوەتە ناوەوە و وەکو بڵێی بە تەواوی لایەنی زانیاری و لایەنی ماددیات هەمـوو کەوتوونەتە ژێر باڵی ئەو فەلسەفەی سۆفێتییەوە !• بەڵکو دەتوانین بێژین مەحوی ئامانجی خۆی و سۆفێتی هێناوەتە دی !•



بچینە سەروەختی هۆنەری دڵسووتاو بە ئاگرێ سـۆزی سـۆفێتی « حەریق »ەوە ، بزانین ئەو لەم ڕووەوە چی دەڵێ :

**« ئینکاری سرایەت مەکە ، ئەی مونکری موفلـس »**
**« بێ سەیری قەمەر کە ، چ بە شەوق و بە « ضیایە » »**

**« مونکر بە مەسەل شەبپـەرە بێ نـووری هدایـەت »**
**« خۆی تـالبی زوڵمـەت بـوو ، خوا نـووری نـەدایە »**

« هەر مەزبەلـە ، هەر مەشعەلە جێ‌پڕتەوی شەمسە »
« یەك جێگەی «فوضلە» ، یەکێ جێ « فوضەلایە » »

« بارانی بە ڕەحمـەت لـە تەرەف مەبدئی «فیّاض» »
« قەترەی ئەثەری سونبول و یـەك چقڵ و گیـایە »

« تێ فکرە لە ئـەجزای عەنـاسر بـە تەبیّعـەت »
« یەك ماتڵی مەرکەزە ، یـەك ، مەیـل بە هـەوایە »

« « نقصان » لە تـەرەف قابلە ، نـەك فاعلی موختار »
« ئـەم قەولی منـە ڕای جەمێعـی حوکەمـایە »

« بورهانە لەسەر جەهلی عەدو ، شەمسی حەقێقەت »
« تابع بووە ئەو ئەحمەقـە ، جۆیـای چرایـە ! »

« چاوی بە تەمەع پڕبووە ، قەلبی بـە حەسـادەت »
« وەك حاڵی «بهائم» ، ڕەحەتێ هەر لە شـەوایە ! »

« هینـدۆ نی‌یـە ئـایینی لە ئاوێنـە ئـەمدا تەعـن »
« ئـاوێنە چ سـوچی هەیـە ؟. ئـەو ڕوی سیایە ! »

« پەروانەیی هەر جەمعێ نەبی چاکە « حەریـق »ی »
« خۆت باوێژەرە ناو زومرەی ئەم شەمسی هودایـە »

حەریق ئەوەی بۆ دەرکەوتووە کە لە دراوسێتێ چاکان ، چاکە وەر دەگیرێت و لە هی خراپان خراپە . وە باوەڕی سۆفیانەی لەسەر ئەوەیـە کە نزیك‌بونەوە لە بارەگای پیرانی ڕۆحانێ نەسیمێکی ڕزگاربون لە دەست نەفس و شەیتان دێت بە ڕوی ئینسانا . دەڵێ :

تۆ نابێ ئینکاری ئەم مەسەلەیە بکەیت و بڵێیت : جا لەم نزیك‌بونەوەیە، چ سودێك وەردەگرم ؟. ئایا نابینی ئەگەر بە هۆی ئەو دراوسـێتی‌یەوە نەبوایە کە ، لە بەینی مانگ و ڕۆژدا هەیە ، مانگەکە ئەو شەوق و ڕوناکیەی لە کوێ وەردەگرت ؟!.

ئەوانەی مونکری ئەم دراوسێتێ و تەنینەوەیەن وەکو شەمشەمەکوێرە

وانە ؛ شەمشەمەکوێرە لەبەر ئەوە کە خۆی هەر بۆ تاریکی دەکوتێ ، خوا لە ڕووناکی بێ بەشی کردوە • ڕووناکی بۆ ئەو وەکو تاریکی بۆ غەیری ئــەو وایــە ! •

دیسان تەماشا دەکەی هەمو شوێنێك . چ سەرەنوێلك بێ ، چ جــێ گوڵستان بێ ڕووناکی ڕۆژ لێی دەدا، بەڵام یەکێکیان ــ کەسەرەنوێلکەکەیەــ شوێنی خڵت و خاڵ و پیس و پیسایی‌یە ، ئەویتریان ــ کە گوڵستانەکەیە ــ جێگای عەتر و عەبیر و بۆنخۆشی‌یە •

لێرەدا حەریق ئیشارەی بۆ پیرەکەی خۆی کردووە کە شێخی بورهانە و ڕووی دڵی لە مەعنەویاتی ئەو کردۆتەوە •

بارانی ڕەحمەت کە دەبارێ دەدا بەسەر هەمو شوێنێکا ، لە هەنــدێ شوێنیا بە هۆی ئەوەوە گوڵ دەڕوێ ، لە هەندە شوێنا دڕك و داڵ •

لە ورد و دروشتی هەمو عنصر و ڕەگەزێــك ورد بەرەوە ، تەمــاشا دەکەی هی وا هەیە هەر سەر دەباتەوە قوڵاخی خۆی و بۆ ناوەوە دەچێتەوە، هی واش هەیە مەیلی بەرزی دەکا و سەرەوژوور دەبێتەوە • یەك بنجە گیایە ، لقێکی پان دەبێتەوە بەسەر زەویــەکەدا ، لقێکیشی ســەرەوژوور ڕووە و ئاسمان دەڕوا !•

ئەمە دیارە قابلیەتی وای هەڵدەگرت ، ئەگینە فاعلی موختــار ــ کە خوایە ــ ئیشێکی پێیان نیە ؛ ئەو دوو لقە گیایە کە لە یەك تاقە تۆو ڕواون و لە سەر یەك بنج دەرهاتوون ،یەکێکیان بەلای نزمیدا دەچێ و ئەویتریان ڕوو لە بەرزی دەکا • ئەوە لەبەر ئەوەیە کە لەوە زیاتریان لە بارا نیە بۆیە وا دەکەن•

لێرەدا «حەریق» ڕێگەی عەقائدی ئەهلی «ئەشعەری» گرتوە کە دەڵێن:

« خوا ، شت دروست دەکا و بەندە دەیهێنێتە دەست » • دەڵێ ئەم قسەیەش کە دەیکەم قسەی حوکەماکانە ؛ وەنەبێ لە خۆمەوە بیکەم •

شوێن سەبەب و هۆکەوتن شتێکی رواڵەتیە وەنەبێ دۆزینـــەوەی ئەسلی حەقیقەت بێ ؛ تەماشا دەکەی رۆناکی چرایەك کە دێت و پیاو شوێنی دەکەوێ ، ئەوە وەنەبێ شوێن حەقیقەتەکە کەوتبێ ! •

کابرا بۆیە کەوتۆتە شوێن شتی رواڵەتی ، چونکەچاو و دڵی بە تەماع و حەسوودی پڕبوەتەوە و وەکو ماڵاتی لێ هـــاتوە ، بێجـــگە لـــە خواردن و نوستن هیچی‌تر نازانێ •

کابرایە ، کە خۆی لە سروشتدا ناشیرین بێ ، بۆچی دەبێ لە ئاوێنـــە تۆڕە ببێ ، لە کاتێکا کە سەیری خۆی تیا دەکا ؟ • ئەگەر ئەو خۆی ئیشی چاکەی کرد لە پاشا لە ئاوێنەی ئەعمالدا وێنەی چاکەی بەرچاو دەکەوێ ، ئیتر وەنەبێ بۆ ئەم چاکێ و خراپیە سووچێك لە ئاوێنەکەدا هەبێ ! •

« حەریق » خۆت مەکە بە پەروانەی هەمو چرایەك و لە هەمو شـــت خۆت تێکلاو مەکە • خۆت تەنیا باوێژەرە ناو کۆڕی ئەم پیاو چـــاکانە کە کۆڕی دەستەی شێخی بورهانە •

تەماشا دەکەین حەریق بە جۆرە باوەڕێکی‌ترەوە چوەتە ناو فەلسەفەی سۆفێتیەوە •

حەریق مریدی ــ یوسف شمس‌الدین ــ شێخی بورهان بووە، فەلسەفەی سۆفێتی لە گۆشەی چاوی ئەوەوە دەربڕیوە• لە باوەڕی ئەوا شێخی بورهان لە عالەمی مەعنەویاتا بە جۆرێـــك بەرز بوەتـــەوە ئەگەر ئەو کەســـەی کە دەیەوێ لە ماددیات دوور کەوێتەوە و بکەوێتە عالەمی مەعنەویاتەوە ، ئەگەر

ئەو کەسە بە ڕێبازی شێخی بورهاندا نەڕوا ، ئەو ئارەزووەی کە هەیـەتی بۆی نایەتە ئەنجام و لە غەیری ڕێگاکەی ئەوا دەستی ناکەوێ •

دیسان ئەم لە ناخی مەعنەویاتا بە جۆرێك ڕۆچوە کە بە دەربڕینـی فەلسەفەی سۆفێتی دەیەوێ ئەو مەعنەویاتە وەربگرێ•بە بەڵگە بۆ مونکرانی عالەمی سۆفێتی ئیسباتی دەکا کە هەر بون و نەبونێك لەم کەونەدا هەیـە هەموی پەردەیە و حەقایق لەو دیوی پەردەکەوەیە • جا ئەوانەی کە ئـەو حەقایقەیان دەوێ دەبێ چاویان لەم پەردەی ماددیـاتەوە نـەبێ ، چونـکە ماددیات و ئەو حەقایقە مەعنەویە گەلێ دوورن لە یەك ! •



# ملخص المقال

## التصوف في الشعر الكردي

العضو العامل : علاء الدين سجادي

التصوف هو العالم الروحي الذي تمركز في الاسلام وفي الاديان ، او بوجه عام كمن في امخاخ البشر • فلسفة تكوين البشر فلسفة لايتمكن الانسان ان يصل الى غورها مهما طال الزمن ، او يرقى العلم الى درجة اعلى من هذا الرقي الذي نشاهده في عصرنا هذا •

الطبيعة البشرية تحتوي على شيئين متناقضين لا ثالث لهما ؛ الطبيعة المادية ، والطبيعة الروحية ، اي المعنوية • فهما صنوان متقابلان ينشآن من مركز واحد وهو جوهر البشرية • فالكلام عن المادة او المادية منحصر في ان المادة او المادية تحتوي على الاشياء الملوسة او المبصرة ، والمعنوية هي عبارة عن المثل العليا التي لاتعوقها المادة ولا تدركها الابصار • فمنها الخيالات الرقيقة التي تسبح في الفضاء الغيرالمتناهي ، فتصيد اوكار الماديات وتكشف اشباح المادة في ذلك الفضاء وفي ماوراء الفضاء ــ اذا تتمكن ان تصل اليه ــ

فالقوة الخيالية والقوة العقلية عند علماء الحكمة تبحثان في الافاق المرئية وغير المرئية الى ان تلتقيا بالواقع الذي هو شبح المادة وركيزتها • هذه من جهة ومن الجهة الاخرى ان الانسان ــ كانسان ــ محفوف بتلك القوتين المادية والمعنوية ، وهما موجودتان فيه الا انهما لاتجتمعان في آن واحد ،

اذ لايمكن اجتماع النور والظلمة في آن واحد ، ولكنهما موجودتان فيه على التعاقب .

فالانسان من حيث انه مكون من الدم واللحم والعظم جسم كبقية الاجسام ومادة كبقية المواد ، ولكن القوة الدراكة الموجودة فيه ، بما فيها العقل والوهم والخيال هي من الامور المعنوية لاوجود لها في خارج الذهن . فهي تتمكن ان تتحرى عن الحقائق المكنونة الى ان تصل الى جوهر الفرد ، والى النور الذي هو قبس من ذات الباري جل وعلا . فاذا وصل العقل والوهم الى تلك الساحة الفسيحة تغلب هو على صنوه المادي ، اي على القسم الذي تكونت منه مادة الجسم واشباح مادة الجسم ، بل يتيه في تلك الساحة ولايرى عدا عظمة الاله وروعة نور الله . فهنا تظهر فلسفة التصوف ويبرز للعيان في ذلك الميدان امثال حسين منصور الحلاج وجنيد المحتاج الى جمال ربه ، فيتغلبان على القسم المادي ويمحيانه الى الابد بالنسبة الى انفسهما .

كلما مد الزمن وجر انفاسه نحو المستقبل تبينت علاقة الفلسفة المادية والمعنوية اوضح مما كانت عليه في السابق ، ولا خلاف في ان اثبات المعنوية والروحية بالرموز المادية التي ظهرت في هذا العصر لم تكن واضحة بهذه الدرجة قبل مأة عام او اكثر ، ولا يخطر بالبال طريقة الاثبات بهذا الموضوع في ذلك الوقت !.

فاذا ضربنا المثل بهؤلاء الرواد الذين وطئت اقدامهم سطح القمر ظهر لنا الفرق الواضح بين القوتين المادية والمعنوية ! لانبحث عنهم من الناحية العلمية ، أي من حيث أن العلم اوصلهم الى ذلك المكان ، بل البحث عنهم يدور حول زاوية اخرى ، هي الاستدلال بهم لثبوت غلبة القوة المعنوية على القوة المادية نتيجة رحلتهم الى الفضاء . فأدركوا ان اجسامهم المكونة من

الاجزاء المادية تهز هزا شديدا وليس في مقدورهم ان يسيطروا عليهـا لكي يستقروا في مكان ما على القمر كاستقرارهم على وجه الارض !٠

فما هو السبب لهذا التبدل الهائل بالنسبة اليهم والى الاجيال القـادمة الذين يصلون الى الثوابت والى الاجرام الفضائية الاخرى ؟٠ السبب هـو خروجهم عن مدار جاذبية الارض وسيطرتها على ثقل اجسـامهم ٠ فحينمـا عادوا الى الارض رجعوا الى الحالة التي كانوا عليها سـابقا ، وهي الهدوء والاستقرار وضبط الجسم في أي مكان يريدونه ٠

فالقياس ههنا ليس بين المادية والمعنوية ، بل تشابه القياس بين المانـع والمقتضي ؛ أي انه اذا اجتمع المانع والمقتضي تغلب المانع على المقتضي ، ولكن اذا رفع ذلك المانع رجع المقتضي الى مااقتضاه ٠

المانع لعدم استقرارهم على سطح القمر هو خروجهم عن سيطرة جاذبية الارض ، فبعدما عادوا اليها ، عاد المانع ايضـا ، فزال المقتضي مرة ثـانية ، فسيطروا على اجسامهم لاستقرارها في اي مكان يريدون ٠

كما قلت ان وجه القيـاس بين المـانع والمقتضي ، لا بين نفسي الماديـة والمعنوية ، لان عملهم هذا ورحلتهم الى الفضاء ونزولهم على سطح القمـر كل هذا كان من ثمرات العلم لا من النسمات المعنوية ، اذ ان المادة الموجودة فينا نفس المادة الموجودة فيهم ، كما ان اجزاء اجسامنا مكونة من العناصر المادية ، هي نفس العناصر المكوّنة لاجسامهم ٠

ان طرفي تكوين الانسان كما قلنا من حيث الظاهر والباطن هما الماديـة والمعنوية ، فاذا زالت المادة او المادية اخذت المعنوية مجراها بصورة واضحة٠ كما ان الاس الاساس للكون وما فيه هو المعنويات ، فالمادة عارضة عليها ٠ فاذا لم اكن مبالغا اقول ان الاجرام الكونية ولو امام اعيننا في وقتنا الحاضر من العناصر المادية ولكن في بدء تكوينها أي قبل ملايين السنة الزمنية

لم تكن موجودة ، فظهرت تلك الاجسام الجرمية رويدا رويدا في هذا الفضاء غير المتناهي ، ذلك الفضاء الذي يكون في المستقبل البعيد قياسا على الماضي البعيد اضعاف المضاعفة للاجرام الموجودة فيه حاليا •

كيف تتصور المسافات الزمنية الموجودة ، او كيف نراهـا بين تلـك الملايين الاجرامية في الفضاء !• نرى المسافة بين كوكب و كوكب كانه شبر او قاب قوسين !• في حين ان المسافة الحقيقية بين ذينك الكوكبين لاتقل عـن مسافة ملايين الاميال بينهما •

نرى في حلمنا خلال ربع ساعة نطـوف في البلدان ، ونرى الامـاكن البعيدة ، ونعبر البحار المترامية الاطراف ، وتتسلق الجبال الشاهقة • فبعد هذه الجولة العجيبة نستيقظ فنرى انفسنا في فراشنا !• لاشك ان تلـك الجولة الهائلة اذا قمنا بها في حالة يقظتنا ــ اذا قمنـا بها ــ احتـاجت الى سنوات وسنوات • فهذا يدل على ان الزمن يتبدل ويتغير ، وان ذلك الزمن في حالة النوم غير الزمن الذي نحسه في حالة اليقظة !• وايضا ان المسـافة الواقعية الموجودة بين الكوكبين ، او الكواكب غير المسافة التي نشـاهدها نحن سكان الارض بينها •

فهذان المثالان يدلان على ان الواقع الحقيقي شيء وان المشاهَد شيء آخر • فنحن نرى المادة الصرفة في حياتنا اليومية ، ولكن وراء هذه المـادة والماديات توجد اشياء ومعلومات لاندركها ولا نصل اليها اذا كنا على حالتنا هــذه •

هؤلاء النفر الافذاذ الذين هم بشر مثلنا حينما يسبحـون في بحـار المعنويات ، ويدركون الخفايا التي لاندركها نحن المغمورين بالمادة ، لايصلون الى تلك المرتبة وتلك الحالة الا بواسطة الرياضة النفسية ، والتفكر في صنع الخليقة والتنكر عن ابهات المادية • ان رياضتهم النفسية توصلهم الى عـالم

لاتبقى امامهم الحجب المادية ، فيرون حال يقظتهم وسباتهم ونومهم • كل مفهوم موجود في الكون ، وفي ماوراء عقولنا واخيلتنا . كما كان الاشراقيون على هذا المنهج •

نعم انهم ــ أي تلامذة مدرسة المعنويات ــ ولو ان قلوبهم وخواطرهم محفوفة باجسام اجسادهم ، وهي الاجساد المكونة من جوهر المادة ، ولكن حالتهم هذه تشبه حالتنا اذا كنا في مقصورة من البلور الصافي ، ولا يوجد المنفذ فيها ، فنرى الدنيا التي وراءها ، قدرة قوة باصرتنا فقط ، ولكن لاتتمكن ان نخرج منها لوجود الحجاب المادي امامنا • فهكذا المتصوفون المعنويون ، فخواطرهم في قفص اجسامهم ، ولكن تلك القوة الدراكة تنفذ الحجب المادية فتصل الى الحقائق المعنوية البعيدة والقريبة منهم •

وايضا اذا أنا وانت وهو ــ أي الرجل المعنوي ــ نكون في غرفة مبنية بالسمنت والآجر . فنحن لانرى اي شيء مطلقا وراء الحائط ، ولكن هو يراه كما يرانا بجنبه !• والسر هنا هو انه وصل الى درجة من الروحيات والمعنويات لايعوق امامه ذلك الحائط المادي لرؤيا الاجسام فيما وراء الحائط•



هذا شأن الانسان بالنسبة الى الروحيات والمعنويات . سواء أكان هذا الانسان المطلق يدين بدين معين ؟• او يترك هو وشأنه !• فاذا ارتبط هو بدين من الاديان يقوى ذلك الدين الجانب المعنوي ، لانه يصقله ويهذبه ، مثله كمثل السيف المهند الذي تصقله المادة المنقية والمجلية فتدرأ عنه الصدأ والفساد • او كمثل حقل معين ؛ فينتج منه الزارع غير الماهر انتاجا بسيطا ، ولكن اذا ادير من قبل الزارع الماهر وبصورة فنية كان الانتاج اضعافا مضاعفة • الدين بالنسبة الى الروح الانساني نفس الشبه بالنسبة الى السيف المصقل والحقل المفنن •

فقبل ماينتمي الانسان الى الدين تأخذ روحه قسطا من المعنويات ، ولكن الاخذ ليس الا بقدر ماهو مرتبط به • فبعد ما ارتبط ذلك الانسان بدين ، الدين يصقله ويهذبه ، فيكون أخذه منها اضعافا مضاعفة •

موضوعنا الى الآن موضوع المعنويات والماديات بالنسبة الى الانسان• فلا ارضى شخصيا بالقول الذي يحتوي على ان المعنويات تكون سببا لانهيار الماديات ، او كانت !• ولا اعترف بهذا لان الماديات والمعنويات كانتا متلازمتين منذ نشأتهما ، لا المادة تنمو بدون المعنوي ، ولا المعنوي تنجلي بدون المادة ، لا النهار يتمكن ان يؤدي واجبه بدون الليل ، ولا الليل يقوم بمستلزماته بدون النهار • لابد من وجود الليل ووجود النهار ، لابد من وجود الماديات ، كما لابد من وجود المعنويات •

فموضوعي هذا موضوع علمي بالنسبة اليهما • كل موضوع له خصائصه ومزاياه ، كل علم من العلوم ، سواء كان نظريا ، او تطبيقيا له مفاهيمه الخاصة • لابد للحداد ان يستعمل ادوات الحدادة لعمله ، وكذا الخياط لابد له ان يستعمل ماهو محتاج اليه لعمله • لايجوز لذلك ان يستعمل ادوات هذا لعمله ، وكذا العكس • فصاحب الموضوع الادبي واجب عليه ان يستنجد بالمواد الادبية ، كما ان صاحب الموضوع العلمي واجب عليه ان يلتجيء الى المواد العلمية لانجاز انتاجه • لايجوز ان ينتقد الحداد على انه لم لايستعمل الادوات المتعلقة بغير مهنته !•

يقال من قبل بعض الآراء ان المعنويات آلة معرقلة لرقي الانسان وتقدمه!• ولكن نسأل هل الانسان خلق وكون للماديات فقط؟ • الجواب لا؛ لأن المادة ليست كل الانسان ، كما ان النقود ليست كل شيء ، وايضا ان الانسان ليس مخلوقا للمعنويات فقط ، لان المعنويات ليست كل شيء ، كما ان الضوء ليس كل شيء • فأذن لابد للمعنويات بقدر مالابد للماديات

لكي تتقدم عجلة اعمال الانسان الى الامام على احسن مايرام .



ومن جملة الاديان التي جاءت الى البشرية الدين الاسلامي ، فهو آخر دين ظهر الى الوجود وبسط نفوذه في انحاء العالم ، ولم يظهر بعده دين يتمكن ان يسيطر على النفوس مثل ما هو سيطر عليها .

فيقال في حقه انه اهتم بالمعنويات والروحيات اهتماما زائدا . فهذا القول صحيح انه اهتم بالمعنويات ، ولكن اذا اتهم بانه اهمل الماديات ـ كما اتهم ! ـ هذا غير صحيح ؛ لان الاسلام اخذ المبدأ الاساس وشرحه كما هو الواقع . وفي نفس الوقت وبنفس الفلسفة انه لابد من اخذ الماديات ايضا، لان المعنويات في نظره الغطاء الباطني للماديات،والماديات الغطاء الظاهري للمعنويات ، فاذا لم يؤخذ بكلا المبدأين لم يحصل أي من المبدأين !.

هذه نظرة الاسلام تجاه المعنويات والماديات . وعلى ضوء هذه الفكرة اقول واصرح بانه اذا اخذت المعنويات بقدر ما يحددها الاسلام ، واخذت الماديات بقدر ما اخذ الماديون ـ على رأيهم لنفع البشرية وتركهم المعنويات ـ فاذا تكاتفت الروحيات الاسلامية وماديات المدرسة المادية سعدت البشرية وارتقت الى اعلى مما نراه الآن . هذا رأي .



بزغ الاسلام قبل قرون ، فجاهد لبسط الدين الحنيف . فصدر الاسلام طافح بالبطولات والتضحيات في سبيل الدين ، فبعد مضي زمن غير قليل اخذ اهل السيف بمقبض السيف ، واما القسم الذي لم يتمكن على اخذ السيف اشتغل بالعلم وبنشر العلوم الاسلامية في العالم . فالمجموعة التي تحت هذا اللواء سلكت طريقين متشابهين ؛ طريق الشريعة ـ حسب تسميتهم ـ وطريق الطريقة ـ حسب تعريفهم ايضا ـ وسميت هذه الطريقة بالطريقة التصوفية.

ولا أظن ان الطريقتين متباعدتان او متنافرتان ، بل كل واحدة منها آزرت ظهر الاخرى ، والعلاقة القائمة بينهما علاقة السوار بالمعصم ، لان هدف كل واحدة منها البلوغ الى مدينة الاسلام والى سمو الاسلام •

فالشيخ عبدالقادر الجيلاني ، والشيخ بهاءالدين النقشبندي البخاري، والشيخ احمد الرفاعي كما كانوا متصوفين علماء بارزين ايضا ، والامام الغزالي ، وامام الحرمين ، ومحمد ابن العربي كما كانوا من العلماء الافذاذ كذلك كانوا من المتصوفين الابرار • ولكن على تعبير العصر كل منهم اخذ «الاختصاص» ؛ هؤلاء في الطريقة ، وهؤلاء في الشريعة •

انتشرت الصوفية في الاسلام انتشارا هائلا ، وسبب هذا الانتشار سواء كان تجنب المتصوفين من الحكم ، او انعزالهم عن زخرفة الدنيا ، او كلاهما ، او لاسباب اخر • علت الصوفية كالنار على العَلَم° • فالتف حولها اناس من كل صوب وحدب ، ودخل في حوزتها افراد من كل قوم • اجتماع المتصوفين في رباطهم ، وتكاياهم ، وخانقاهاتهم وحلقاتهم في مجالس الذكر، وفي حلقات الختم يذكرنا بذكريات دار الندوة ودار الارقم في صدر الاسلام! •

فأنشد الشعراء والكتاب في كل قوم قصائد وروايات حول التصوف وفلسفة التصوف وآراء المتصوفة • فصافح شعراء الاكراد ، غير الاكراد ، لتمجيد الصوفية ولتوضيح فلسفة الصوفية والمتصوفين • فشاركوهم في افراحهم واشجانهم ، في فلسفتهم وآرائهم الروحية ، في معتقداتهم الدينية، في تعابيرهم الرمزية ، ومغازلاتهم الشعرية تجاه المرشد المتصوف والفلسفة الروحية للشيخ المتصوف! •

**هذا اوان الشد فاشتدى زيم**
**فبرز الصوفي على ظهر العَلَم°**

فهذا الشيخ احمد الجزيرى المتفاني في حب الله يتكلم عن الصوفية

وعن فلسفة الصوفية باشعاره الرنانه المحرقة لقلوب المتصوفين وغير المتصوفين، حيث يقول :

« ئەوەل کو یــار دامه ، یەك زەرەیەك عنایەت »
« قسمت مه خەمرو جامه، د دەفتەرێ هدایەت »

حينما اعطى لنا المحبوب ذرة من عنايته الفائقة ، فحصتنــا في كتــاب الهداية والوصول الى معرفة الخالق كانت خمرة وقدحها ، فشربناها ، فوصلنا بسببها الى عالم الحقيقة والمدار القدسية •

ان المحبوب والمعشوق الحقيقي الذي هو ذاته جل جلاله حينما اظهر وابرز ذرة من نوره فبعدما شاهدناه ادخلنا جل وعلا في زمرة هؤلاء الذين سجلت اسماؤهم في سجل الناجين ، كما ادخلنا في حلقة الابرار الذين شربوا شراب معرفة الله فوصلوا الى ادراك الحقيقة ، وتنزهوا عن المادة ، وتشرفوا بكأس المعنويات • دخلنا في دوحة رفع الستار فيها لندرك الانوار ، ولكن مع هذا لم نتمكن ان نصل منتهى الغاية •

هذه ترجمة شعر واحد من النص الكردي ، ومجموع القصيدة عبارة عن احد عشر بيتا ، فالنص الكامل مذكور في القسم الكردي •

نذهب الى الشاعر الثاني (مەولەوی) لنرى ماهي فكرته الوحدانيــة وفلسفة التصوف في اشعاره ؟• فيقول :

« نــەزەر عـــادەتا مەعرفـــەت دەدات »
« تەســدیق به وجود به وجــوب زات »

النظر والمطالعة تعطي للانسان المعرفة والدراية لكشف الامور الغامضة، في هذه النظرة يتبين للانسان وجود واجب الوجود وهو ذاته سبحانه وتعالى، لانه اذا تفكر في مبدعاته ومخلوقاته يتيقن ان هذه المخلوقات والمبدعات لهــا خالق واحد ومدبر واحد • وله صفات ازلية وابدية كذاته جل وعلا •

هذا محتوى شعر واحد من الاربعة عشر شعرا • النص الكامل للمجموعة مذكور مع الشرح في القسم الكردي •

فنذهب الى الشاعر الفاني في حب الله «مەحوی» لكى نرى ماذا يقول في التصوف وفلسفة التصوف :

**« تێ دەگا هەركەس بكا فـــەهمی رموزی مەعنـــەوێ »**
**« هجرو وصله ، نـــارو جەننەت ئایەتی ( لایستوی ) »**

ان الاشارات والرموز الموجودة في القرآن اذا اطلع عليـــه الانســـان المنصف تبين له ان الوصول وعدم الوصول الى الله هو الجنة والنار • اذ ان آية ( لايستوى اصحاب النار واصحاب الجنة ، اصحـــاب الجنـــة هـــم الفائزون ) بينت تلك الحقيقة واوضحت كل ما هو يصلحنا ويفيدنا • واعلمتنا ان اهل الجنة واهل النار لايستويان ، بل الفائزون هم اهل الجنة والخاسرون هم اهل النار . حيث ان المحبوب وهو الله سبحانه وتعالى وعد احبائه وعشاقه بالجنة ، ومن يريدها فعليه ان يتقرب الى الله ويطيع اوامره •

مجموع القصيدة عبارة عن احد عشر بيتا ، فالشرح المذكور ههنا كان محتويا بيتا واحدا ، فالنص الكامل مع شرحه مسطور في القسم الكردي من هذا العدد •

فنرجع الى الشاعر الرابع ــ حسب التسلسل ــ «حەریـــق» لنعرف ماهو اتجاهه التصوفي وطريقة فلسفته التصوفية ؟• فيقول :

**« ئینکاری سرایەت مەکە ئـــەی مونکری موفلس »**
**«بێ سەیری قەمەرکە،چ بە شەوق و بە«ضیایە»»»**

لا تأخذ طريقة الناكرين للسراية ؛ أي سريان اعمال اهـــل الحـــق الى المجاورين لهم ، كلما تقرّب المريد الى اولياء الله واحبائه اخذ منهم النسمات الطيبة والعطاءات الخيرة ، لانها تسري بلاشك الى المقربين والى المريدين •

لاتكن ناكرا لهذه السراية ، اما ترى ان القمر لو لم يكن مجاورا للشمس لم يكن له هذا الضوء الفضي ، ولم يكن له هذا الجمال الذي كان مضربا لامثال الشعراء المشببين والغزليين .

فهذا محتوى شعر واحد من مجموعة الاشعار العشرة الكردية المكتوبة مع شرحها في هذا العدد من القسم الكردي .



# دەرهەقا شۆڤێد

## «مـەم و زینـا» زارگۆتیێ و شۆڤا «مـەم و زینـا» ئەحمەدێ خانیێ (ژ نڤیسـارا «پەیڤەندییـا فۆلکلـۆر و لیتێراتـۆرا کوردیێ») .

**ئەندامی کارا : پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ**

گەلەک بەیت و داستانێد کوردیێ یێد هێژا و ب نرخ هەنـە . ژ وان بەیت و داستانان داستانا «مەم و زینێ» داستانا هـەرە هەواسـکارە ، دلرەڤینە و دلخوەشە . ل هەمۆ گۆشێد کوردستانێ ، ل هەمۆ جی و وارێد کورد تێدا دژین ، ناڤ و دەنگێ وێ داستانێ تێ بهیستن ، چـیرۆکبێژ و دەنگبێژ وێ ب دل و جـان ب زار گلیێ دکن ، دسـترێن ، یـان ژی ب کێفخوەشیێ و خوەشحالیێ ب ڤیسارا ئەحمەدێ خانیێ دخونن و دلێ خەلقێ پێ هەیجان دکن . لێ سەد حەیف و مخابن ، کو هەتا نکا کەسەکی دەست پێ نەکرییە هەمۆ شۆڤێد (شیڤەیێد) «مەم و زینـا» زارگۆتنێ ژ زارێـد چیرۆکبێژان و دەنگبێژان نە ڤیسینە ، کۆم نەکرنە ، ل بەرهەڤۆکەکێدا چاپ نەکرینە . بەشێ کوردناسییا ئینستیتوتا رۆهلاتناسییا لێنینگرادێ ژ زوڤا قرار کربو ، کو شۆڤێد «مەم و زینا» زارگۆتنێ کۆم بکن و چاپ بـکن ،

کو لێگەڕۆك (لێکۆلینەر)ێد بەیت و داستانێد کورد ل پاشەرۆژێ مژۆلی ڤەرساندن و بشکافتنا وان بین ل ناڤ چەند سالان خەباتکارێد پێشی کوردناسییا مە سێزدە شۆڤێد «مەم و زینا» زارگۆتنا نەتەوەیێ کۆم کرنە •

ئەو شۆڤ ئەڤن :

شۆڤا ژمارە (١) ل سالا ١٩٢٦ دا ل گوندێ گۆزەلدەرێ نەحییا ئاپارانێ کۆمارا ئەرمەنستانێ ب دەستێ ئەمینێ عەڤدال هاتییە ڤیساندنێ تێکستێ وێ ل سالا ١٩٣٦ دا ل ئێریڤانێ ل بەرهەڤۆکا «فۆلکلۆرا کورمانجادا چاپ بۆیە • مە ئەڤا شۆڤا ژ وێ کتێبێ هلچاندییە •

شۆڤا ژمارە (٢) ب دەستێ ئەلبێرت سۆسن هاتییە ڤیساندنێ و ل سالا ١٨٨٧ دا ل پێتێربورگێدا چاپ بۆیە • مە ئەڤا شۆڤا ژی ژ کتێبا (کوردیسچ سامملونگێن) هلچاندییە •

شۆڤا ژمارە (٣) ب دەستێ ئەلێکساندر ژابا ل ئەرزرۆمێ هاتییە ڤیساندنێ • ئەڤا شۆڤا نەخشێ ب زارگوتنا «مەم و زینا» ئەحمەدێ خانییە، ڤیسارا وێ شۆڤێ نکا ل ئارخیڤا ئینستیتوتا رۆهلاتناسییێ ل لێنینگرادێدایە •

شۆڤا ژمارە (٤) ل گوندێ کلیسێ نەحیا حەلەبێ (سۆریا) ب دەستێ جەعفەر ئاغا هاتییە ڤیساندنێ و ل بەرهەڤۆکا لێکۆك « کوردیسچ ـ تێکستدا» ل بێرلینێ سالا ١٩٠٣ چاپ بۆیە • مە ئەڤا شۆڤا ژی ژ وێ کتێبێ هلچاندییە •

شۆڤا ژمارە (٥) ب دەستێ هۆگۆ ماکاش ژ زارێ محەمەد ئەمینێ خەلقێ مێردینێ هاتییە ڤیساندنێ و ل سالا ١٩٢٦ دا ل لێنینگرادێدا چاپ

بۆیە • مە ئەڤا شۆڤا ژی ژ کتێبا هۆگۆ ماکاش « کوردیسچ ــ تێکســـت » هلچاندییـــە •

شۆڤا ژمارە (٦) ب دەستێ هارتمان هاتییە ڤیساندنێ • ئەو تێکست ب زارێ کورمانجێد نەحیا تورابدینێ هاتییە ڤیساندنێ ، دەستنڤیسارا وی تێکستی نکا ل ئارخیڤا ئینستیتوتا رۆهلاتناسییێدا ل لێنینگرادێدایە •

شۆڤا ژمارە (٧) ب دەستی مەکسیمێ خـــەمۆ ل ســـالا ١٩٦٣ دا ل لێنینگرادێدا ژ زارێ محەمەدێ سادقێ بامەڕنێ نەحیا بەهدینانـــا ئـــیراقێ هاتییە ڤیساندنێ • ئەڤا شۆڤا جارا ئەوەل تێ چاپکرنێ •

شۆڤا ژمارە (٨) ب دەستێ ئەرداشێ ئەمۆیێ عـــەرەب ژ گونـــدێ کارڤانسەرایێ نەحیا ئاپارانێ کۆمارا ئەرمەنستانێ هـــاتییە ڤیســـاندنێ • ئەرداشێ ئەمۆ نکا ل رۆستاڤلیدا دژی ، ئەڤی دەستنڤیسارا خوە ژ قەناتێ کوردۆڕا شاند کو ، چاپ بکە •

شۆڤا ژمارە (٩) ب دەستێ ئۆردیخانێ جەلیل هاتییە ڤیساندنێ ژ زارێ گوندییێ سیچانلۆیێ ، نەحیا تالینێ ، کۆمارا ئەرمەنستانێ •

شۆڤا ژمارە (١٠) ب دەستی مەکسێمی خەمـــۆ ژ زارێ حوســـەینێ عەلییێ خەمۆ ل گوندێ جیانمەزێ نەحیا ئاپارانێ کۆمـــارا ئەرمەنستـــانێ هاتیە ڤیساندنێ •

شۆڤا ژمارە (١١) ب دەستێ حاجییێ جندێ هـــاتییە ڤیســـاندنێ و ل بەرهەڤۆکا فۆلکلۆرا کورمانجادا ل سالا ١٩٣٦ دا ل ئێرێڤانێ چاپ بۆیە • مە ئەڤا شۆڤا ژ وێ کتێبێ هلچاندییە •

شۆڤا ژمارە (١٢) ب دەستی ئەمینێ عەڤدالێ ل گوندێ کارڤانسەرایێ

ل زارێ خدۆیێ قاسۆ هاتییە ڤیساندنێ ؛ گوندێ کارڤانسەرا سەر نەحییا ئاپارانێ بۆ ، نکا ل سەر نەحییا ئەرتیکێیە (کۆمارا ئەرمەنستانێ) • ئەڤـا شۆڤا ل سالا ١٩٣٦ دا ل بەرهەڤۆکا فۆلکلۆرا کورمانجادا هاتییە چاپکرنێ؛ مە ئەڤا شۆڤا ژ وێ کتێبێ هلچاندییە •

شۆڤا ژمارە (١٣) ب دەستێ ئۆسکارمان ل هەرێمـا ساوجبـلاخێ (مهابادا نها) هاتییە ڤیساندنێ و ل سالا ١٩٠٦ دا ل بێرلینێ ل بەرهەڤۆکا «کوردیسچ پێرسچ فۆرسکۆنگاندا» چاپ بۆیە • مە ئەڤا شۆڤا ژی ژ وێ کتێبێ هلچاندییە •

پارا کوردناسییا لێنینگرادێ ئەڤ هەمۆ سێزدە شۆڤێد «مەم و زینا» زارگۆتنێ ب ئەلفبایێ لاتینێ حازر کرییە بۆنا چاپکرنێ • ئەڤا گۆتارا من دەرهەڤا شۆڤێد «مەم و زینا» زارگۆتنێ و شۆڤا «مەم و زینا» ئەحمەدێ خانێ هاتییە ڤیساندنێ کو وێ ل بەرەڤۆکا وان شۆڤاندا چاپ بکن • لێ چاپکرنا وان دەرەنگ دکەڤە • سەبەب وێ یەکێ من قرار کر وێ گوتارا ل کۆڤارا کۆرا زانیارا کورددا چاپ بکم،چمکی نکا گەلەك زانیارێد کورد ب لێگەڕینا شۆڤێد «مەم و زینا» فۆلکلۆریڤا مژول دبـن ، دخـوەزن هەڤبەنـدێ و عەلەقەتییا وان شۆڤان ب «مەم و زینا» ئەحمەدێ خانێ ڤەرەسینن ، بشکڤینن یەکیتێ و جوداتییا وان و یا «مەم و زینا» ئەحمەدێ خانێ ڤاژێ و ئاشکەرا بکن • ئەز د ڤێ گوتارا خوەدا ب ڤان پرسەڤا مژول دبـم • ب فکرا مـن چاپکرنا وێ دێ سودمەند بە •

ژ وان سێزدە شۆڤێد ل ژۆرێ ناڤێ وان ڤیساندێ گەلەك شـۆڤ پێد کەڤنن پێد کو زوڤا هاتنە چاپکرنێ ، شۆڤێ ئالبێرت سۆسن ل پـاشی

نیڤی قورنا ١٩ چاپ بۆیە[١] ، یێد دن ل نیڤی قورنا بیستاندا چاپ بۆنـە • ئەو شۆڤ ئەڤن :

شۆڤێ مەم و زینا لێکۆك [٢] ، یێ مەم و زینا ئۆسکارمان [٣] ، یـێ مەم و زینا س• ئایکونی[٤] ، یێ مەم و زینا هۆگۆ ماکاش [٥] ، یێ مـەم و زینا ئەمینێ عەڤدال[٦] ، یێ مەم و زینا حاجیێ جندێ [٧] ، یێ مەم و زینـا ر• لێسکۆ[٨] ب مەعلومەتێ یێد فۆلکلۆرزانێ کورد حاجیێ جندێ ئـەم دکاران بێژن ، کو چەند شۆڤێد «مەم و زینێ» ژ زارێ ئەرمەنیان هاتنـە ڤیساندنێ ، ل زارێ وان ئەرمەنیان هاتنە ڤیساندنێ ، یێد کو بـەرێ شورشا ئاکتیابرێ جیرانێ کوردێد ئەرمەنستانا رۆئاڤا بۆن •

ئەو شۆڤ ئەڤن : شۆڤا ژ زارێ ژدێیان ڤیساندێ ، شۆڤا لالایـان

---

(١) A. Sosine, Kurdisch Sammlungen, SPT, 1887.

(٢) Lecok, Kurdisch text, Berlin, 1903.

(٣) Mann O. Kurdisch Persich Forschungen, Berlin, 1906.

(٤) Binete Eminskiy etnograficeskiy sbornik, Moskvavagarsapate, 190.

(٥) Hugo Makas, Kurdskiye tekstl, Leningrade, 1926.

(٦) Biner : Folklora kurmanca, Rewan, 1936 .

(٧) Haciye cindi, Mem u Zin, Erevan, 1956 (bizimane ermeni).

(٨) Rojet Lesko, Meme Alan, Beyrut, 1942 .

ژ زارێ ئەرمەنییێ گوندێ شەمشەدین ڤیساندێ بۆ و شۆڤا س. ئـایکونی ڤیساندێ . ب مەعلومەتیێد حاجییێ جنـدێ ئەم پێ دحەسـەن ، کو ل ئارخیڤا ئینستیتوتا لیتێراتورێ یا ب ناڤێ م. ئابێخیاندا چەند دەستنڤیسارێد «مەم و زینێ» هەنە . ئەو دەستنڤیسار ب زمانێ ئەرمەنێ و کوردێ هاتنە ڤیساندنێ .

ئەو دستنڤیسار ئەڤێد ژێرینن :

١ ــ تێکستێد ب زمانێ ئەرمەنێ و کوردێ ، یێد کو ل ناڤ سالێد ١٩٥٠ ــ ١٩٥٥ دا ب دەستی حاجییێ جندێ هاتبۆنە ڤیساندن .

٢ ــ تێکستێد ب زمانێ ئەرمەنێ ، یێد ب دەستی س. ئـایکونی ل سالا ١٩١٥ دا هاتبۆنە ڤیساندن . ل سالا ١٩٦٠ دا حاجییێ جندێ ب زمانێ ئەرمەنێ ئەڤ شاخێد «مەم و زین» چاپ کرن .

١ ــ شۆڤا خدۆیێ قاسۆ ، یێ کو ل سالا ١٩٢٧ دا ب دەستی ئەمینێ عەڤدال ل گوندێ کارڤانسەرایێ سەر نەحییا ئاپارانێ (ئەرمەنستانێ) هاتبۆ ڤیساندن . ئەڤا شاخا ل سالا ١٩٣٦ دا ل ئێرێڤانێ چاپ بۆبۆ .

٢ ــ شۆڤا ئەتارێ شەرۆ ، یێ کو ئەوی ب خوە ڤیسیبـۆ و دابـۆ حاجییێ جندێ . ئەتارێ شەرۆ ژ گوندێ داماسخانێ سەر نەحییا سورمەلییێ (رۆمێ) بۆ . ئەڤا شاخا ژی ل سالا ١٩٢٦ ل مۆسکڤایێ ب تەرجما رۆسێ هاتبۆ چاپکرن .

٣ ــ شۆڤا ئیسۆیێ خدۆ ژ گوندێ جەرجەریسێ سەر نەحییا ئاپارانێ (ئەرمەنستانێ)ئەو تێکست ژی ل سالا ١٩٦٤ دا ب دەستی حاجییێ جندێ هاتبۆ ڤیساندن .

٤ ــ شوّڤا ئارمەناکێ ئاگوّبیان ژ گونـدێ روّستەمەگێتون سـەر نەحیيا مێلاشکێرێ (روّمێ) • ئەڤا تێکستا ژی ل سالا ١٩٤٧ دا ب دەستی حاجییێ جندێ ل گوندێ زوّراگێنح سەر نەحیيا ئێرتیکێ (ئەرمەنستانێ) هاتبوّ ڤیساندن •

٥ ــ شوّڤا س• ئایکونی ، کو ل سالا ١٩١٥ دا ل گوندێ ڤاردنیسێ سەر نەحیيا موّشێ (روّمێ) هاتبوّ ڤیساندن •

دوّ شوّڤێد «مەم و زین» ب زمانێ روّسێ هاتنە چاپکرن • شـاخەك ب تەرجما ڤ • ل ڤیلچێڤیسکی هاتیە چاپکرن [٩] ، یەك ژی ب تەرجما م • رودینکوّ چاپ بوّیە [١٠] ل سالا ١٩٤٢ دا ر• لێسکوّ شوّڤەکی «مەم و زین» ب سەرناڤێ «مەمێ ئالان» ب تەرجما فرانسزێ ل بێروّتێ چاپکر • ئـاوا ئەم پێ دحەسن ، کو شوّڤێد «مەم و زین» ب زمانێ ئەرمـەنێ ، ئەلمـانێ ، کوردێ ، روّسێ و فرانسزێ هاتنە چاپکرن • ئەو شوّڤ گیشك ل جـورە ــ جورە جییان و هەر شوّڤەك وەختەکیدا چاپ نەبوّنە • پرّانییـا وان ب سەرناڤێ «مەم و زین» ئەشکەرانە و هەر چەند شوّڤ ب سەر ناڤێ «مەم و زینێ» ، «مەمێ ئالان» ، «سوّبەتا مەم و زین» ، «حیکیاتـا مەم و زیـن» عەیـانن •

ئەڤا گشك نیشان دکە ، کو داستانا «مەم و زین» گەلەك عەیانە و ل ناڤ خەلقێ کورددا ب ناڤدارە ، کو ل هەموّ جیوارێ کوردستانێدا قسـە دکن ، دسترێن ، کو ئەو ل ناڤ خەلقێ ئەرمەنییاندا ژی بەلاڤ بوّیە ، کو

(٩) بنێرّە سکازکی نارّوّدوّڤ ڤوّستوّکا ، موّسکڤا ــ لێنینگراد ، ١٩٣٨ •

(١٠) بنێرّە کوردسکییێ ئێپیچێسکییێ •

ئەرمەنی ژی وێ حەز دکن • لێ سەد جار مخابن ، کو هەتا نکا بەرهەڤۆکەکە وێ داستانێ نەهاتییە چاپکرن •

هەر ب تەنێ ل سالا ۱۹۵٦دا حاجییێ جندێ ب زمانێ ئەرمەنی چەند شۆڤێد وێ چاپکرن • ل بەرهەڤۆکا خوەدا حاجییێ جندێ پێنج شۆڤێد «مەم و زین» ب پێشگۆتنا خوەڤا چاپکرنە • ئەو ل پێشگۆتنێدا کورت دەرهەقا کۆمکرن و ڤیساندنا شۆڤێد وێ داستانێ گلی دکە و وسان ژی گلی دکە ، کو ل ئینستیتۆتا لیتێراتورێدا یا ب ناڤێ م• ئابێخیاندا چەند دستنڤیسارێ شۆڤێد «مەم و زینێ» هەنە • ئەو دڤیسە ، کو ئەو شۆڤ ژ زارێ ئەرمەنیێد نەحیێد ئەرمەنستانا رۆئاڤا هاتنە ڤیساندن •

ب ڤێ چاپکرنێڤا حاجییێ جندێ خوەستبۆ جمعەتا ئەرمەنییان بکە ناسێ کەلەپۆرێ ملەتێ کورد ، کو ئەو هاژ ب فۆلکلۆرا کوردێ هەواسکار بن • ل ڤیسارا خوەدا حاجێ جندێ «مەم و زین» ، «کەر و کولک» ، «خەجێ و سیابەند» حەساب دکە داستانێد کوردێ هەرە ئینتێرێس و هەواسکارە •

ل سالا ۱۹۵۰دا ئەدەبیاتناسێد کوردێ سیرێ تێکستەکی « مەم و زین» یێد ل هەڤ ئانین چاپکرن • وانا جورەجورە شۆڤ گهاندییە هەڤ ، ل هەڤ ئانینە هۆناندنێ ، ب جورە ــ جورە ڤیسینە ، هەر ب تەنێ جییێد ستران و شێرگۆتێ ڤیسینە و ب ڤێ جورەیێ کرنە شۆڤەکی لەڤی شۆڤیدا قەوماندن و رەنگ و رویێ قەرماێد داستانێ ب یەکۆ ــ یەکۆ ، قەشەنگ و رند هاتنە تراندن ، ئەڤا شۆڤا ژ شۆڤێ دن یێد بەرێ چاپکرێ گەلەك باشتر و رندترە • ئە ژ وان جوداتر دبە ، بەرێ ئەوەل تێدا مەم تێ بەر چاڤان مینا (وەك) پادشایێ کوردان ، کو ئەو ژ شەهەرێ ئیمێنییە • ل شۆڤێد

چاپکریدا و وسان لە شۆڤێـــد بەر دەســـتێ مـــەدا مـــەم کوڕێ پـــادشێ موغورزەمینە • خێن ژ وێ ل شۆڤێ لهەڤانیندا ناڤێ هەسپێ مەمێ نە بۆرە ، ناڤێ وی «بۆزێ رەوانە» • ل شۆڤێد هەژمار (٢) و (٣)دا ، یێد کو ئەم ل وێ بەرڤۆکێدا چاپ دکن ، ناڤێ بۆری مەمێ ب ڤی جۆرەیـــە ـــ ، ژێـــڕا دبێژن «بۆرێ رەوان» •داستانا «مەم و زین» داستانەکە رۆمانی هەوەسدار و ئینترێسە ، تێدا دەرهەقا ئەڤینێ‌یێ ، دۆستی‌یێ و قەرەمانی‌یێ تێ قسەکرن • ل پڕانییا شۆڤاندا شوغول ل ناڤ زەمانێ دەرەبەگی‌یێدا دقەومـــە • کێم و زیدە شۆڤێد فۆلکلۆرێ ، یێد ئەدەبیاتی‌یێ کەتنە ناڤ وی داستانێ • لازمە ناڤەرۆکا وێ یا بەرپێشن ستروکتورا وێ و کیرتسکا وی بەرپا بکن ، بۆنا وێ یێ یەکێ پێویستە هەمۆ شۆڤێد وێ بەرامبەری هەڤ بکن و پەرچێـــد ئەفسانەیی‌یێ ژێ دەرخن وســـان ژی پێویستە هەمـــۆ شـــۆڤێد مەم و زینا «فۆلکلۆرێ» و ڤیسارا ئەحمەدێ خانێ مەم و زین هەمبەری هەڤ بکن • بۆنا مییە سەرکرنا ڤێ پرسێ پرس هـــاتە بەر مە ، کو گەلـــەك شـــۆڤێد فۆلکلۆری یێد «مەم و زین» کۆم بکن و ل بەرهەڤۆکێکدا چاپ بـــکن • لێ پرسا گران نەك ب تەنێ ل ڤێدا بۆ • پرسا گران ئەو بۆ ، کو شۆڤێـــد داستانا «مەم و زین» ب جورە جورێ ئەلیفبا هاتنە چاپکرن و ڤیساندن و هنەك شۆڤێد وێ نکا دەست ناکەڤن • مەسەلە ، شۆڤێد ا• سۆسن (١٨٨٧)، لێکۆك (١٩٠٣) ، ج• ماکاش (١٩٢٦) ، ب ئەلیفبایێ ئەلمانێ هاتنە چاپکرن ، شۆڤێد ئەمینێ عەڤدال ، حاجێ جندێ ب ئەلیفبـــایێ کوردێ ـــ لاتینێ یێ سالا ١٩٢٨ هاتنە چاپکرن ، شۆڤێد مان ئۆ • (١٩٠٦) ، هارتمان و ژابـــا (دەستنڤیسار ب حەرفێد عەرەبینە ، بنێڕە ئارخیڤا ئینستیتوتا ڤۆستۆکۆدێنییا لێنینگرادێ ) ب ئەلیفبایێ عەرەبێ ڤیسینە ، شـــۆڤێد ئارداشـــێ عـــەمۆ ، ئۆردیخانێ جەلیل و ماکسیمێ خەمۆ ب ئەلیفبایێ بەدرخان هاتنە ڤیساندن •

یەکێ ژی سیستەما ترانسکریپسییا وان و تەرتیبا ڤیسارا وان ژ هەڤ جودایە • پارا (بەشی) کوردناستییێ وسان حەساب پێڕا دیت ، کو وان تێکستان ب جورەکی ب حەرفێد لاتینیێ ییێد بەدرخان بنڤیسن و چاپ بکن ، چمکی نکا ل کوردناستیییێدا ڤان حەرفان ددن خەبتاندنێ •

چاپکرنا شۆڤێد داستانا «مەم و زینێ» ــ ڤا چار و مکان دکەڤنە دەستێ عولومدار و زانرێد کوردناس کو ل پاشێ کۆر و دۆر ل هەمو شۆڤاڤا مژۆل بین ، ڤەرەسینن ، لێ بگەڕن و نیشان بکن قەدر و قیمەتێ وان ل ئالییێ ئەدەبیاتێ ، فۆلکلۆر و ئێتنۆگرییا ملەتێ کورددا •

ئەڤ شۆڤێد «مەم و زین» ییێد کو ئەم چاپ دکن ، ب تەرتیبا خوەڤا ، ب گلیکرنا خوەڤا ، ب تراندنا خەیسەتێ قەرەمانێ خوەڤا ، ب قسەکرنا قەوماندنێ داستاناڤا ژ هەڤ جوداترن ؛ هنەك شۆڤ ب شێری تێن گۆتن ، هنەك ژی ب پەخشان (مینا چیرۆك و سەرهاتێ) تێن گۆتن ، هنەك ژ وان ب جورە جورە زاراڤێ کورمانجێ و سۆرانێ هاتنە ڤیساندن •

ل ڤان شۆڤێد ، کو ئەم چاپ دکن ، قەرەمانێ برنجێ مەم و زین ، ل واندا مەم تێ بەر چاڤان مینا (وەك) مێرەکی جامێر ، مینا تریستان ئەو ل زینا خوە دگەڕە ، دچە وەلاتێ دۆر نەناس • رندێ و قەشەنگییا مەمێ ، هش و قەواتا وی ، جامێرێ ، لیستیما وی ب ساتیرتۆیێ و شەڕێ وی ب قەرەتاژدینڕا ب ڤاچاخێ مالێ برێڕا مە عەجەبمایێ دکن و ئەم ب دل و جان وی حز دکن ، ل وی دبێژن • ل شۆڤێ هەژمارا ١٣ دا دبێژن ، کو مەم کوڕێ ئیبراهیم پاشایێ وەلاتێ یەمەنێ بو ، ل شۆڤێ هەژمارا ١١ دا دبێژن ، کو ئەو کوڕێ پاشایێ وەلاتێ موغورزەمین بو ، ل شۆڤێد دنا دبێژن ، کو ئەو کوڕێ ئال ــ پاشا بو ، یان ژی کوڕێ میرێ ئالان بو • ئال ــ پاشا و

میرێ ئالان کینە ، ئەو کی بو ، ئەم نزانن ، داستانێدا شرو ناکن • ل داستانا هەژمارا چاراندا دبێژن ، کو مەم کوڕێ زولێخا خوشکێ شێخێ کوریشەیتا و کوڕێ شیرن ئالمان بو • ل داستانا هەژمارا ١١ دا گلی دکن کو مەم ب جورەکی عەجێب بویە ــ ل کەنارێ بەحرێ ل کێلەکا شەهەرێ موغورزەمین تێزیکی زیارەتەکە ب ناڤێ ئارداڤا قیزەك دما • ئەو قیز دبینە ، کو ل سەر بەحرێ سوار تێن ، ئەو ژ وان پرس دکە : «هون کینە ؟ » • ئەو بەرسڤا وێ ددن ، دبێژن : «ئەم مزگینبرێ ئەڤینیا بەختەوارینە» • کەچك دبێژە : « ئەگەر وسانە ، ئەزێ ب وەڕا بێم » • ئەو وێ کەچکێ ب خوەڕا دبن و سەر بەحرێڕا دچن • کەچك دخوەزە ئاڤێ ڤەخوە • ئەو ئاڤێ ڤەدخوە و ژ کێفا بەحرێ دوهالا دبە • سوار ڤەدەگڕن و کەچکێ تینن جیێ وێ • وەختەك دەرباس دبە ، ئەو پێ دحەسە ، کو ئەو دوهالایە • پاشێ نەھ مەھ دەرباس دبن و کوڕەك ژێڕا دبە ، کوڕەکی ب رەنگێ رۆژێ • کەچك ژ شەرما خوە ، ژ بوخدانیا خەلقێ دترسە ، کوڕێ خوە دپێچە ، دبە ل کەنارێ بەحرێ دهێلە • ئال ــ پاش بێ زورەت بو ، ئەو ل کەنارێ بەحرێ دگەڕە ، پێچەکا کوڕ دبینە ، دبە و کوڕك دکە کوڕێ خوە و ناڤێ وی داتینە مەم • ل شوڤێ هەژمارا سیسیباندا دبێژن : مەم کوڕێ هەسنگەر بو ، ل شوڤێ هەژمارا چاراندا دبێژن کو مەم شەڤ و رۆژ گر دبو ، مەزن دبو مینا قەرەمانان • ل شوڤێ هەژمارا سێزداندا دبێژن ، کو مەم ل پێشییێ تەعلیم و تەربییەتا خوە ل جەم داییێ دستاند ، پاشێ ل جەم لەلە جورەجورە عولم هین بویە ، ئەو هینی سوارییێ ، تیراڤێژییێ دکرن ، ل زاروتییا خوەدا ئەوی کتیبێد زەبور ، ئینجیل ، تەورات و ڤیسارێد ئیبن سینا خوەندبون •

ب شوڤێد هەژمارێو ١ ، ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٧ ، ٨ ، ١٠ ، ١١ ، ١٢دا زین خوشکا میرزەینەدینە ، حاکمێ جزیرا بوتانە ، یان ژی حاکمێ وەلاتێ

بۆتانە ، ب شۆڤێد هەژمارێــد ٦ ، ١٣ دا ئەو قیــزا میرسێڤدینــە برایێ زەینەدینە • ب رندێ ، دلساخێ و حزکرنا سادقی ئەو ژ مەمێ کێمتر نینە ، ئەو ب ئاقل و فەراسەتە ، بێ ترس و بێ خۆفە ، ل کرنێ خوەدا مینا مێران تێ بەر چاڤان •ئەو باوەڕ دکە ، کو فەلەکا وێ ژ دەستی خوەدێ هاتییــە بڕینێ ، لەما ژی ئەو دەستێ خوە ژ دەرگیستییێ خوە چەکان دکشینــە و مەمێ حەز دکە • زین وسان ژی خشیمە ، راستگۆیە و باوەڕییــا خوە ل مەرییان تینە ، هەرگاڤ گوڕا بەکرێ ئەوانێ شەیتان دکە ، ترێ ئەو مەرڤەکی راستگۆ و خێر خوەزە و سەبەب وێ یەکێ دکەڤە دفکا وی •

ل داستانا «مەم و زیندا» پاشییێ تێ بەر چاڤان ، کو مەم و زیــن ل حالی خوەدا ، ل ئەسلا خوەدا وەك هەڤن ، لێ ب راســتێ ئەم پــاشێ پێ دحەسن ، کو ئەو نە وسانە • داستانێدا دبێژن ، کو مەم کوڕێ پادشــایێ موغورزەمینە ، زین ژی قسا پادشایێ جزیرا بۆتانە ، لێ پــاشێ ئەم پــێ دحەسن ، کو مەم دەردکەڤە مێرەکی خــەریب ، بێ کەس و بێ خــودان • وەختێ کو میرزەینەدین پێ دحەسە ، کو مەم خوشکا وی زین حەز دکە ، ئەو ژێڕا دبێژە : « خەریبۆ ، بێ کەسۆ ، تو کییی ، کو زینێ حەز بکی ؟ »• میرزەینەدین ئەمر دکە سەر خولامێد خوە مەمێ بدنە بەر خەنجەران • یەکێ ژی میرزەینەدین بەرێ مەمێ کر بۆ ساقییێ دیوانا خوە ، کر بۆ سەردیوان • ئەگەر میرزەینەدین مەمێ حساب بکرا کوڕێ حاکمان ئەوی ئەو شــوختول نە دسپارتە وی و وسان ژێڕا نەگۆتا : «خەریبێ بێ کەس و بێ خودان» • ( بنێڕە شاخێد هەژمارا ١٠ ، ١١ ، ١٣ ) •

قەرەمانێد داستانێ یێد دەرەجا دوەمین تێن حەسابکرن میر زەینەدین و بەکرێ ئەوان • ل پــاشی مەم و زینێ ئەو جیێ ئەول دگرن و داستــانێدا

میرزەینەدین تێ بەر چاڤان چاوان (وەك) حاكمەكی نەلایق و سست ، ئـەو سەروەری ل شەهەرێ جزیرا بۆتان ب تەمی و وەسیەتێد گرەگرێد خـوە دكە ، ب گۆتنا بەكرێ ئەوان دژی ، رادبە و رۆدنێ • ل داستانێدا دەرهەڤا بەكرێ ئەوان تێ گۆتن ، كو ئەو مەرڤەكی دەخەس ، فێلباز ، خێرنەخوەز و فەساد بۆ (بنێرە شاخێد هەژمارێد ٣ ، ٤ ، ١٣ و یێد دن ) • ل داستانێـدا تێ گلیكرن ، كو ئەو بەكرێ ئەوان ناهێلە مەم و زین میرازێ خوە شاد بین، چمكی خوشكا وی زین مەمێ حزكربۆ و ژ دەردێ ئەڤینییا خوە مربۆ ، یان ژی ئەوی ب خوە زینا خوشكا میرزەینەدین حەزكربۆ ، وسـان ژی گلی دكن ، كو بەكرێ ئەوان ئەو مەرڤەكی فەساد و شەیتان بۆ لەما نەدهشـت مەم و زین بەختەوار بن • ل داستانێدا قەرەمانێد «مەم و زین» تێ حەسابكرن سێ برا قەرەتاژدین ، چەكۆ و ئەرفان ؛ ل هەمۆ شۆڤاندا قەرەتاژدین ( ناڤێ وی ل شۆڤا چاراندا تێ گۆتن هەسۆ ، یان حەسەن ، ل شۆڤێد دندا تێ گوتن تاژدین ) ، چەكان و ئەرفان جیێ فەرز و موهیم دگرن • ئەو قولخییا مـیر زەینەدین دكن ، ل هنەك شۆڤاندا ئەوان حەساب دكن پسمامێد میرزەینەدین ، ئەو پشتیوانێد حوكومەت و دەولەتا میرێ جزیرا بۆتان بۆن ؛ ب سەركارییا وان ئەسكەر دچە پێشبییا ئەسكەرێ دژمن ، وەلاتێ جزیرا بۆتان پاوان دكن ، ئەو مێرنە جامێر فێرز و قەرەمانن ، خودییێ گۆتنا خوەنە ، بۆنا دەستەبراكێ خوە مەمێ حازرن هەمۆ تشتی بكن ، مەمێ حەز دكن • ل ناڤ هەر سـێ براندا قەرەتاژدین برێ وان مەزنە ، ئەو مێرخاسێ مێرخاسانە ، مێرەكێ بـێ ترسە ، مێوانحەزە ، حەیفگرە ، پێشبینە ، ب ئاقل و جێربانديیە ، ناهێلە ل ناڤ وی چەكان ، ئەرفان و مەمێ خراب ببە ، شەڕ بقەومە •

ل داستانێدا ستییا ژنا قەرەتاژدین جیكی لایق دگرە ، ئەو مێرێ خوە حەز دكە ل گورا ویدانە و وەختێ قەرەتاژدین دبێژە ئاگر بەردە خانی ، ئـەو

دەنگێ خوە ناکە ، وسان ژی گەلە شاد دبە ، چـاخێ مەمێ تێ مـالا وان مێڤان ، ئەو وی ب دل و جان قەبوول دکە چاوان مێڤانەکی عەزیز • ڤەرسانـا داستانـا « مەم و زینێ » ب قسـەکرنا تشتێد ئەفسـانە تێ گلیکرن ، تێدا تێ قسەکرن ، کو سێ کەڤۆك ، یان ژی سێ پەری ( شۆڤێد هەژمارا ١ ، ٤ ، ١١ ، ١٢ ) یان ژی دۆ ملیاکەت ( شۆڤێد هەژمارا چاران ) ل سـەر بـانێ خانی دادیتن و ب هەڤڕا خەبەر ددن ، یەك ژ یەکێ پرس دکە : کێ ل دونیایێدا رند و قەشەنگە ؟خوشکا مەزن دبێژە : « ژ مەم و زینێ رنـدتر ، شـۆخ و شەنگتر ل دونیایێدا نەدیتییە » • ئەو بڕیـارێ خوە دکن یـەك ، کو وان بگهینە هەڤ • کەڤۆك یان ژی پەری دوعا دکن ، کو ژ ئەزمان پۆستێ وان بێ خوارێ • بە ئەمرێ خوەدێ پۆستێ وان تێ خوارێ ، زین دکەڤە قلخێ وان و ب تەڤای دفڕن ، دچنە شەهەرێ جزیرا بۆتان ، ئەو زینێ دکنە نـاڤ ڤنینێ مەمێ و پاشدا دفڕن • زین ژ خەوە هشیـار دبە ، ل تەنیشـتا خوەدا خۆرتەکی دبینە ، هێرس دبە ، دبێژە : «لۆلۆ ، ئیزنا تە دا ، کو تو هاتی کەتی ناڤ ڤنینێ من ، تشتێ بێ نامۆس بکی ؟ » هەر یەك ژ وان ناڤ و نیشاێـد خوە ، یێ مالباڤێ خوە ، وەلاتێ خوە ، شەهەر و کۆشك و سەرایێدا باڤـێ خوە دبێژە ، دەرهەڤا خولام و خزمەتکارێد مـالباڤێ خوە دبێژن • چـاخێ شەمدانێ هلددن ، بزانبن ئەو ل کیدەرێنە ، پێ دحەسن ، کو مەم نەهاتییـە جەم زینێ ، زینێ هاتییە جەم مەمێ زینێ دبێژە : « یێ ئەز ئانیمە ، وێ مـن بین ژی ، ئە ڤا ژ کرنا خوەدێیە » • ئەو هەڤ حەز دکن ، دبێژن خوەدێ ئەم گهاندنە هەڤ و گوستیلا خوە پەڤ دگوهێڕن • ل شۆڤێد دۆ و هەشتـدا تێ گۆتن ، کو پاشی هەڤ شاد بوونێ هەڤ راموسـانێ مەمێ شتورێ خـوە داتینە ناڤ خوە و زینێ ، کو ژ سنتورێ عەدەت دەرنەکەڤە • ل شۆڤێد دنادا تێ قسەکرنێ ، کو ئەم خوەڕا دکەڤنە کێفێ و خوەڕا دچن • کەڤۆك یـان

ژی پەرێ دفڕن ، تێن زینێ دبنه کۆشکا باڤێ وێ • ســبێ مەمێ درەنــگ رادبه ، باڤێ وی هێڤیــا وییه ، کو بێ دیوانێ ، لێ ئەو نــایێ • خولامــان دشینه پەی وی • پێ دحەسن ، کو ئەو نەخوەشــه • گرەگر ، وەزیــر و وەکیلان تینن ، کو بزانبن نەخوەشییا مەمێ چیه • ل شۆڤێد دۆ و شەشــدا مەمێ ب خوە دبێژە باڤێ خوە چیە سەبەبا نەخۆشییا وی ، ئەو گوستیلا زینێ نیشانی وی دکه ، ل سەر گوستیلێ ڤقیسی بۆ : « خــاتوون زین ، خوشــکا میرزەینەدینێ حاکمێ جزیرا بۆتان » باڤ دبێژە ئەو ئزانه جزیرا بۆتان ل کو دمینه • ل شۆڤێد دندا زانا و و گرەگر پێ دحەســەن ، کو مەمێ ژ دەردێ ئەڤینێ نەخوەشه ( بنێڕە ٦ ، ٩ ، ١٠ ، ١١ ، ١٣ ) و ب تەمی و وەسیەتا وان میرزەینەدین ل ناڤ باخدا دکه گەڕ و سەیرانا خۆرت و قیز و بۆکان ، ئەمر دکه ، کو گشك بێنه سەیرانێ ( بنێڕە ٦ ، ٨ ، ٩ ، ١٠ ، ١١ ، ١٢ ) •

میرێ موغورزەمین دفکره ، کو دبه ژ ناڤ قیز و بۆکان مەمێ ژ خوەڕا یەکێ ببژێرە •

مەمێ قیز و بۆکێد گرەگرێ شەهەر ، هەتا قیزێد مەرڤێد بەلەنگاز خوە دخەملینن ، تێنه ناڤ باخ ، کلما و سترانێ ل بەر مەمێڕا داڤێژن ، هەر یــەك پەسنێ خوە ددە ، لێ مەمێ گوهـ نادە وان ، قەت یەکێ حەز ناکه ، دبێــژە : « حەزکرا من خاتوون زینه ، خوشکا میرزەینەدینه ، ل جزیرا بۆتان دمینه » • مەم کارێ خوە دکه رێکەڤە، هەڕە جزیرا بۆتان ( بنێڕە شاخێد ٦ ، ٧ ، ٨ ، ٩ ، ١٠ ، ١١، ١٢)• ل تەولێ ژ ناڤ گەلەك هەسپان ئەو هەسپەکی ژاری ـــ ژارکۆك دبژێرە ، دبێژە سەیس رند خوەیێ بکه • ژ خزنا باڤێ خوە گەلــه زێڕان دەردخه ، زین و بوساتێ جەواهر ددە سەر هۆستا ، هەسپێ خوە سوار دبه و دچه • ناڤێ هەسپێ وی بۆر بۆ ، بۆرێ وی زەردار بۆ ، ژێڕا هەڤــال

بۆ ، هەر گاف ئەو ژ چەتینییێ دەردخست ، نەهێلا خوشکا بەکرێ ئـەوان مەمێ ژ رێ داگەڕینە و راست مەمێ دبە بەر دەرێ قەرەتاژدین • ل شـۆڤێ چاراندا ناڤێ بۆرێ مەمێ «بۆزێ رەوانە» ، دبێژن مەسیگرا ئەو ژ بەحرێ دەرخستبۆ • ل شۆڤێد ٢ ، ٤ ، ٦ دا قسە دکن ، کو باڤێ مەمێ ئەسکەر ب مەمێڕا دشینە ، لێ ل شۆڤێ هەژمارا یەکدا ئەو گرەگرا پێڕا دشینە ، لێ مەم وان ڤەدگەڕینە ، هەر ب خوەڕا خولامێ خوە بانگین دبە • ل شاخێد ٨ ، ٩ ، ١٠ ، ١١ ، ١٢ دا ناڤێ خولامێ وی چاویش بادینە ، یان ژی گرگینە •

ل شۆڤێد ٧ ، ٨ ، ٩ ، ١٠ ، ١١ ، ١٢ دا باڤێ مەمێ پێ دحەسە ، کـو دخوەزە هەڕە جزیرا بۆتان ، ئەو ئەمر دکە سەر خولامان دەرگێ شـەهەر داخن ، لنگێ بۆرێ مەمێ قەید و چیدار بکن ، کو مەمێ نکاربـە هـەڕە ، چمکی ئەو ژ خوەڕا دبێژە « ئەزم کوڕەکە ، ئەو هەڕە ، ئەزێ ژ کێڕا مـال میراتێ و دەولەتێ بهێلم ؟ » لێ مەم بۆرێ خوە ژ تەولێ دەردخە ، لێ سوار دبە ، بۆر سەر سوڕێڕا دفڕە و مەم داژۆ ، ب خوە ئەو نزانە کۆدا هەڕە ، بۆر کۆدا دچە ، ئەو وێدا ژی داژۆ • ل شۆڤێ هەژمارا ٢ ــ دا رێیا جزیرا بۆتان شەش مەه دکشینە ، ل شۆڤێ هەژمارا ١٣ ــ دا ژ وەلاتێ یەمەنێ هەتا جزیرا بۆتان دوانزدەه مەه و بیست و چار شەڤ و رۆژ دکشینە ، ل شۆڤێ شەشاندا تێ گۆتن ، کو خدر نەبێ (خدر ئەلیاس) مەمێ و بۆرێ ویڤا دبە جزیرا بۆتان •

ل شاخێد ١ ، ٧ ، ٨ ، ٩ ــ دا بۆر دبێژە : « لۆ مەمێ سەوداسەر ، ئەڤا حەفت شەو و رۆژن تو من داژۆیی ، تو نزانی قەید و چیدارا گۆشتێ لنگێ من خوەرن ، گهیشتنە هەستێ ، ژ من پەیا بە ، قەید و چیداران ڤەکە » • مەم ژ بۆر پەیا دبە ، دبینە : قەید و چیداران گۆشت خوەرنە ، گهیشتنە هەستێ • مەم دگری • بۆر دبێژە : « مەگری ، لنگێ من بپێچە ، من بەردە بەر چایر و

چیمانان ، ئەز بچێرم ،ئەزێ تە ببم جزیرا بۆتان » • مەم لنگێ بۆر دپێچە ، بەر ددە چێرە • وەختەك دەرباس دبە ، لنگێ بۆر قەنج دبن ، مەم لێ ســوار دبە و داژۆ •

ل رێدا مەم دبینە ، کو سێ سواران دایە پەی (دۆ ، قاچاخان ، کو تالاّن ژێ بستینن (شۆڤێ هەژمارا ٨ ) • مەم رێــا قاچاخــان دگرە ، تــالاّن ژێ دستینە و ددە وان سواران • تو نابێژی هەر سێ سوار قەرەتاژدین، چەکان و ئەرفان بۆنە ، ژ شەهەرێ جزیرا بۆتان بۆنە • پاشێ مەم دچە مالا وان مێڤان، ئەو وی دکنە دەستەبراکێ خوە • ل شۆڤێد ١ ، ٨ ، ٩ ، ١١ ، ١٢ ـــ دا مەم راستی نێچیرڤانەکی تێ ، دبینە ئەو نێچیرڤانی دایە پەی کارا خەزالێ ، نکارە بگرە • مەم کارا خەزالێ دگرە • پاشێ عەیان دبــە ، کو ئــەو نێچیرڤــان قەرەتاژدین بۆیە • ئەو دبێژە مەمێ : « تو خوەیێ چەند سەران بویی ، کو تو نێچیرا من گرت ، نەهیشت ئەز نێچیرا خوە بگرم » • مەم و قەرەتاژدین شەڕ دکن، مەم ئەوی ژ هەسپێ تینە خوارێ ، داڤێژە عەردێ و دبێژە : «حەیران ، ئەز نە مێرکوژم ، نە قاچاخم ، کارا خەزالێ نە لازمی منە ، ژ خوەڕا ببن » • مەم و قەرەتاژدین دبنە دەستەبراکێ هەڤ و خاترێ خوە ژ هەڤ دخوەزن • مەم رێیا خوەدا داژۆ ، دچە • ل بەر چەم نێزیکی پرایێ ئەو راستی قیزەکێ تێ ، ل شۆڤێد ١ ، ٢ ، ٤ ، ٧ ، ٨ ، ١٢ ـــ دا تێ گۆتن ،کو ئەو خوشــکا بەکرێ ئەوان بۆ ، ل شۆڤێد ٥ ، ٦ ـــ دا دبێژن ئەو قیزا وی بۆ ، ناڤێ وێ مەلیك رەیحان بۆ ، ئەو جارییا زینا خوشکا میرزەینەدین بۆ • تێ گۆتن ، کو ئەو رەملدار بۆ ، رەملێ داڤێژە ، پێ دحەسە ، کو مــەم بۆنــا خوشــکا میرزەینەدین ، بۆنا زینێ تێ جزیرا بۆتان • ئەو تێ پێشییا مەمێ ، کو مەمێ وێ بستینە • ئەو کلام و سترانێ داڤێژە سەر خوە و مەمێ ، کو وی حــەز دکە ، کو بۆنا وی هاتییە بەر پرێ و هێڤییا وی مایە ( شاخێ هەژمارا ١١ )

ئەڤا چل شەڤە و چل رۆژن هێڤیدارا وییە • مەم دبینە ، کو ئەو نە رندە ، رەشە من عەرەبا رەش و دفکرە ، ژ خوەڕا دبێژە : گەلۆ ئەڤا ئەو زینە ، یا کو من ب وێڕا گوستێل گوهاست ، ئەو دبێژە وێ : « گوستیلا من دا تە ، نیشان من بکە » • زینا خوشکا بەکرێ ئەوان دبێژە : «ئەز هاژ سەرێ خوە نینم ، ئەز کەڕ و گێژ هێڤیا تە بوم ، کەتمە ئاڤێ ، گوستیلا من ژ تلییا پەکیا و کەتە ئاڤێ ، ئاڤێ رۆدا بر » • بۆرێ مەمێ دبێژە ، کو مەمێ دۆدل دبە ، دبێژە : « مەمێ ، گوهـ مەدە وێ ، ئەو دەك و دۆلاڤ و فێلبازە ، خوشکا بەکرێ ئەواتە ، ئەوێ گەلەك مێر خاپاندنە ، ژ رێیا وان خالفاندنە ، تو من باژۆ ، ئەزێ تە ببم جزیرا بۆتان » • زینا خوشکا بەکرێ ئەوان دبێژە ، کو مەمێ باوەڕ کر ، کو ئەو نە زینا خوشکا میرزەینەدینە ، دبێژە وی : تو کو زەوجی ، تە زین ستاند تویێ من بکی جارییا وێ ؟ » مەم دبێژە : «برا بە» ، و داژۆ ، دچە جزیرا بۆتان •

ژ زارێ زینا خوشکا بەکرێ ئەوان ( شۆڤێد ١ ، ٦ ، ٨ ، ٩ ،) و جۆتکار یان ژی ژ زارێ پیرەمەرەکی ( شاخێد هەژمارا ١٠ ، ١١ ، ١٢ ، ١٣ ) تێ عەیانکرن شەهەرێ جزیرا بۆتان چ شەهەرە ، راستا وی چ راستە • ئەو دبێژن : « شەهەرێ جزیرا بۆتان شەهەرێ ئاغا ، بەگان و میرانە ، چاخێ رۆ دچە ئاڤا ، کەس کەسی نابە خودانە ، ئەگەر تو دخوەزی هەڕی مێڤانی مالا ماقول ، جامێران ، هەڕە مالا میرزەینەدین ، ئەگەر دخوەزی هەڕی مالا جامێر ، خێرخوەز و قەرەمانان ، هەڕە مالا قەرەتاژدین ، چەکۆ و ئەرفانە ، لێ ئەگەر دخوەزی هەڕی مالا موفسید و خێرنەخوەزا و شەیتانان هەڕە مالا بەکرێ ئەوان » •

بۆرێ مەمێ دچە بەر دەرێ قەرەتاژدین دسەکنە • ژنا قەرەتاژدین ،

ناڤێ وێ ستی بۆ ، ئەو خوشکا میرزەینەدین بۆ ، ( شۆڤێد ۳ ، ٦ ، ۷ ، ۱۰ ، ۱۳ ) ؛ ( ل شۆڤێد ۱۱ ، ۱۲ و ۱۳ ــ دا ناڤێ وێ پەریخانە ، ل شۆڤێ یەکێدا ناڤێ وێ پەرییە ، ل شۆڤا حەڤتاندا ناڤێ وێ گولپەرییە ) • ئەو ب دل و جان مەمێ قەبۆل دکە مێڤان ، ئەو چاوش دشینـە دیوانـا میرزەینەدیـن پـەی قەرەتاژدین ،کو بێ مالێ ، مێڤانەکی ماقۆل ، ب قـەدر و عـەزیز هـاتییە • قەرەتاژدین تێ مالا خوە ، ب هاتنا مەمێ شاد دبە • سێ رۆژان ، سێ شەڤان ئەو دکەڤنە سوحبەتێ ، گوتوبێژی وان گەلەك دکشینە ، خەبەردانا وان ب هەواس و خۆشـگۆ بۆ ، خوە بیر دکن ، کو لازمە ئەو هەژە دیوانـا مـیر • میرزەینەدین خولامان دشینە دۆ قەرەتاژدین ، کو بێ دیوانا گرەگر و زانـا پرسێد حوکومدارییێڤا موژۆل ببە • قەرەتاژدین دبێژە : « مێڤـانەکی وی عەزیز هاتییە ، ئەو نکارە مێڤانێ خوە بهێلە » • میرزەینەدین ئەمر دکە سـەر وی ، کو ئەو ب مێڤانێ خوەڤا بێنە دیوانێ • قەرەتاژدین و مەمێ دچنە دیوانا میر زەینەدین • میر زەینەدین ب عەشق و شادێ مەمێ قەبـۆل دکە ، ژێـرا عیزەت و ئیکرامێ دکە و پاشێ چاخێ پێ دحەسە ، کو مـەمێ ئاریکـاری قەرەتاژدین کرییە ، تالانێ شەهەرێ جزیرا بۆتان ژ قاچاخان ستاندییە ، ئەو مەمێ خەلات دکە ، ل جەم خوە دهێلە ، دکە ساقێ ، پاشێ ژی ب خوەستنا مەمێ ، ئەو مەمێ دکە نهێرڤانێ دیوانێ ( شۆڤێد هەژمارا ۱۰ ، ۱۱ ، ۱۳ ) ، ل شۆڤێد دندا تێ گۆتن ، کو مەمێ ل مـالا قەرەتاژدینـدا دمینـە و ئەو قەرەتاژدین جارنان دچنە دیوانا میرزەینەدین •

بەری هاتن مەمێ زینا خوشکا میرزەینەدین ژ خەوا شیرن هشیار دبە ، گوستیلێ ل تلییا خوەدا دبینە ، خوەنێ تینە بیرا خوە ، دکەڤە ناڤ خـەم و خیالان دەرد و کولان بۆنا مەمێ خوە حەزکرێ ( شۆڤێد هەژمارا ٤ ، ٥ ، ۷ ، ٤؟ ۱ ، ۱۲ ، ۱۳ ) • ئەو دەردێ دلێ خوە ژ خوشکا خوە ستییێرا گلی دکە •

وەختێ ئەو پێ دحەسە ، کو دەلالێ دلێ وێ مەمێ هاتییە ، ئەو هەمو چار و مکانا پێڕا دبینە ، کو راستی وی بێ •

رۆژەکی مەم و قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان رادبن سەر بالەخـانێ (شۆڤێد هەژمارا ٨ ، ٦ ) ، ل شۆڤێد دندا دبێژن ، کو رادبن سەر بـانێ خانێ و تەماشا شەهەر دکن • هنگێ زین ب جارییێ خوەڤا دچـە سـەر کانییێ ، مەم زینێ ناس دکە ئەو ژ دەستەبراکێد خوەڕا دبێژە ، ب سـتران دبێژە بەر وانڕا کارڤانەك دەرباس بو ، ئەو دخوەزە هەڕە پێشییا وی کارڤانی بگرە و باجەکی ژێ بستینە • دەستەبراکێد وی ب ستران دبێـژن ، کو ل شەهەرێ واندا کەسەك نکارە پێشییا وی کارڤانی بگرە ، سەرەکا کارڤان زینا خوشکا میرزەینەدین دەرگیستییا چەکانە • قەرەتاژدین دبینە ، کو ئۆرتا مەمێ و بران وێ خراب بە ، کو دلێ مەمێ کەتییە زینێ ؛ ئەو ژ برێد خوەڕا دبێژە : « برانو ، برا مەمێ هەڕە پێشییا کارڤان ، ئەگەر ئەوی پێشکێشەك ژ سەرەکا کارڤان ئانی ، بزانبە زینێ وی حەز دکە ، ئەگەر ئەوی نانی ، ئەمێ حەسابێ خوە و مەمێ بکن ، ئیدا چاڤێ وی ل وێ ناکەڤن » • مەمێ دچـە سەر کانییێ ، زینێ وی ناس دکە • مەمێ پیشکێشەکی ژێ دخوەزە ، ئەو خشرێ خوە گرانبەها ددە مەمێ •

ل شۆڤێد هەژمارا ١٣ ــ دا مەم و زین ل کۆشکا زیندا هەڤ دبینن ، راست هەڤ تێن ، لێ ل شۆڤێد هەژمارا ٧ ، ٨ ، ٩ ، ١٠ ، ١١ ، ١٢ــدا ئەو ل باخدا راستی هەڤ تێن ، بەکرێ ئەوان دەرهەڤا ڤێ یەکێـدا ئـەلامی میرزەینەدین دکە ، لێ میرزەینەدین ژ وی باوەڕ ناکە ، زانە کو خوشکا وی ب نامۆسە • وەختەك دەرباس دبە • بەکرێ ئەوان دبێژە میرزەینەدیـن ،

کو قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان خوشکا وی زین دانە مەمێ ، کو ئەڤـا یەکا خرابە بۆنا ناڤێ وی لێ میرزەینەدین گلییێ وی باوەڕ ناکە •

رۆژەك میرزەینەدین ب گرەگرێ خوەڤا ، ب وەزیر و وەکیلێد خوەڤا ، ب قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان دچە نێچیرێ • ل هنەك شاخاندا تێ گۆتن کو مەمێ خوە ب نەخوەش داڤێژە ، کو بمینە ، تەڤ زینێ بـم ، ل هنـەك دبێژن کو ب گۆتنا زینێ ئەو خوە نەخوەش داڤێژە ، ل شاخێد دندا تـێ گلی کرن ، کو بەکرێ ئەوان دبێژە ، کو ئەو ل مال بمینە ، کو ئەو زیـن ببینن ل شاخێ دوەمیندا قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان دبێژنێ ، کو ئەو ل مالدا بمینە •

میرزەینەدین ، گرەگرێ خوەڤا ، ب قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفاتڤـا ژ نێچیرێ ڤەدگەڕن • بەکرێ ئەوان وسان دکە ، کو میرزەینەدین ب زانـا و گرەگرێ خوەڤا هەڕە ناڤ باخ ، ب چاڤێ خوە مەم و زینێ ببینە • قەرەتاژدین تێت و مەرەمێ بەکرێ ئەوان تێ دەردخە ، زۆ زۆ چاویش پێشدا دشینە ناڤ باخ ، کو خوە ڤەشێرن • چاویش تێ ، دبینە زینێ ل عەبا مەمێدایە • مەمێ لاڤا دکە ، کو ڤێ یەکێ ژ کەسەکێرا نەبێژە ، چاویش دبێژە : «ئەز کەسەکێرا نابێژم » •

میرزەینەدین ب کۆما خوەڤا تێ ناڤ باخ ، مەمێ ل بەر وی رانـابە ، بەکرێ ئەوان دبێژە : « چاخێ مەزن تێن ، بچۆك گەرەك وان رابن » • مەم دبێژە : « ئەز نەخوەشم » • بەکرێ ئەوان ل رەخ مەمێ کوچکێ ئـاگر دادده ، کو مەم ژ پێتا ئاگر ژ جییێ خوە رابە (شاخێ هەژمارا ٩) ، لێ مـەم ژ جییێ خوە رانابە ، ئەو کەزیا زینێ ل بن عەبێدا نیشانی قەرەتاژدین دکە • کو مەم و زینێ ژ سۆسرەتییێ ، رۆڕەشییێ خلاس بکە ، قەرەتاژدین زۆ زۆ

درەڤە ئاگر ل مالا خوە ددە ، مالێ دشەوتینە ، ل شاخێ ١٣ــدا ئەو چاویش دشینە مالا وی بشەوتینە • گشك پێ دحەسن ، کو مالا قەرەتاژدین دشەوتە ، بەر ب مالێ دڕەڤن ، کو ئاگر ڤێسینن • مەم و زین ژ ناڤ باخ دڕەڤن ، مەم بەر مالا قەرەتاژدین دڕەڤە ، زین ژی دڕەڤە کۆشکێ • ب ئەمرێ میرزەینەدین خانیکی تەزە رند ژ قەرەتاژدینڕا چێ دکن •

وەختەك دەرباس دبە • میرزەینەدین، قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان دشینم جرمێ بەر هەڤ بکن (شۆڤێ هەژمار ١١ ) ، ل شاخێ دەهاندا تێ گۆتن ، کو ئەگەر ئەو خەرج نەدە ، میرێ شاشانێ بێ سەر وی شەڕ بکە ، ل شاخێ هەیشتاندا تێ گۆتن ، کو دژمن ل سەر وەلاتێ جزیرا بۆتاندا دگرە ، لەما میرزەینەدین ، قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان دشینە پێشبەری وان ، ل شاخێ دندا تێ گۆتن ، کو میرزەینەدین دۆنزدە هەزار ئەسکەر ب سەرکاریا قەرەتاژدین دشینە شەڕ • ل پاش چوینا هەرسێ برایێ قەرەمان قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان بەکری ئەوان جورە جورە دەك و دۆلاڤا پێشبەری مەم و زینێ ساز دکە • رۆژەکێ ئەو دبێژە میرزەینەدین و مەمێ شاترەنج بلیزن ل سەر شەرتێ دلخوەز ، کێ چ خوەست گەرەك ئەو بدە ، یان ژی بکە • میرزەینەدین و مەمێ شاترەنج دلیزن • مەمێ سێ جاران ژ میر دبە و قەت گلیکی نابێژە ، کو من ژ تە بر • بەکرێ ئەوان دبینم ، کو میر نکارە ژ مەمێ ببە ، ئەو دبێژە : «جیێ خوە بگوهێزن» • ئەو جیێ خوە دگوهێزن و دلیزن • بەکرێ ئەوان دڕەڤە کۆشکێ ژ زینێڕا دبێژە : « زینێ شا دبە مەمێ تو ژ میرزەینەدین بری ، ئەو شاترەنج دلیزن ، هەڕە بەر پەنجەرێ ، بنێڕە ، ئەو چاوان دلیزن » • زینێ خوە دخەملینە ، تێ بەر پەنجەرێ ل میرزەینەدین و مەمێ تەماشا دکە • مەم زینێ دبینە ، خوە ل لیستکێدا شاش دکە و میرزەینەدین ژێ دبە • میرزەینەدین دبێژە : « مەمێ

من ژ تە بر ، بێژە ، دلەڤینا تە کێیە ، تو کێ حەز دکی ، ئەزێ دەرێ خزنـا ڤەکم ژ تەڕا بینم » • (شاخێ ٦ ) • مەم ب راستی جابا میر نادە ، بـەکرێ ئەوان تەعنا ل مەمێ دکە ، دبێژە : « دلەڤینا مەمێ رەشم لێڤ دەقـاندییە ، ل بازارێ ڤیرێ دهەلینە » • مەم دبێژە : « نەراستە ، ئەڤینا دلێ مـن زینە ، خوشـکا میرزەینەدینە » • هێرسا میر رادبە ، ئەو دبێژە خەریبێ بێ کەس و نانکۆر ، تو چاوان دکاری بێژی ئەڤینا دلێ من زینە ، خوشـکا میرزەینەدینە»، (شاخێد هەژمارا ١٠ ، ١١ ، ١٣ ) • ئەو دبێژە خولامان مەمێ بدنـە بـەر خەنجەران • ل شـاخێ ١٠ ، ١١ ، ١٣ــدا تێ گـۆتن ، کو قەرەتـاژدین ، چەکان و ئەرفان رادبنە پشتا مەمێ ، ل شاخێد دندا چـاخێ میر و مـەمێ شاترەنج دلیزن هەرسێ برا قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان ل وەلاتێ خەریب بۆن ، چۆبۆنە شەڕ • ب گۆتنا بەکرێ ئەوان میرزەینەدین مـەمێ داڤێـژە زیندانێ • زین دسپێرە خولامێ خوە دزیڤا نەقەبێ هەتا زیندانێ بقەلێشن • ئەو ل نەقەبا بنەردڕا دچە مەمێ دبینە ، خوەرەك ژێڕا دبە • زینا خوشـکا بەکرایێ ئەوان تێ دەردخە ، کو زین و مەمێ هەڤ دبینن ، ئەو دبێژە بـرێ خوە بەکر • بەکرێ ئەوان ئەڤێ یەکێ عەلامی میر دکە • میر مەمێ داڤێـژە زیندانا کەڤری • زینێ ئێدا نکارە مەمێ ببینە • وەختەك دەرباس دبـە • مزگینێ تێ ، کو قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان ژ شەڕ ڤەدگەڕن ، تێـن • ترس و خۆف دکەڤە ناڤ دل و هناڤێ بەکرێ ئـەوان ، ئـەو دترسـە کو قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان وی پێ بحەسن ، کو سەبەبێ وی میر مەمێ ئاڤێتییە زیندانێ ؛ ئەو دبێژە میر : « مەمێ ژ زیندانێ دەرخە » • میرزەینەدین قایل دبە ، کو مەمێ بەردن • بەکرێ ئەوان دڕەڤە ، دچە عەلامی زینێ دکە، کو مەمێ بەردن ، ئەو دبێژە وێ : « زینێ ، شادبە ، برێ تە ، تە ددە مەمێ مێر ، هەڕە ژ زیندانێ دەرخە (شاخێد هەژمارا ٦ ، ٩ ، ١١ ، ١٢) • زیـن

دچە مەمێ ژ زیندانێ دەردخە • لێ مەمێ وێ سەحەتێ ژی دمرە • زین دکەڤە شین و گرینێ ، هەر رۆژ ئەو تێ سەر گۆڕا مەمێ ، دگری ، خەما دکە ، گەلەك بەر خوە دکەڤە ، وەختەکێ شوندا ئەو ژی دمرە • بەری مرنا خوە ئەو لاڤا ل میر ، برێ خوە دکە ، کو وێ ل رەخ مەمێ چال بکن • میرزەینەدین جنیازێ وێ ل تەنیشتا مەمێ ڤەدشێرە ، دکە بن ئاخا سار • بۆ نا مەم و زینێ شەهەرڤان گشك شینێ گرێ ددن •

قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان ب ئەسکەری خوەڤا ڤەدگەڕن ، تێن ، دکەڤنە ناڤ شەهەر ، پێ دحەسن ، کو مەم و زینێ مرنە • هەر یەك ژ وان دبێژە : « ئەم میرزەینەدین و بەکرێ ئەوان ناهێلن » ، میرزەینەدین و بەکرێ ئەوان تێنە پێشیا وان ، لاڤا ژ وان دکن ، کو ببەخشینە وان ، کو باش گوهـ نەدان بۆن مەم و زینێ ، میرزەینەدین دبێژە : «ئەگەر مەم و زین ساخ بۆنا ، منێ مالێ دنێ بدا » •

چاخێ ئەو تێنە سەر گۆڕا مەم و زینێ ، قەرەتاژدین دبێژە : « دەڤێ گۆڕێ ڤەکن ، ئەز خاترێ خوە ژ وان بخوەزم » • دەڤێ گۆڕێ ڤەدکن ، دبینن مەم و زین پاشلا هەڤ دانن ، هەڤ هەمێزکرنە ، خودانێ سەر وانڕا ئاڤێتییە • بەکرێ ئەوان دبێژە : « بنێڕن ، ئەو مینا زێندییانن » • ل وێ سەحەتێ قەرەتاژدین ب شۆرێ خوە بەکرێ ئەوان دپەکینە ، دلۆپەکە خونا وی دکەڤە سەر گۆڕا مەم و زینێ ، ژ وی دلۆپا خونا بەکرێ ئەوان دڕی دگهیژە ، ناهێلە مەم زین بگهیژنە هەڤ ب مرازێ خوە شادبن •

ب ڤی جورەیێ داستانا «مەم و زین» تەمام دبە • ناڤەرۆك ، شۆڤ (شیڤە) و کیرتکا وێ داستانێ مینا داستانا «تریستان و ئیزولدایە» ، مینا داستانا گورجان «ئەبیسالۆم و ئەتیرییە » •

هەفحەزکرنا وان بێ حەد ، تراگێدیيا ئەڤینیــا وان و ئاسێــگاهێ ل پێشیيا وان ، حال و حەوالێ وان مینــا هــەڤن • ژ گۆڕا تریستــان دڕی دگهیژە ، دکەڤە گۆڕا ئیزۆلدێ ، ل ناڤ گۆڕا ئابێسالۆم و ئەتێردا بورمان خوە چال دکە ، دبە دڕی و ناهێلە ئەو بگهیژنە هەڤ ، دلۆپەك خونا بەکرێ ئەوان دبە دڕی ، ناهێلە ئەو بگهیژنە هەڤ •

هلبەت ، ئەم ل ڤرا نــکارن بێــژن ،کو گورجــان داستــانا خــوە « ئەبێسالۆم و ئەتێر » ژ داستانا کوردان هلدایە ، کێلتان ژ داستانا خــوە «تریستان و ئیزۆلدا» ژ وان هلدایە • ئەو داستان مینا هەڤن ، چمکی ملەتێ گورج ، کورد و کێلت ل ناڤ زەمانێ دەرەبەگی ــ باڤ سازمانیدا دەرباس بــوٚنە •

داستانا (مەم و زین) بەری ڤورنا هەرە ناڤیندا ل ناڤ خەلقێ کورددا پەیدا بۆیە ، ناڤێ مەم و زین ل ئڤیسارا شاییرێ کورد مــەلایێ جزیریــدا (ڤورنا ١٤) تێ گۆتن • مەلایێ جزیرێ وەختێ حەزکرا خوە عەیشێڕا خەبەر ددە ، دەرهەڤا ئەڤینا خوە دبێژە : « تو زینی ، ئەز مەمم » •

داستانا «مەم و زین» ئەڤینییێ تێدا دەرهەڤا ڤەرەمانییێ ژی تێ گۆتن• بنیات و بناخا وێ دۆبەرەکییا حەزکرنا تەبیەتی و نزامییا جماعەتییە ، ئــەو نیشان دکە چاوان سازمانییا دەربەگییێ ، یا باڤ سازمانییە ، عەدەت و ژینا وان ناهێلن مرازخوەز ب مرازێ خوە شاد بن • مرنا مەم و زینێ مەرڤــان رادکن پێشبەری زەمانێ دەرەبەگییە ، پێشبەری عەدەتێ بەرێ •

ئەو داستان بەرهەڤۆکا زارگۆتنا مەرڤێد دەنگبێژ و چیرۆکبێژان یێد زەمانێ دەربەگییێ و باڤسازمانییە هاتنە عەفراندن ، لێ ئەو ب فۆرمــا ئەفسانەیێ ، ب جورێ مێثۆلۆجێ هاتییە هوناندن ، تێدا شۆڤێد دەرهەڤــا

کەڤۆکان ، پەرییان و ملیاکەتان ، یێد زینێ دبنە جزیرا بۆتان شۆڤێد دەرھەڤا بۆر ، یێد کو دفرە و مەمێ خەبەر ددە و شۆڤێ خدر نەبێ (خدرئەلیاس) ، یێ کو مەمێ ب بۆرێ ویڤا دبە جزیرا بۆتان ، و شۆڤێد حکیاتێ و ئەفسانەیینە ، ئەو گشك مێتۆلۆجێ • لێ سەرھاتییا مەم و زینێ ، رەنگ و رۆ و خەیسەت و سروشتییا میرزەینەدین ، بەکرێ ئەوان و ھەرسێ بران ــ قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان یێد راستێ و رێیالینە ، گشك راستن ، نە خەیالینە ، وسان ژی حەزکرن و ئەڤینا مەم و زین بێ حەد رێیالی راستگۆنە ، وسان ژی ئاسێگەھێد پێشبەری مرازێ وان گۆتنا راستن •

داستانا «مەم و زین» بەرھەڤۆکا زارگۆتنا عەفراندکارێد زەمانێد دەرەبەگێیێیە ، لێ ئەو ب فۆرما ئەفسانەیێ و مێتۆلۆجێ ھاتییە ھوناندن و چێکرن • شۆڤێد دەرھەڤا کەڤۆکان ، پەرییان ، ملیاکەتان سەر وێدا زێدەبۆنە • ئەڤ شۆڤ ل ڤیسارا ئەحمەدێ خانیدا ، ل « مەم و زینا » ویدا تونەنە • ل «مەم و زینا» وێدا ناڤێ قەرەمانێد ڤیسارا وی ، ناڤێ مەم و زین، میرزەینەدین ، بەکرێ ئەوان ، ستێ ، ھەر سێ بران ــ قەرەتاژدین ، چەکان و ئەرفان مینا ناڤێ قەرەمانێد داستانا «مەم و زینا» فۆلکلۆرینە • ئەڤا نیشان دکە ، کو ئەحمەدێ خانێ ناڤەرۆکا داستانا خوە «مەم و زینا» فۆلکلۆرێ ھلدایە • ب راستێ ژی وسانە • دەرھەڤا وێ یەکێدا ئەو ب خوە دڤیسە : «شەرحا غەمێ دل بکم فسانە، زینێ و مەمێ بکم بەھانە، نەغمێ وێ ژ پەردێ دەرینم ، مەمێ و زینێ ژ نۆ ڤەژینم [11] ، « داییێنە سەرێ حکیاتا پێش ،

(11) بنێرە ئەحمەدێ خانێ ، مەم و زین ، تێکستێ کریتیکی ، تەرجما ، پێشگۆتن و ناسینڤیسارا م. ب. رۆدینکۆ ، مۆسکڤا ــ لێنینگراد ، ١٩٦٢ ، لاپەرێ ٤٩ •

خەلقێ ژ دەردعەشق دلێش » (١٢) .

ل کوتاسییا ڤیسارا خوەدا ، ل پاشگوّتنا خوەدا ئـەو وسـان ژی دڤیسە ، کو ئەوی داستانا خوە ژ سەرهاتێ و چیروّکێد قەبیلـێد کورد : بوّتان ، محەمەدی و سلیڤا هلدایە . ئەو دبێژە :

« هەرچی کو دبێژتن هوّ وایە ،
کو گوە بدنە نەڤـایێ نایە ،
ئەو نینە حەلال و نە حەرامــە ،
بێ پەردەیە ، لێ نە بێ مقامە .
کوردێ ، عەرەبێ ، دەرێ و تازێ ،
تەرتیبکرن ب هەزل و بازێ ،
هندك ژ ئەفسانەیێ بوّهتان ،
هندك ژ ئەفسانەیێ بوهتان ،
هندك د بهانە ، هــن د بهتان ،
بوّهتێ ، محەمەدێ و سلیڤێ ،
هن لەعل ، هنەك ژ زێڕ و زیڤی ،
خرمهرە و موّرك و مرارێ ،
هندك د شەفافن هن د تــارێ ،
هــن قسە و هن ژ وان مثالن ،
هندك حەرامن هند د حەلالن (١٣) » .

لێ «مەم و زینا» ئەحمەدێ خانێ نە مینا «مەم و زینا» فوّلکلوّرییە ، ئەو ب جورێ سازمانێ ، شیرنبێژێ ، نەخش و نیشانێ رند و قەشـەنگ

(١٢) بنێڕە ، دیسان ل وێدەرێ ، لاپەڕێ ٤٩ .
(١٣) بنێڕە ئەحمەدێ خانێ ، مەم و زین ، لاپەڕە ١٨٦ .

هاتییە ڤیساندن ، تێدا خوەرۆ سروشتێ و خەیسەتێ قەرەمانان ب یەکۆ یەکۆ ل دۆ هەڤ هاتییە تراندن ، تێدا وسان ژی ل دۆ هەڤ هاتییە قسەکرن چ ل پەی هەڤ قەومییە • خێن ژ وێ تێدا گەلەك فکر ، بیروباوەڕ ، تێت و مەرەم و خەم وخیالێد خوە ژ شۆڤا فیلۆسۆفێ هلجاندنە ، ل «مەم و زینا» خوەدا ئەحمەدێ خانێ وسان ژی تاریخا شارستانێ و مەدەنییەتا کوردان و سەبەبیا بندەستییا وان ڤیسییە و رێیا یەکیتێ و ئازادبونا وان نیشان کرییە • ل «مەم و زینا» خوەدا ئەوی ل شونا تشتێد ئەفسانە (میفۆلۆژێ) دەرهەقا ژیین و حالێ ملەتێ خوە ڤیسییە • دەرهەقا وێ یەکێدا ئەوی ڤیسییە :

تصفیە مە پیلەکی عەمەل کر
تەصفیەی جەوهەری دەغەل کر (١٤)

« مەم و زینا » ئەحمەدێ خانێ ژ پەسندایینا خوەدێ و پێخەمبەر دەست پێ دکە ، ئەو لاڤا ژ خوەدێ دکە ، کو گوناهێ وی ببەخشینێ ، ل دۆ وی ئەو دەرهەقا دەرد و کولێ کورداندا ، دەرهەقا سەبەبیا پاشدامایینا وان دڤیسە ، دەرهەقا سەبەبیا ڤیساندنا «مەم و زینێ» ب زمانێ کوردێ دڤیسە • ئەوی گەلەك باش حالێ کوردان ل ناڤ قورنێد ١٦ ــ ١٧ ــ دا ب گلی گۆتنێد رەنگاواز ڤیسیە •

ڤەرساندنا داستانا ئەحمەدێ خانێ «مەم و زین» ژ جێژنا نەورۆزێدا دەست پێ دکە ، ل وێدا هەمێ تشت ل جزیرا بۆتاندا دقەومن • ئەحمەدێ خانێ ل بەرە پێشن پەسنێ میرزەینەدین ددە ، پەسنێ هەردۆ قیزێد وی ستێ و زینێ ددە ، پاشێ پەسنێ تاژدین و مەمێ ددە • مەم و تاژدین کنجێ

(١٤) بنێڕە ئەحمەدێ خانێ ، مەم و زین ... لاپەڕە ٣٦ .

ژنان ل خوە دکن ، زین و ستێ کنجێ مێران ل خوە دکن ، ل باخدا ئـەو راستی تاژدین و مەمێ تێن و بێحەد دلێ وان دکەڤە هەڤ ، ستێ و تاژدیـن هەڤ حەز دکن ، زین و مەم ژی هەڤ حەز دکن ، ئەو گوسـتیلێ خـوە ل هەڤ دگوهێڕن و خاترێ خوە ژ هەڤ دخوەزن ، دچنـە مـالێ خوە • ژ ئەڤینێ تابا خوە ناکن دکەڤنە دەرد و کولێ خوە • ستێ و زین دەردێ دلێ خوە ژ دایەڕا دبێژن ، دایە ب رەملا رەملدار پێ دحەسە کینە حەزکارێـد وان ، وان راستی هەڤ تینن ، پاشێ ئەحمەدێ خانێ دەرهەڤـا نیشـانێ و دەواتا ستییێ و تاژدیندا دڤیسە ، پەی وێڕا قەوماندن ، کرن و رەنـگ و رۆیێ «مەم و زینا» ئەحمەدێ خانێ ل پەی هەڤ مینا یێد «مەم و زیـنا» فۆلکلۆری تێنە گوتن •

ئەحمەدێ خانێ «مەم و زینا» خوەدا نیشان دکە ، کو مەمێ بـەرێ ل حالەکی باشدا بوٚ ، قەدرگر و حەزکرێ دۆر بەر خوە بوٚ ، لێ پاشێ دکەڤـە حالێ گران ، دکەڤە ناڤ تۆڕا ئەڤینێ ، دکەڤە ناڤ دەردێ ئەڤینێ و گەلەك ئاسێگەها ل ریا خوەدا دبینە • زینێ ژی مینا مەمێ حالەکی خۆشدا بـوٚ ، لێ پاشێ ئەو ژی دکەڤە ناڤ دەرد و کولێ ئەڤینێ و ل پێشیا وێ ژی گەلەك ئاسێگەه پەیدا دبن • شاعیرێ مەزن ب نەخشێ رەنگاواز نیشان دکە ، کو بەکرێ ئەوان دبە ئاسێگەهێ بەختێ وان ، ناهێلە ئەو ب مرازێ خوە شـاد بن ؛ ل «مەم و زینا» ئەحمەدێ خانیدا ژیین و مرن ، حەزکرن و حەزنەکرن ب هەڤڕانن ، کو یەك بێ یا دن نابە ، کو ژیینا مەرڤان ل شـەڕدایە ، کو ل شەڕدا ئەو ب هەڤڕا گرێدایینـە ، هەڤبەندییـا وان ، هەڤخـوازا وان و هەڤنەخوازا وان هەرگاڤ ب هەڤڕا گرێدایینە ، کو ل ئەڤینێدا مەم و زین حەلالن سادقن و بێحەد هەڤ حەزدکن و حازرن قوربانا هەڤ بـکن ، لێ ل زەمانێ دەرەبەگییێدا ل زەمانێ باڤسازمانییێدا نکاربوٚن مرازێ خـوە

شادبن • مەم خۆرتەکی خشیم ، نەزان ، رند و قەشەنگ و خەبەرخـــوەش بۆ ، زین ژی مینا وی بۆ ، ئەو لایقی هەڤ بۆن ، ئەو نەگهیشتنـــە مرازێ خوە ، چمـــکی ل پێشییـــا وان دۆ گۆر سەکنی بۆن ، یەك بەکرێ ئەوان ، یەك ژی میرزەینەدین بۆ ، ئیلامك بەکرێ ئەوان • میرزەینەدین ب تەمی و وەسیەتا گرەگرێ خوە و بەکرێ ئەوان دژی گورا وان دکر • دەستەبراکێد مەمێ تاژدین ، چەکان و ئەرفان نە مینا هەردۆ گۆران بۆن ، ئەو پێشبەری وان رادبن ، بێ ترس ، بێ خۆف ، شیرحەلال و شکردار تێن بەرچاڤان •

«مەم و زینا ئەحمەدێ خانێ مینا (مەم و زینا ) فۆلکلۆرێ کوتا دبە : ل سەر گۆڕا وان دارا دڕی دگهیژە و ناهێلە مرازخوەز بگهیژنە هەڤ •

ل پاشگۆتنا خوەدا ئەحمەدێ خانێ ب زارێ زینێ تێتـــا خوە ، فکرا خوە دبێژە گەرەك میر چاوان ب هەقێ و راستێ سەروەرێ ل وەلات بکە • زین تەمی و وەسیەتا ل میرزەینەدین دکە ، کو باش شوغول و ئیشێ ژینێ خەلقێ بقەدینە و حوکومڕانییێ بکە ، کو خەلق بەختەواری بژی •

ل کوتاسییا گۆتنا خوەدا ئەم تێنە سەر وێ تێتێ ، کو «مەم و زینا» ئەحمەدێ خانێ هەیکەلەکە کەلەپۆرێ لیتێراتورا کوردا کلاسیکێ هـــەرە مەزنە ؛ کانییا بنات و بناخا وێ یا سەرهاتییا قەرەمانێد وێ ژ سەرهاتێ و چیرۆکێد کوردێ هەرە کەڤنە • هەتا نکا گەلـــەك شـــاخ و شـــۆڤێد وێ فۆلکلۆری هەنە و هەتا نکا خەلقێ کورد وان شاخ و شۆڤان ل ناڤ خوەدا خوەدیکرێ وان حەز دکن ، ب جورە جورە زاراڤان دبێژن • هنـــەك ژ وان شاخ و شۆڤان ژ دەسپێکێ هەتا کوتابۆنێ تێنە ستران ، هنەك ژی تێنـــە گۆتن چاوان سەرهاتییا ژی چیرۆك •



## ملخص المقال

# حول المقارنة بين مختلف الصور الفولكلورية لملحمة (مم وزين) وبينها عند احمدخاني

للبروفيسور قناتى كوردو

ثمة ملاحم كردية رائعة ، منها ملحمة (مم وزين) التي تخلب الالباب ، وهي رغم انتشارها في سائر انحاء كردستان وتسابق الرواة في روايتها بحماسة وتهافت المستمعين على سماعها بشوق غير انها ــ مع الاسف ــ لم تجمع كل صورها لحد الان في دفتي كتاب • وقد سبق أن قرر قسم الكردلوجيا في معهد الاستشراق بلينينگراد ان يقوم بجمع مختلف صورها الفولكلورية وطبعها ووضعها بين ايدي الباحثين الكرد لدراستها وتحليلها •

وخلال عدة سنوات خلت استطاع العاملون الكرد في قسم الكردلوجيا أن يجمعوا ثلاث عشرة صورة فولكلورية منها ، وهي :

١ ــ الصورة التي دونها الباحث أمين عفدال عام ١٩٢٦ في قرية كوزلدەره بناحية اپاران في جمهورية أرمينيا السوفيتية • وقد طبعت نصوصها سنة ١٩٣٧ في اريفان تحت عنوان (النصوص الفولكلورية الكرمانجية) ونحن بدورنا اقتبسناها منها •

٢ ــ ودون الصورة الثانية منها البيرت سوسن ، وطبعت عام ١٨٨٧ في بطرسبورغ • واقتبسناها من كتاب (كورديسچسامملونگين) •

٣ ــ اما الصورة الثالثة منها فقد دونها الكساندر جابا في ارضروم ، وهي تشبه ملحمة (مم وزين) لاحمد خانى ، وهي الآن محفوظة في ارشيف معهد الاستشراق بلينينگراد .

٤ ــ كما دون الصورة الرابعة منها جعفر آغا من قرية كليسا التابعة لناحية حلب بسورية ، وطبعها ليكوك في كتاب (كورديسچ تيكست) في برلين سنة ١٩٠٣ .

٥ ــ اما الصورة الخامسة منها فقد دونها هوگو ماكاش عن لسان محمد امين في ماردين وطبعت عام ١٩٢٦ في لينينگراد . وقد اقتبسناها من كتاب ( كورديسچ تيكست) لهوكوماكاش .

٦ ــ ودون الصورة السادسة منها هارتمان عن لسان احد سكنة ناحية ترابدين ، وهي محفوظة في ارشيف معهد الاستشراق بلينينگراد .

٧ ــ كما دون الصورة السابعة منها مكسيم خمو عن لسان محمد صادق البامرني في العراق عام ١٩٦٣ . ولم تطبع لحد الان .

٨ ــ اما الصورة الثامنة منها فقد دونها ارداش امو عرب من قرية كاروانسرا بناحية اپاران في ارمينيا السوفيتية .

٩ ــ ودون الصورة التاسعة منها اورديخانى جليل عن لسان قروي قرية سيچانلو بناحية تالين في ارمينيا السوفيتية .

١٠ــ كما دون الصورة العاشرة منها مكسيم خمو في قرية جيماغز بناحية اپاران في ارمينيا السوفيتية .

١١ــ ودون الصورة الحادية عشرة منها حاجي جندي ، وطبعت في اريفان عام ١٩٣٦ .

١٢ــ كما دون الصورة الثانية عشرة منها امين عفدال في قرية كاروانسرا عن لسان خدو قاسو ، بناحية ارتيكى في ارمينيا السوفيتية •

١٣ــ ودون الصورة الثالثة عشرة منها اوسكارمان في منطقة ساوجبلاق ، وطبعت في برلين عام ١٩٠٦ •

يقارن الكاتب هذه الصورة للملحمة (مم وزين) بعضها ببعض مبينا وجوه الاختلاف والاتفاق بينها ، معللا اسباب تعدد هذه الوجوه ، مشيرا الى فروق ذات صلات بتعدد لهجات رواتها •



# کارلێکرنا زمانێت بیانیا ل زمانێ کوردی

**عەزیز ئاکرەیی**
**ئەندامێ کوڕا زانیاریا کوردی**

یا خویایه کو کوردستان د دۆیروکێدا یا کەڤتیه ناڤ گەلەك وەلاتێت کو زمان و رەوشەنبیریا مللەتێت وان لێکجاییێزن ، هەروەکو : عەرەبـا ، فارسا ، ئۆیرسا ، ئاگریێجانیا ، گورجیا ، ئەرمەنا و تورکا ، لبەر ڤێ چەندێ یا خۆڕستیه کو مروف بتشتەکێ سەیر نەبینیت ئەگەر هنگیوهێڤە هنـدەك کارتێکرن ل زمان و رەوشەنبیریا کوردیدا هاتبنە کرن ، و بهزرا من ئـەڤ کارلێکرنە بڤان دو رەنگێن گرنگن :

**١ ــ کارلێکرنێت پاشڤەبر « سلبي »**

یا خوڕستیه زمانێ کوردا و هەڤسایێت وان کارێ ل ئێکودوکریە ب هەمان پل « نفس الدرجه » و ئەگەر بێتـو چاڤدێریەکێ لفەرهەنگێت وان گەلێت هەڤسا « جیران » بێن بیانێ بکەین دێ دیـارکەت کو کوردێ ژێ کارێ لوان کرێ و بو نمونه دەربارەی زمـانێ عەرەبێ ئەگەر تەمـاشەی بەرهەڤوکا بژیشك « دکتور » داود چەلەبێ بکەین بناڤێ « کلمات فارسیـة مستعملة في عامية الموصل وفي انحاء العراق تليها كلمات كردية وهنديـة »

و هەر وەسا بەرێ خو بدەینە لیستەكا پەیڤا ژێ یا بو خوێندەڤانێت خوشەڤێ دوێف ڤێ گوتارێڤە من دیاركریە دێ ئەڤە هەمێ بنە بیانگ و نیشان «برهان و دلیل» بو ڤێ رونكرنەڤێ •

**٢ ـ كارلێكرنێت پێشڤەبر « ایجـابي »**

نیازا من د ڤێ ئێكێدا ئەوە كو خودكارێت بیانێ زمان و رەوشەنبیریا خو یا ئێخستیە ناڤ زمانێ كوردادا بڤان رێ و ئەگەرا :

آ ـ ئەگەرێت ئاینێ : ئەڤە رێیدا دەمێ فەلەیێ ناڤ كوردادا بەلاڤبێ ، دەمێ كو كورد هەمێ زەردەشتیبێن ، و ئەو كوردێت بێینە فەلە فێرێ زمانێ ئینجیلێ بێن یێ ئارامێ نەمازە لدوێمایا شاخێ هەژدێدا و دوێف كللێسا روژهەلاتا نەستوریا كەڤتن و تا نهو ئەو كوردێت فەلە یێـن بزمانێ ئینجیلێ دئاخڤـن هەمو رەنگو هیێبێن و راپێچا وان هێژ كوردینە •

فەلێت كورد یێن كو ناڤ لێنـای « ئـاثوری » و كورد دبێـژنێ « تیارێ » ئەون یێن ل چیایێت «هەكارێدا» ل جەرگێ كوردستانێدا ژینە ، و دیسا هندەك لوان بناڤێ «تخوێبێ» و ئەوێن لكوردستانـا ئیرانێدا بناڤێ «بازێ» نە •

فەلێت دێ یێن كورد خوجهێت كوردستانا باكورینە «شمالیە» هەر ژ ماردینێ بگرە تا نزیك هەڤلێرێ بناڤێ « كلدان » ئەو ژێ بزمـانێ ئینجیلێ دئاخڤن •

كوردێن كوردستانا باشوێ «الجنوبیة» و روژهەلاتێ نە بێینـە فەلە چونكێ دوێربێن ل دەستهەلاتا كللێسا روژهەلاتا نەستوریـا و

شاهنشاهیا روما •

هەمو کوردێن فەلە ، لپاش کو بوینە فەلە ، پیتێن ئارامی یێت ئینجیلێ و ئەلفبێت «ئبری» کارئینان و ڤێ ئێکێ ژێ کار لزمانێ کوردێ کریە •

بلایێ زمانێ عەرەبیڤە ، کوردا ل رێیا ئایینیڤە گەلەك پەیڤێت عەرەبی کارئینان و نەشیان وەرگێڕنە کوردێ چونکێ ئولێ بسلمانا رێ نەدا کوردا ئولێ بزمانێ کوردێ ب کاربینن ئینا ڤێ چەندێ ژێ کار لزمانێ کوردێ کر •

ب ــ ئەگەرێت پولیتیکێ : ئامانجا خودکارێت بیانێ ئەوبو کو زمانێ کوردێ یێ جودا لگەل زمانێن وان ب کوتەکێ بگوڕن بەس ل عیراقێ و سوڤیتستانێ نەبیت و ئەڤ رێیە ئێکجارێ تورك و فارسا گرت و تا نهو ژێ رێ نادەنە کوردا زمانێ خوّ یێ دایبابا بکاربینن یان بخوینن و ل سەر کوردا دانایە کو بزمانێ وان بپەیڤن و بخوینن و ڤێ چەندێ ل لایێ فارسا پتر کار دزمانێ کوردادا کریە ، چونکێ زمانێ وان نزیکترە بو کوردێ نە مازە ل کوردستانا باشوری و روژهەلاتێ یێت کو ئێکسەر بو دەمەکێ درێژ بن خودکاریا فارسادا بوینە نەمازە پاشێ بەلاڤبونا بسلمانیەتیێ ، و زمانێ فارسێ کار ل زارێ کوردێت وان دەڤەرێت کوردستانێ کر بتر کو کارێ لزارێ کوردێت کوردستانا باکورێ بکەت و ڤێ ئێکێ کارەکێ وەکر کو فارس بو خو بێژن : چو زمانێت کوردێ نینە و کوردێ زارەکە ژ زمانێ فارسان » و یا ژ هەمیان نەخوشتر و جێ ئاهوداخانە کو هندەك کورد ژێ مەبەستا فارسا پەسەنددکەن •

لدویمایێدا ئەڤ کارلێکرنێت زمانێن بیانیا یێن ئایینێ و پولیتیــکێ نە بەس کار د زمانێ کوردادا کریە بەلکو کــار ل ژینــا وان یا جڤــاتێ و هیڤبۆن و ژینا ئابورێ و هونەرمەندێ ژێ کریە و یا ژ هەمیا ژاتر ئەوە کو وان بیانیا گەلەك جارا کوردێن بسلمان و فەلە توشێ ئێکودوکرن بنــاڤێ ئولێ و جێ داخە خوینەکا مشە و بوش هەردو جونیــا رێژتیــە و زیــان گەهاندینە هەردو لایێن برا ، بەلێ نهو ئەو بار هاتە گوزین و کوردا هەمیا چاڤێت خو فەکرنەڤە و ئەو رویدانێت نەخوش یێن لسەر وان هاتبۆن بونە هزروبیر یان پەند « عِبَرْ » بو وان ، و چاکێ و بــەدێ لێکبرنــەدەر و پیلانێت وان بیانیا یێت خاروڤیچ کرنە خەونێت کویر و دویر بو وان •

## پەیڤێن کوردێ و عەرەبێ یێن لێکنزیك

ئاوریشم : ابریسم
ئونبار : عنبار
ئەستوین : اسطوانه
ئەندازە : هندسه
ئەیوان : ایوان
ئیخنێ : یخنی
باجان : باذنجان
باخچە : بقچه
بادگیر : بادکیر
بازوبەند : بزبند
بازەڕ : بازار
باشوکە : باشق
بجایش : بجایش
بخچك : بقچه
بزمار : مسمار
بنەفش : بنفسج

بوختان : بهتان
بوز : بوز
بوستان : بستان
بەرنامە : برنامج
بەنگ : بنج
بەس : بس
بەند : بند
بەندەر : بندر
بەیار : بور
بەیبوین : بیبون
پرگال : فرجال
پستەڤ : فستق
پویلا : فولاذ
بەهلوان : بهلوان
تازە : طازج
تاق : طاق

**ترشی** : طرشي
**ترنج** : ترنج
**تو** : توث
**تەڕ** : طري
**تەرز** : طراز
**تەشت** : طشت
**تەنبوور** : طنبور
**جانباز** : جمباز
**جاون** : هاون
**جرج** : جرذ
**جگارە** : سیجارە
**جەوال** : جوالق
**چارشەف** : شرشف
**چا** : شای
**چنار** : صنار
**حەوش** : حوش
**خاکی** : خاكي
**خام** : خام
**خان** : خان
**خڕنووك** : خرنوب
**خشخاش** : خشخاش
**خلخال** : خلخال
**خندقاند** : خنق
**خوخ** : خوخ
**خورشید** : خرشید
**خەلات** : خلعه
**دارچین** : دارصین
**دوشەك** : دوشك
**دوکان** : دكان
**دولاب** : دولاب
**دەربەند** : درب
**دەرویش** : درویش
**دەستوور** : دستور
**دەولەت** : دوله
**دەهبە** : دابه
**دەهلیز** : دهلیز
**دیباج** : دیباجه
**دیوان** : دیوان
**رزیانە** : رزنایج
**رۆژنامە** : روزنامه
**ڕۆن** : رونق
**ڕێڤاس** : ریباس
**زاخ** : زاج
**زلوبی** : زلابیه
**زنجیر** : زنجیل
**زەلال** : زلال
**زەمرووید** : زمرد
**زەند** : زند
**زەندیك** : زندیق
**زەنگلوك** : جنجل
**زێڕکێش** : زرکش
**زیلو** : زولیه
**زیوان** : زوان
**ژەنگار** : زنجار
**سادە** : ساذج
**سارداڤ** : سرداب
**ساریج** : صهریج
**سپیاڤ** : سپیداج
**سپیدار** : اسفیدار
**سزا** : جزاء
**سماق** : سماق
**سمورە** : سمور
**سندان** : سندان
**سوێر** : شوره
**سوێسن** : سوسن
**سەرکار** : سرکال

**سەرمايە** : سرمايه
**سەليفك** : سله
**سەندەل** : صندل
**سەيوان** : صيوان
**سيخ** : سيخ
**شادرڤان** : شدروان
**شاهترنج** : شطرنج
**شاهين** : شاهين
**شورەڤا** : شوربه
**شويت** : شبنت
**شوشە** : شوشه
**شەرۆكێ** : شرير . شرس
**شەڤبێن** : شبو
**شەكر** : سكر
**شەلوال** : سروال
**شەما** : شمع
**شەمبوز** : شموس
**شيرە** : سيرج
**شێلم** : شوندر
**شێلم** : شلغم
**شێلندر** : شوندر
**فس** : فسوه
**فەخفوريێ** : فرفوري
**فەرسەنگ** : فرسخ
**فەنەر** : فنار
**فەهرەست** : فهرست
**قولنج** : قولنج
**قومار** : قمار
**قەپان** : قبان
**قەرز** : قرض
**قەهرەمان** : قهرمان
**قيقەقيق** : قهقهة
**كارڤ** : كهرباء

**كاكەز** : كاغز
**كانێزێز** : كهريز
**كتان** : كتان
**كرێ** : كري
**كشتەبان** : كشتبان
**كشمش** : كشمش
**كفتك** : كفته
**كفانچە** : كمنجه
**كوخ** : كوخ
**كورسێ** : كرسي
**كوم** : كوم
**كويرە** : كورة
**كەباب** : كباب
**كەرەوز** : كرفس
**كەژ** : قز
**كەفگر** : كفكير
**كەلێ** : قلعه
**كەندك** : خندق
**كەيف** : كيف
**كەيلۆين** : كيلون
**گامێش** : جاموس
**گوسك** : كوز
**گولنار** : جلنار
**گونبەد** : قبه
**گونەه** : جنحه
**گويز** : جوز
**گەوهەر** : جوهر
**گێچ** : جص
**گێنج** : كنز
**لخاڤ** : لجام
**لوپك** : لوبيا
**لەگلەگ** : لقلق
**ليمو** : ليمون

= هەوا ـــ حەوا

( حەوا ) پڕ بە پێست بە مانای ئەو (هـەوا)یە نیـە کە هەنـاسەی تێدادەدەین • کاتێ دەڵێن : ( چۆلەکەکە بە حەوادا فڕی ) مەبەست ئەوەیە بە بۆشایێ نێوان زەوێ و ئاسماندا فڕی •

لە ( آرتای ویرافنامك )دا وشەی (وا) بۆ ئەم مانایە بەکارهاتوە : (اُوم دیت رونان مردی کیش اندر وای داشت )[١٢] • یانی : پاشان من دیتم گیان «رەوانی»پیاوێك لە حەوادا هەڵواسرابێ •

ڕەنگە (وا) بەم مانایە (ئە)ی خرابێتە پێشەوە و بوبێ بـە (ئەوا) • پاشان ( أ ) بوبێ بە (ه) و (هەوا)ی بەم مانایە لێ‌پەیدا بوبێ • ئەمجار بـۆ جیاکردنەوە لە (هەوا)ی هەناسەپێدان ، (ه)ی (هەوا) بە مانای ئاواڵەیێ فرەوانێ نێوان زەوێ و ئاسمان کرابێ بە (ح) •

٢ ـ گۆڕانی جێگای پیتەکان ( قلب ) :

جێ‌گۆڕکێی پیتەکانی هێندێ وشە لە هەمۆ زمانێکدا هەیە • وا دیارە لە هەوەڵەوە سـەبارەت بە جیاوازێ (لهجە)کان بوە • هێندێ (لهجە) وشەی هێندێ (لهـجە)ی دیکەی بە (مقلوب) بەکارهێناوە • پاشان یەکێ لـەو شکلانە لە بیرچۆتەوە ، یا هەردوکیان زۆر بلاوبونەتەوە ، کەوتونەتە سەر دەم و زاری گشتێ و بونەتە دۆ وشە •

بۆ نمونە لە پەهلەوێ و دەرێ کۆندا :

(١٢) ئەم فاکتە (بەهار) لە لاپەڕەی (٣٠٦)ی کتێبەکەیدا بۆ مەبەستێکی‌دیکە هێناوێتێ .

( وَفْرَ ) وشەیەکی زۆر کۆنە ، لە زمانی پەهلەویدا بۆتە (وَفْلْ ــ وَفْرْ) • لە فارسیٖ و دەریٖ بۆتە (وَرْفْ) و (بَرْفْ) لـە کوردیٖدا وشە کۆنەکەی (وَفْرْ) واوەکەی گۆڕاوە بە (ب) بۆتە (بەفر) • لـە (لهجە)ی هەورامیٖدا (ف)ی (وَرْفْ) گۆڕاوە بە (واو) و بۆتە (وەرو) •

نموونەییٖکی دیکە :

(پَرْثَوی) ، (ر) گـۆڕاوە بە (ل) و (ث) گـۆڕاوە بە (ه) بۆتە ( پەلهەوی ) پاشان ( هـ ) و (ل) جیٖ گۆڕکییان کردوە بۆتە ( پەهلەوی ) •

= هگرز ــ هرگز ــ هەرگیز (کوردیٖ)

= پهریژ ــ پرهیز ــ پاریٖز (کوردیٖ)

لە کوردیٖدا : = خەلٚوز ــ زوخالٚ • نموونەی (زوخالٚ) :

( وەی دلٚەی پارەی زوخالٚیٖیەوە )

=کەشف ــ کفش :

( کەشفا کە مالاتی خوەدا )

« مەلای جزیریٖ »

( دا کفش بین کەوکەب د چەرخ )

« مەلای جزیریٖ »

= ئیٖکجار ، هیٖکجار ــ ئیٖجگار ، هیٖجگار (موکریٖ)

= پاریٖن ــ پاییٖر (موکریٖ)

= پەناه ــ پەنها (موکریٖ)

= ڕەملٚ ــ ڕەلم (موکریٖ)

= هیوا ــ هەویا (موکریٖ)

= جوێن ـ جنێو (موکریێ)
= خیز ـ زیخ (موکریێ)
= دۆخین ـ دێخون (موکریێ)
= تەفزین ـ تەزوین ـ بادینانێ لە ریشەی (تەزوێ) هاتوە :

( تەزوێی پێـدا دێ ) • لـە صرف کردن و وەرکێشـاندا (واو) فڕێدراوە :

تەزیم ، تەزێ •••
= تقدیر،تەڤدیر ـ تەدبیر،تەدویر ـ تەدڤیر (قلب)کراوە بۆتە (تەڤدیر)•
« کوردێ سۆڤێتێ »
= هەڵشیان ـ هەڵوەشـان • پاشان گۆڕانی (و) بە (ی) و (قلب) بۆتە (هەڵشیان) •
= تەڤشێ ـ تەشوێ • پاش (قلب) و گۆڕانی (واو) بە (ڤ) و (ی) بە (واو) • «کوردێ سۆڤێتێ»

= لەعنەت ـ نەعلەت ـ نەحلەت و نالەت
= پسوزگ ـ پزوسك ـ پزیسك • نمونەی پسوزگ :
(پرشەی پسـوزگ تیشـەی ئەلماس رەنگ)
(چەنێ پریشـەی سەنگ شی وەفرسـنگ)
« خانا »

= سەرین ـ سەنیر
= جگەر ـ جەرگ
= مودنە ـ دەمنە (ئەردەلان) : دارجگەرە
= ئەندەرۆن ـ هەندۆر ( کوردێ سۆڤێتێ) • پاش گۆڕانـی ( ١ )

بە (ه) و فڕێدانی (ن)ی دوایی و جێگۆڕکێی (واو) و (رێ) •

= کن ــ نك (بەمانالا)

= بزُرگ ــ گرُبز ــ گوربوز رەنــگە (قلب)کراوی ( بزُرگ) بێ وە وشەیەکی زۆر کۆنی فارسی و کوردییە •

« گرْبزْ بە کێشانەی (هرْمزْ) بە کەسێکی بە فڕوفێڵ و مەکرباز دەکوترێ • بە مانای ئازا و دلێر و زیرەك و بوزورگیش هاتوە • (جرْبز) بە عەرەبی کراوی ئەوە [13] •

**٣ــ سواندن ، یا (تصحیف) کە بە گۆڕین و جێگۆڕکێی پیتەکان و فڕێدانی هێندێ پیت پێکدێ :**

هێندێ وشە لە زمانانی دراوســێ یا دوورترەوە ، ســەبارەت بــە پێداویست ، یا ئایین ، یا بازرگانی و هاتوچــۆ دەکەونە ناو زمانــەوە • خەڵکی زمانەکــە ئەو وشانە بەپێــی راوێژی دەم و شێــوەی تایبەتــی زمانەکەی خۆیان دەگوڕن • گۆڕانەکەش یا بە چەشــنی (قلب)ە کــە باســمانکرد ، یا بە چەشــنی ( تصحیف )ە کــە لە خــوارەوە نموونــەی نیشــاندەدەین ، یا ماناکەی دەگۆڕن ، یا ئەگــەر (جامد)بێ دەیکەنــە ( مشتق ) وەیا بەپێچەوانە • ئەم سیانەی دوایی لە زمانی عەرەبیدا زۆرن • نموونەی ( تصحیــف ) لە زمانی عەرەبیــدا : « چَنْگْ ــ لە فارســی وەرگیراوە ، (تصحیف کراوە بۆتە (شنج) پاشان صرف کراوە ، بۆ نموونە (تشنّج)ی لێدروستکراوە • چَفْسْ ــ لە پەهلەوی وەرگیراوە ــ بە مانای چەسپە ــ (تصحیف) کراوە بۆتە (شبث) ، پاشان صرفکراوە ، بۆ

(١٣) برهان قاطع لاپەڕە (٩٧٩) .

نموونە (تشبّث)ی لێ دروستکراوە »[١٤] .

لە کوردیدا :

کل‌وجه ــ کلۆج
من‌ربّك ــ مەڕنەموکە
مثقب ــ مەتکەب ، مەتکەو ، مەتە
اطمئنان ــ متمانە
مصطفی ــ مچە
محمود ــ خولە
مسجد ــ مزگەوت ، مزگت ( ئەردەڵان ) .

( مزگت کۆنترە لە «مسجد» و لە کتێبی فارسیی کۆندا بینراوە ، گویا وشەیێکی ( سریانی )یە . لەپێش ئیسلامدا بەهۆی مەسیحییەکانەوە ، لە زمانی (ئارامی)یەوە کەوتۆتە ناو زمانی فارسی . (مسجد)ی عەرەبیش هەر لەو ریشەیەیە)[١٥] .

لە زمانی کوردیشدا لەپێش ئیسلامەوە (مزگت) هەیە . لە شیعری کۆنی هەورامیدا بینراوە .

خُداوَنْدکار ــ خونکار

بڕۆت باڵی هوما سایەی سەری سوڵتانی حسنت بۆ
خەطت هات و وتی : من ناسیخی طوغرایی خونکارم
( نالی )

هێندێکیان ( خونکار )یان لەم شیعری (نالی)دا بە خوێنڕێژ و

(١٤) سبك شناسی ل ٢٥٢ .
(١٥) سبك‌شناسی لاپەڕە ٢٥٩ .

پیاوکوژ مانا لێداوەتەوە و هەڵەیە . (خونکار) سوکەڵەی (خداوندگار)ە . (خداوندگار) بۆتە (خواندکار) ـ خواندکار ـ خوندکار ـ خونکار . لەقەبی سوڵتانەکانی عوسمانی بوە . بەسەرهاتی مێژوویی ئەم وشەیە ئاوایە : « لە وشەی (خوتای) پەهلەوی کە بە مانای ساحیب و شا و ئاغا و ، هێندێ کات لەقەبی فریشتەکان وەك : (ماەخدای) بۆ ... لە فارسی دەرێدا دوای هاتنی ئیسلام ، (خداوند)و (خواجە) پەیدابو ، لە سەدەکانی بەرایی ئیسلامدا ( خداوند ) لەقەبی پاشاکان و (خواجە) لەقەبی گەورە و مەزنەکان‌بو . ئەم دو لەقەبە تا سەدەی هەشتەم لە شیعرەکانی شێخی سەعدی و خواجەحافز و شیعری شاعیرانی دیکە و کتێبەکانی مێژودا بەو مانا قەدیمییە دەبینرێ ... » .

پەیدابونی دو لەقەبی (خداوند) و (خواجە) لەبەر ئەمەبو کە « لە ئیسلامدا (خدای) لەجێی (اللّه) و (ربّ)ی عەرەبی بەکارهێنرا . بۆ شا و ساحیب و ئاغا ( خداوند ) بە رەگەڵخستنی ( وَنْد) کە ئەداتی تەشبیە یا نیسبەتە دروست‌کرا ، تا هەر لەو ریشەیە بێ بەلاّم خودی ئەو نەبێ. (خواجە)ش سوکەڵە و چوکەڵەی (خوتای)یە بە رەگەڵخستنی ( یژە ـ یچە ) کە ئەداتی چوکەڵەکردنە ، یانی خودای بچوك و شای بچوك . وردە وردە (خداوند)بوە (خواند) و (خدایچە) بوە (خواجە) . وەکو (خواندکار) کە لەقەبی سوڵتانەکانی عوسمانییە ... » .

« لە سەدەی هەشتەم و نۆهەمەوە ئەم دو لەقەبە دەسکاری‌کران و بێ‌تام و بێ‌نرخ‌بون . گەلێ کەس کە نە شا ، نە وەزیر ، نە گەورە و مەزن‌بون ، هەزاران بازرگانی مەسیحی و جولەکەش ئەم لەقەبەیان وەرگرتوە ، وەك ، خواجە شەمعون و خواجە بوغوز و هی دیکە . لەبەر

ئەمە لە سەردەمی ( تەیمۆریی )یەکانەوە تا ( سەفەویی )یەکان و دوای ئەوانیش ئەم لەقەبانە باویان نەماوە • تا ماوەیەك ( خداوند ) بە چەشنی (خوند) لەقەبی مەلایانی زۆر گەورە ــ شیعە ــ بوە ، وەك ( ئاخوند ملا صدرا ) • پاشان ئەمیش لە باو کەوتوە • ماوەیەکیش بۆتە لەقەبی بازرگانانی ئەرمەنی ، پاشان بۆتە لەقەبی کوێلەی رەش • ئەمڕۆ ئیتر بەتەواوەتی لەناوچوە[١٦] » •

لەمانای شیعرەکەی ( نالی )دا کە یەکێکە لە شیعرە هەرە جوانەکانی ئەو ، دەبێ (طغرا) کە (طرە)ش کوتراوە و ، وشەیێکی تورکییە و بەمانا نەخش و نیشانێك بوە لە فەرمان و سکەی سوڵتانەکانی عوسمانی کێشراوە ، رێی ئەوەی نیشانبدایە کە ( خونکار ) لەقەبی سوڵتانە • کاك ( فاتیح مەلا کەریم ) لە مانای ئەم وشەیەدا هەرچەند ( خوێنڕێژ )ی نوسیوە ، پادشاشی هێناوە و لە مانای راستەقینەی وشەکەی نزیك کردۆتەوە • بەڵام (شا) بە فەرمانڕەواکانی ئێران کوتراوە و (خونکار) بە سوڵتانەکانی عوسمانی •
لە کوردیشدا (خودان) ، (خودێ ) ( خودا ) ، ( خوا ) ، ( خاوەند ، خاوەن ، خێو ــ بەمانا ساحیب ) هەمویان لە ریشەیەکن •

★ ★ ★

بێ جێ نیە ئاوڕێك لە (مخرج)ی پیتەکان بدەینەوە کە لە بەرایی وتارەکەدا باسمانکرد ، نەختێکیش لە ( سهل المخرج ) یا ( لە زمان خۆشبون ) بدوێین کە برێتییە لەوەی پیتەکان و وشەی ریکخراو لە پیتەکان لەگەڵ تەبیعەتی زمان رێكبکەون • بۆ نمونە پیتەکانی ( ث ، ذ ،

(١٦) سبكشناسی ، لاپەڕەی ١٨٤ــ١٨٥ بەکورتکردنەوەوە .

ص ، ض ، ط ، ظ ) و ئەو وشـانەش کە ئەو پیتانەیـان تێ بێ لەگەڵ زمانی عەرەبێ رێك دەکـەون و لە زاری عەرەب قورس نین بەڵام لە تەك زمانی کوردیدا ئاشنایەتییان نیە و لە زاری کورد گرانن • وەکو پیتەکانی ( پ ، چ ، ژ ، گ ، ڤ ) ( بۆ ئەو دوو زمانە بەپێچەوانەن • جا خەڵکی ئـەو زمانەی هێندێ پیـت و وشـەی رێکخـراو لەو پیتانـە لە زمانی گرانە ، لەگەڵ تەبیعەتی زمانەکـەی خـۆی رێکیـان دەخا و لە زار خۆشـیان دەکا • لەبەرئەمەیە کە کورد ( ث ، ص ) دەکاتە (س) ، (ط) دەکاتە (ت) ، (ظ ، ذ) یش دەکاتە (ز) • هەروەها (گیـراوە ــ شدّە )ش کـە لە زاری کـورد قورسە ، سوکی‌دەکا • بۆ نموونە نیّە ، قوّة ، عطیّة ، رعیّە ) سوكدەکا و دەڵێ : نی‌یەت ، قەوەت ، عەتیە ، رەعیەت • ئەمەش هـەر لـە ( أبدال ) دەژمێردرێ بەڵام بەمانای بەرینتر لەوەی ئێمـە خەریکی‌بووین • چونـکە ئەوەی بە ناوی (أبدال) لێی‌دواین پتر قسـە لە گۆڕانی پیتەکان لەنـاو چوارچێوەی زمانی کوردیدا بوو •

لە شیعری پێشینانی کوردیدا ، ئەمە لە شیعری ( مەولەوی )دا پتـر چاوەدێری‌کراوە • مەولەوی گەلێ وشەی هەر بەو چەشنە بەکارهێناوە کە خەڵکی عادەتی کوتویانە •



لە کۆتاییدا وەکو چەند جـار لە توێی وتارەکەدا نووسـیومە ، ئەم مەبەستە چ بە گشتی و چ کەرت‌کەرت لێکۆڵینەوە و بەدواداگەڕانی فەرە و فراوانی دەوێ و زۆریش گرنگە ، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی ( وشەنامە ) دەنووسن ، یا لە تێکستە ئەدەبییەکانی زەمانی زوو دەکۆڵنەوە ، تا بتوانـن وشـەکان بەرنەوە سەر ریشە و رەگەزی خۆیان ، خزمایەتی وشـەکان و

هاوڕەگەزیی وشـــەکانی ( لهجه ) جیاوازەکان نیشانبدەن • من لەمە زیاتر نەمپەرژا خەریکیبم • هەرکەس پتر لە سەری بڕوا و زیاتر لێیبکۆڵێتەوە و هەر هەڵەیێکیش دەبینێ رۆنیکاتەوە ، بەش بە حاڵی خۆم سوپاسیدەکەم•

★ ★ ★

# کۆی ناو لە زمانی کوردیدا

د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف

— ١ —

## چاوگێڕانێك بەو هەوڵانەدا کە نوسەران لەم ڕووەوە داویانە

لە نێو زمانەوانانی کورددا بەر لە هەر کەس مامۆستا سەعید صدقی کابان لە کتێبی «مختصر صرف و نحوی کوردی »دا[1] لە کێشەی کۆی ناو دواوە (بڕوانە : ل ٧) • ئەوەی سەرنج ڕابکێشێ و شایانی باس بێ ، ئەوەیە کە لە باسی ناوی کۆدا ، ئەوەی وتوە کە « لە کوردیـدا اداة جمع (ان)ە • بعضا بە (گەل) و بعضا بە (ات) جمع دەکرێنەوە » (بڕوانە : ل ٧) • بەڵام هەندێك لەو نوسەرانەی دواتر تەنیا باسی (ان)یان کردووە •

مامۆستا تۆفیق وەهبی لە کتێبی «دەستوری زمانی کوردی»دا ، لە ژێر ناوی (تاك و کۆ)دا لەو کێشەیە دواوە و هەندێ زانیاری باسی

(١) سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ .

تۆمارکردووە (٢) • کەم‌وکورتیی ئەم باسە ، ئەوەیە کە لە هەندێ شوێنــدا بە هەڵەچوون و باس‌نەکردن ڕۆی داوە • بە وێنە تۆسەر دەڵێ : « بۆ گــەل کردنەوەی ناوێ ئەبێ ئەداتی تەعریفی مەعیەنی لەگەڵ بێ ••• » ( بڕوانە : ل ٣٨) • من لەو ڕایەدام کە لــە زمانی کوردیــدا بە ئاســانێ دەکرێ نــاو کۆبکرێتەوە و نیشانەی ناسیاویشی لەگەڵ نەبێ ، وەك : (پیاو ــ پیــاوان «پیاوان بەرەو گۆڕستان کەوتنە ڕێ» ) ؛ (ژن ــ ژنان «ژنان لە ماڵــەوە قوڕیان دەپێوا») ؛ (منداڵ ــ منداڵان «منداڵان لە کۆڵان یاری دەکەن »)• هەروەها هەڵدانەوەی بەرهەمی ئەدەبی کوردیێ ئەو ڕایەی ئێمە دەچەسپێنێ و ڕای مامۆستا وەهبیێ ڕەت دەکاتەوە ، ئەویش لەبەر ئەوەی سەدان نمونــــە دەبینرێن کە (ان)ی کۆ بێ یاریدەی نیشانەی ناسیاویێ ، کۆی ساز کردووە ، وەك :

**لە دوگمەی ســوخمە دوێنێ نوێــژی شــێوان**
**بەیــــانی دا ســــفیدەی بــــاغی ســــێوان**

( نالی ، ل ٣٢٠ )

**ســـەر ئەوان و سەر هەموو یارانی پێغەمبــەر ، خــودا**
**داڕژێ ڕەحمــەت هەموو دەم پڕ زەمــین و پڕ فەلــەك**

( مەحوی ، ل ١٩٦ )

**ئەگەر لە جافان یەکێك بمێنێ ، حەقی بەرودوا لەگشت ئەستێنێ •**

( پەندی پێشینان ، ل ٣٦ )

یاخود دەڵێ : ئەگەر دوا دەنگی ناو کۆتاییێ بە بزوێنی (وٙ) بێت ، ئەوە لە کۆکردنەوەدا ، ڕاستەوخۆ نیشانەی (ان)ی پێوە دەلکێنرێ ••• (بڕوانە :

(٢) تەوفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردیێ ، جیزمی یەکەم ، بەغــدا ، ١٩٢٩ ، ل ٣٧ ــ ٤٠ •

ل ٣٩) • لە هەڵکەوتی زمانی کوردیدا بەو چەشنە نییە کە مامۆستا وەهبی وتویە ، بەڵکو ڕاستی ئەوەیە کە لە نێوان ناو و نیشانەکەدا نیمچەبزوێنی (و ــ W ) دێتە کایەوە ، وە هەروەها بزوێنی (ۆ)ی کۆتایی ناوەکە کەمێك لە باری ئاسایی کورتتر دەوترێت ••• توسەر لەوە دواوە کە ئەگەر ناو کۆتایی بە دەنگی بزوێنی (ۆ) و (ە) بێت و نیشانەی (ان)ی کۆی پێوە بلکێنرێ چی گۆڕانێکی فۆنەتیکی ڕۆ دەدات ، کەچی باسی ئەوەی نەکردووە کە ئەگەر ناو کۆتایی بە بزوێنی (ا ، ۆ ، ێ ، ی) هاتبێت لە حاڵەتی کۆکردنەوەیاندا چی ڕوداێك دەبێ •••

مامۆستا نوری عەلی ئەمین لەو کتێبەیدا کە بە ناوی «ڕێزمانی کوردی »یەوە بڵاوی کردۆتەوە [٣] لەژێر سەرباسی (ژمارەی ناو)دا لە تاك و کۆ دواوە (بڕوانە : ل ٧٠ـ٧٢) و نیشانی داوە کە نیشانەی (ان)ی کۆ دوای دەنگە کۆنسۆناتەکان و هەندێ دەنگی بزوێن چۆن خۆی دەنوێنێ • ناتەواوی گەورەی ئەم باسە لەوەدایە کە وای داناوە ، ئەگەر ناوێك «کۆتایی بە بە پیتە بزوێنی (ا ، ێ ، ۆ ، ی) هاتبو ، ئامرازی (یان) ئەلکێنرێ بەدوایەکەیەوە » (بڕوانە : ل ٧١) • لە ڕاستیدا (یان) نیشانەیەکی سەربەخۆ نییە • ئەو (ی ــ Y )یە نیمچەبزوێنێکە و لە نێوان دوو بزوێندا پەیدا بووە• بەم چەشنە دەبینین کە نیشانەکە هەر ( ان )ە • کەموکورتییەکی دیکەی ئەم باسە لەوەدایە ، کە توسەر لەوە نەدواوە ، ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (ۆ) بێت ، لە حاڵەتی لکاندنی (ان)ی کۆدا چی ڕۆ دەدات • هەروەها هەندێ حاڵەتی دیکە هەن ، کە لە کوردیدا کۆ نیشان دەدەن و مامۆستا باسی نەکردوون • [٤]

(٣) نوری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .
(٤) نوسەری ناوبراو لە کتێبی «قواعدی زمانی کوردی»شدا ، بەرگی یەکەم ،

لە باسی کۆی کتێبی «آوا ئو دەستورا زمانێ کوردێ» ، مامۆستا جگەرخوێندا[٥] سەرەڕای هەڵەیەکی زۆر تێکەڵکردنێکی نەشارەزایانە کراوە ( بڕوانە : ل ١٨ــ١٩)• تۆسەر (آن،أن،أێن،ایت،اید،گەل)ی بە نیشانەی کۆ داناوە و (سواران ، سوارن ، سوارێن ، سوارێت ، سوارێد •••)ی بە نموونە بۆ هێناونەتەوە • جگە لە (گەل) لە تێکڕای ئەوانی دیکەدا مامۆستا جگەرخوێن بە هەڵە چووە ، چونکە بەر لە هەمۆ شتێك ئەو نیشانانە (آن ، أن ، أێن ، ایت ، اید ) نین ، بەڵکو (ان ، ن ، ێن ، ێت ، ێد)ن• ئنجا دەبێ ئەوە بڵێین کە لەو کۆمەڵەشدا تەنیا (ان) نیشانەی ڕاستەقینەی کۆی ناوە • هەرچی (ن)ە جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی کۆیە،وە ئەوانی تریش ــ واتە (ێن ، ێت ، ێد) نیشانەی ئیزافەن لە حاڵەتی کۆدا •

لە کۆتایێ باسی کۆی کتێبی ناوبراودا ، دوو هەڵەی دیکەش دێنە پێش چاو :

١ــ نوسەر وای داوەتە قەڵەم کە نیشانەی (گەل) تەنیا لە وڵاتی ئەردەڵاندا بۆ کۆ بەکاردێ •

٢ــ مامۆستا جگەرخوێن وا تێگەیشتووە کە نیشانەی (ات) لە زمانی فارسییەوە وەرگیراوە[٦] •

مامۆستا ڕەشید عومەر دزەیی لە وتاری «چەند سەرنجێکی

---

بەغدا ، ١٩٥٦ ، ل ٤٦ ــ ٤٨ ؛ بەرگی دووەم ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٥٣ ــ ٥٥ لە (تاك و کۆ)ی کۆڵیوەتەوە . هەرچەندە لە بەشی (ژمارەی ناو)ی کتێبەکانی مامۆستا نوری عەلی ئەمیندا هەندێ جیاوازی دەبینرێ ، بەڵام کاکڵ و کەرەستەیان یەکە . جا لەبەر ئەوە تەنیا لە یەکێکیان دواین .

(٥) جگر خوین ، آوا ئو دەستورا زمانێ کوردێ ، بەغدا ، ١٩٦١ .

(٦) دواتر لەو دوو خاڵە دەدوێین .

زمانەوانی »دا[٧] دەربارەی کۆ هەندێ زانیاری باش و بەکەڵکی خستۆتــە پێش‌چاو • بەر لە هەمو شتێك توسەر هەستی بەوە کردووە کە لە هەنــدێ حاڵەتدا نیمچەبزوێن لە نێوان وشە و نیشانەدا پەیدا دەبێ و ئەمەش بووەتــە هۆی ئەوەی کە وەك هەندێ توسەران (ان) و (یان) بە دو نیشانە دانــەنێ • هەروەها لە کۆتایی وتارەکەیدا باسی ژمارەیەك لەو ناوانــەی کردووە کە واتای کۆ دەدەن ••• بەڵام بەداخەوە وتــاری ناوبراو هەنــدێ هەڵــە و کەم و کورتی بەرچاوی تێدایە ، وەك :

١ــ بۆ چۆنیەتی خۆنوانــدنی نیشــانەی (ان)ی کۆ دوای دەنــگە کۆنسۆنانتەکان سێ نمونەی هێناوەتەوە،کەچی یەکێکیان وشەی (کانی) یە کە دوا دەنگی بزوێنە ــ واتە توسەر لێرەدا بزوێــنی (ی) بە کۆنسۆنانــت تێ‌گەیشتووە •

٢ــ لە زۆر شوێندا دەردەکەوێ ، کە نەیتوانیوە جوداوازی لە نێوان ( ی ــ Y )ی کۆنسۆنانت و ( ی ــ î )ی بزوێن بکات •

٣ــ لە سەرپاکی وتارەکەدا (پیت)ی لە بریتی (دەنگ) بەکارهێناوە •

٤ــ کاتێ هــاتۆتە ســەر نیشــانەی کۆ لە کرمــانجی ژوروودا ، بێ لێك‌دانەوە و بێ بەدواکەوتن ، ئەوەی مامۆستا جگەرخوێن دەربارەی ئــەو کێشەیە وتویە دوپاتی کردۆتەوە • جا هەمان هەڵە و ناڕاستی جگەرخوێنی گێڕاوەتەوە •

٥ــ باسی (ات) و (ەها)•••ی نەکردووە •

لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد لەو لێکۆڵینەوانەیدا

(٧) ڕەشید عومەر دزەیی ، چــەند ســەرنجێکی زمــانەوانی ، ڕۆژنــامەی «هاوکاری» ، ژ ١٥ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٤ .

کە لە چەند ژمارەیەکی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »[8] و هەروەها بە کۆکراوەیی لە کتێبێکی سەربەخۆدا بڵاوی کردۆتەوە [9] ، دەبێ لەگەڵ تۆژینەوەی بەشە ئاخاوتنی ناودا باسی (تاك و کۆ)ش لە یاد نەکات ••• مەسەلەی (تاك و کۆ) ، کە پەیوەندییەکی بەهێز و زۆری لەگەڵ ناودا هەیە، لیژنە نەك هەر لە باسی ناودا لێی نەدواوە ، بەڵکو لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی بە لای ئەو کێشەیەدا نەچووە• ئەگەر وەڵامی لیژنە ئەوەبێ کە باسی (ان)ی کۆ دەخاتە باسی نیشانەکانەوە ، ئەوە چارەسەرکردنی ئەو کەم و کورتییە بەوە ناکرێ ، چونکە مەسەلەی (تاك و کۆ) تەنیا نیشانەی (ان) نییە ، بەڵکو زۆر شتی دیکەشی لەگەڵە ••• جا هەرچەندە مەسەلەی کۆ پەیوەندی لەگەڵ هەندێ بەشی تری ئاخاوتندا هەیە ، دەبێ بەتایبەتی لە بەشی ناودا باس بکرێ•

مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی لە کتێبی «سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی»دا [10] بەناوی (ناو لە ڕوی سەرژمێرییەوە) لە (تاك و کۆ) دواوە (بڕوانە : ل ١٤٥—١٤٦) • ڕوی باشی ئەم باسە ئەوەیە کە پەیدابوونی نیمچەبزوێن ، یاخود تێچوونی بزوێن شێوەی ڕاستی (ان)ی نیشانەی کۆی لێ تێك نەداوە ••• کەم‌وکورتیش لەوەدایە کە لە باسی (ناوی کۆ)دا دەربارەی نیشانەی (ات ، ەها •••) هیچی نەوتووە و هەندێ وشەش هەن کە حاڵەتی کۆ ساز دەکەن هەر ناوی نەهێناون ••• لە لاپەڕە (١٥٤)یشدا کە باس

---

(٨) بڕوانە : «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» • ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٩٨ — ٤٩٦ ؛ ب ٣ • ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٤١—٣٥٨ ؛ ژ ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ؛ ل ٢٨٩ — ٤٠٠ •••

(٩) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بە پێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(١٠) محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

پەیوەندیٚ بە ڕۆنانی ناوی دارێژراوەوە هەیە ، مامۆستا هەورامانیٚ دوچاری هەڵەیەکی گەورە بووە ، ئەویش ئەوەیە کە (ان ، گەل ، یان ، ات ، هــات)ی بە پاشگری وشەدارێژ داناوە • بەر لە هەمیٚ شتێك لە نێــو ئەو کۆمــەڵە نیشانەیەدا (یان)(١١) و (هات) نیشانەی سەربەخۆ نین ، بەڵکو (ی) و (ه) ئەو دەنگانەن کە بۆ پاراستنی دەنگی بزوێن هاتوونەتە گۆڕیٚ • جگە لەوە هیــچ یەکێك لەو نیشانانە دەوری دارشتن نابینن •

لە کتێبی «زمانی یەکگرتوی کوردیٚ»ی د. جەمال نەبەزدا (١٢) کورتە باسێك بە ناوی «ئامرازی کردنەگەل»ەوە دەربارەی کۆ بەرچــاو دەکەویٚ (ل : ٣٠) • تۆسەر ڕاست بۆ ئەوە چووە کە (ان)ی لە هــەردوو دیالێــکتە سەرەکییەکەی کوردیدا بە نیشانەی کۆ داناوە ••• بەڵام بەداخــەوە ئــەم بەشە بیٚ هەڵە و کەموکورتی نییە •

جگە لە (ان)ی نیشانەی سەرەکیٚ کۆ ، لە زمــانی کوردیــدا چــەند نیشانەیەکی دیکەش ، وەك : (ات) ، (ەها) ••• هــەن و تۆســەر نــاوی نەهێناون • هەرچەندە لە پەراوێزی ژمارە (٤٢)دا نــاوی (گەل)ی بردووە ، بەڵام هەڵەی ئەوەیە ، وای داناوە کە ئەو نیشانەیە تەنیا لە بەشە دیالێکتــی ئەردەڵاندا بەکار دیٚ(١٣) و بۆ نموونەش وشەی «کوڕگەل»ی هێناوەتەوە • راســتە مۆرفێمی (گەل) لە بەشــە دیــالێکتی ئــەردەڵاندا نیشــــانەی کۆیە ، بەڵام نابیٚ ئەوە لە بیر بکریٚ کە تا ڕادەیەك لە هەندیٚ بەشە دیالێکتی

(١١) کەچیٚ لێرەدا هەستی بە پەیدابوونی نیمچەبزوێن نەکردووە .
(١٢) جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتوی کوردیٚ ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ .
(١٣) لەوە دەچیٚ کە د. نەبەز ڕاکەی جگەرخوێنی دووپات کردبێتەوە ، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد ، مامۆستا جگەرخوێن وای داناوە کــە (گەل) لە وڵاتی ئەردەڵان بەکار دیٚ .

تردا دەبینرێ ، بەتایبەتی لە زمانی ئەدەبیـــدا • بە وێنــە هــەر ئەو وشــەی « کوڕگەل »ەی دە نەبەز بە نموونە هێناویەتییەوە ، بەم جۆرەی خوارەوە لە شیعرێکی گۆراندا دەبینرێ :

**کوڕگەل ! هەمیشــە گیــان و دلشاد بـن**
**دەســت لــە ملانــی بـوکی مراد بــن**

( گۆران ، ب ، ل ۱۷۳ )

لە باسی نیشانەکانی (ێن) و (ێد/ێت)ی کۆی ئیزافەدا جگە لەوەی کە (ێد) و (ێت)ی وەك دوو نیشانە تەماشا کردووە ، هەروەها بێ هیچ ئەساس و بەڵگەیەکیش وای داوەتە قەڵەم کە (ێد) تەنیا لە بەشە دیالێــکتی کــوردی سۆڤیەتدا بەکار دێ • بەڵام تەماشاکردنێکی ســەرپێیی «مــەم و زین»ی ئەحمەدی خانی یەکسەر ئەو ڕایەی دە نەبەز ڕەت دەکاتەوە ، چونکە دەیــان نموونە دەبینرێن کە (ێد)ی نیشانەی ئیزافەی کۆیان پێوە لکاوە ، وەك :

**مەحبــوبە ، لیبــاس و گوشــوارە**
**ملکێــد منــن نــــە مستەعـــارە**

( خانی ، ل ٧٦ )

**ئابــایی « عظام »و جــەدد و والــد**
**مەنســوب و مسەلسەلێـــد خــالد**

( خانی ، ل ٨٠ )

سەرەڕای ئەوانەش ، هەروەها لە هەندێ بەشە دیالێکتی ژوورودا هەندێ نیشانەی دی هەن تووسەر ناوی نەهێناون •

لە لاپەڕە (٤٤ـ٤٨)ی کتێبی پۆلی دووەمی ناوەندیدا[١٤] باسی (ناوی تاك و ناوی کۆ) بەرچاو دەکەوێ • ئەو لیژنەیەی ئەم کتێبەی داناوە، بۆ نیشانە و دەربڕینی کۆ تەنیا باسی (ان)ی کردووە • ئەگەرچی ئەمە کتێبی قوتابخانەیە ، بەڵام دەبوو ئەو حاڵەتانەی تریش باس بکا ، کە لە زمانی کوردیدا کۆ سازدەکەن ••• خۆ لیژنە گەلێ باسی وای کردوە کە لە ڕادەی قوتابیان بەرزترە •

هەرچەندە لیژنە ڕاست بۆ ئەوە چووە ، کە ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (ۆ) بێت ، ئەوە لە کاتی لکاندنی (ان)ی کۆدا نیمچەبزوێنی ( و ــ W ) لە نێوانیاندا پەیدا دەبێ ••• بەڵام بۆ ئەوە نەچووە کە لەو بارەدا بزوێنی (ۆ) هەندێك کورتتر تلفظ دەکرێت •

مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمەد لەو کتێبەیدا کە دوو ساڵ لەمەوبەر بڵاوی کردۆتەوە[١٥] لە باسی تاك و کۆدا دەڵێ : « ناو لە کوردیدا یان بە پیتی کۆمەڵ (ان ، یان)وە یا بە ئامرازی بەرناسکردن (کان) ئەکرێ بە کۆمەڵ •••» ••• «ئەگەر ناوەکە بە پیتی بێدەنگ یان پیتی (و) دوایی هاتبوو (ان) ئەخەینە پشتیەوە ••• » (بڕوانە : ل ٩١) •

ڕاستە (ان) نیشانەی کۆیە ، بەڵام (یان) نیشانەیەکی سەربەخۆ نییە • وەك پێشتر ڕوونمان کردۆتەوە ، ئەو ( ی ـ Y )یە نیمچەبزوێنێکە و لە نێوان دوو بزوێندا پەیدابووە • (کان)یش ، وەك لە وتاری «هەوڵێکی

(١٤) عەبدوڵڵا شالی ، د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ ، د. ئەمین عەلی ، نوری عەلی ئەمین ، فەرەیدوون عەلی ئەمین ، عەلائەددین سەجادی ، کەمال مەحموود فەرەج ، ئەبوزەید مستەفا سندی ، زمان و ئەدەبی کوردی ، بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(١٥) ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

سەرەتایێ بۆ دۆزینەوەی نیشانەکانی ناسیاوێ و نە ناسیاوێ لــە دیالێکتی کرمانجێ خوارۆدا» لێی دواوین[١٦] ، نیشانەیەکی سەربەخۆ نییە و بەڵکو لە (ەکە)ی ناسیاوێ و (ان)ی کۆ پێکهاتووە ••• ڕاستە کاتێ نیشانەی (ان)ی کۆ بە ناوێکەوە بلکێ کە کۆتایێ بە (و)ی کۆنسۆنانت هاتبێ ، ئەوە هیــچ گۆڕانێکی فۆنەتیکێ نایەتە گۆڕێ • بەڵام بەداخەوە مامۆستا جوداوازێ لە نێوان ( و ــ W )ی کۆنسۆنانت و بزوێنی ( ۆ ــ ɑ )دا نەکردووە ، ئەویش بە تایبەتێ لە وشەی «خانۆ»دا (بڕوانە : ل ٩٢) بــەدەردەکەوێ کە وەك نمونە بۆ (و)ی کۆنسۆناتی هێناوەتەوە • ئەمە واتە جودا نەکردنەوەی ( و )ی کۆنسۆنانت و بزوێنی ( ۆ ) و تێکەڵکردنی پیت و دەنگ ، بێ گومان نەك هەر هەڵەیەکی گەورەیە ، بەڵکو نیشانەی نەشارەزایێ و لاوازیشە لە ڕێزمان و زماندا •

جگە لەو هەڵە زەقانە ، هەروەها لەم بەشەدا هەندێ کەم و کورتیش بەرچاو دەکەوێ ، وەك باس نەکردنی ناوی بە بزوێن کۆتایێ هاتو ؛ هەست نەکردن بە هەندێ حاڵەتی دیکەی وا کە کۆ ساز دەکەن ••• هتد •

مامۆستا صادق بەهائەدین لەو نوسراوەیدا کە بە ناوی «ڕێزمانــا کرمانجێ»یەوە نوسیویە و بە ڕۆنیۆ ڕاکێشراوە[١٧] لە لاپەڕە (٧٠ــ٧٤)دا لە کۆ دواوە • نوسەر (ئان) و (یان) و (ئن) و (ین)ی بــە نیشــانەی کۆ داناوە • ڕاستە ئەگەر نیشانەیەك سەرەتای بە بزوێن دەســت پێ بــکات ، ئاسان بە دەمدا نایەت و هەمزە لە پێشیەوە بەدەر دەکەوێ ، بەڵام ئەمە لــە

(١٦) د. ئەوڕەحمانی حاجێ مارف ، هەوڵێکی سەرەتــایێ بۆ دۆزینــەوەی نیشانەکانی ناسیاوێ و نەناسیاوێ لە دیالێکتی کرمانجێ خــوارۆدا ، «گۆڤاری زانکۆ» ، ب ٣ ، ژ ٢ ، سلێمانێ ، ١٩٧٧ ، ل ١٢٢ــ١٦٦ .
(١٧) صادق بەهائەدین ئامێدێ ، ڕێزمانا کرمانجێ ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

جەوهەری نیشانەکە ناگۆڕێ و لەبەر ئەوە هەڵەیە ئەگەر لە نوسیندا هەمزەی لەگەڵ دابنێین • هەروەها باری کۆتایی وشە دەبێتە هۆی تێچوون یاخود پەیدابونی نیمچەبزوێن ، جا ئەوە نابێ وامان لێ بکا کە نیشانەکان بە جۆرێکی دیکە دابنێین •••

سەرەڕای ئەوە ، لە بەردەوامی باسی تاك و کۆی ناودا ، نوسەر تەواو چووەتە سەر کێشەی کۆکردنەوەی جۆرەکانی کردار لە دەمی جوداوازدا و بەمە زۆر لە باسە بنەڕەتییەکەی دور کەوتۆتەوە و گەلێك شتی هەمەچەشنەی تێکەڵ بە یەکتر کردووە •

لە هەندێ لەو کارە زمانەوانییانەدا کە کوردناسانی سۆڤێت : د • قەناتی کوردۆ ، د• چەرکەزی بەکۆ ، د• کەریمی ئەیوبی ، د• ئی• ئا• سمیرنۆڤا ••• نوسیویانە چاومان بە باسی (کۆی ناو) دەکەوێ •

مامۆستا قەناتی کوردۆ لە کتێبی «دەستوری زمانی کوردیی»[18] و کتێبی « زمانێ کوردێ » [19] ••• و هەندێ شوێنیتردا لە کێشەی ناوبراو دواوە • هەرچەندە نوسەر زانیاریی باش و نوێی تۆمارکردووە و بە شێوەیەکی زانستی لێیانی کۆڵیوەتەوە ؛ بەڵام ناوناوە تێکەڵکردن دەبینرێ و هەروەها چەند ڕوی گرنگ باس نەکراوە •

لە بەرهەمە زانستییەکانی مامۆستا چەرکەزی بەکۆشدا ، بە وێنە لە کتێبی «زمانی کوردەکانی ئازربایجان»[20] و کتێبی « زمانی کوردەکانی

(18) قەناتی کوردۆ (کوردۆیێڤ) ، دەستوری زمانی کوردیی ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ، ١٩٥٧ ، ل ٥٣ـ٥٦ .
(19) قەناتێ کوردۆ ، زمانێ کوردێ ، یەریڤان ، ١٩٧٠ ، ل ٤٠ـ٤٢ .
(20) چەرکەزی بەکۆ (باکایێڤ) ، زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ ، ل ٢٩ـ٣٢ .

سۆڤێت »[٢١] ... دا گرنگی بەباسی کۆی ناو دراوە . شایانی باسە کە مامۆستا بەکۆ زانایانە و شارەزایانە لەو کێشەیە دواوە و کەرەستەی زۆر و لێکۆڵینەوەی نایابی پێشکەش کردووە .

له کتێبی «دیالێکتی کوردی موکری»دا ، که کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا دایاننا‌وە [٢٢] ، باسی نیشانەکانی (ان) و (گەل) و هەروەها ئەو واتایانە کراوە کە کۆ دەیانگەیەنێ (ل ١٩-٢٠) . ناتەواوی ئەم کارەش ئەوەیە کە بەلای هەندێ نیشانە و هەندێ حاڵەتدا نەچووە . سەرەڕای ئەوەی (یان)ی بە نیشانەیەکی سەربەخۆ داناوە ، کەچی هاتنی (ان)یشی دوای هەندێ بزوێن باس نەکردووە .

ساڵی ١٩٧٤ ئی. ئا. سمیرنۆڤا بە ناوی «شێوەی ژمارەی ناو لە زمانە ئێرانییەکاندا » کتێبێکی بڵاوکردەوە [٢٣] و لە لاپەڕە (١٧٠-١٧٢)دا دەربارەی کۆی ناو لە بەشە دیالێکتی موکریدا دواوە . نوسەر لەم باسەدا لە گەلێك ڕووەوە سەرکەوتووە و ئەنجامی باشی وەدەست هێناوە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کەم و کورتی دەبینرێ :

ئی. ئا. سمیرنۆڤا لە لاپەڕە (١٥٨)دا وای داناوە کە نیشانەی (ان)ی کۆ لە بەشە دیالێکتی موکریدا تەنیا لە حاڵەتی تیاندا بەرچاو دەکەوێ[٢٤].

(٢١) چەرکەزی بەکۆ ( باکاییڤ ) ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ٦٠-٦٥ .

(٢٢) کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ .

(٢٣) ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، شێوەی ژمارەی ناو لە زمانە ئێرانییەکاندا ، لێنینگراد ، ١٩٧٤ .

(٢٤) وەڵام ڕەتکردنەوە و لێکدانەوەی ئەو ڕایە لە پەراوێزی ژمارە(٤٨)دایە.

نوسەر لەوەدا بە هەڵە چووە کە دەڵێ : نیشانەی (ان)ی کۆ دەچێتــە سەر ئەو ناوانەی کە نیشانەی (ە)ی ناسیاوییان پێوەیە • [25] لەوەشدا ڕاســت نییە کە (ەکان)ی بە پاشگر داوەتە قەڵەم •[26] ••• هتد •

جگە لەو چەند باسەی لە سەرەوە لێیــان دواین ، هەنــدێ کتێب و نامیلکە و وتاری دیکەش هــەن کە باسی کۆی ناویان تێدا کراوە ، بەڵام بەداخەوە لێرەدا مەودای ئەوە نییە لە تێکڕایان بدوێین [27] •

بەم چەشنە ــ واتە دوای کەمێ نیشاندانی ئەوەی چی لە بارەی کۆی ناو لە زمانی کوردیدا نوسراوە ــ ئەوەمان بۆ دەرکەوت ، کە زوربەی ئەو کارانەی دەربارەی ئەم کێشەیە نوسراون هەڵە و ناتەواوی و کەم و کورتییان تێدایە و بە لای زۆر لایەنی باســەکەدا نەچوون و تیشــکی ڕوناکییــان ئاراستەی گەلێك ڕوی نەکردووە و ئەنجامێکی ســەرکەوتویان وەدەست نەهێناوە •

---

(25) بڕوانە : پەراوێزی ژمارە (45) .

(26) بڕوانە : پەراوێزی ژمارە (47) .

(27) هەرچەندە کتێبی
( Ernest N. Maccarus, A. Kurdish Grammar, New-York, 1958)
و کتێبی
( D. N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1961 ).
یش دو سەرچاوەی گرنگن و دەبو باسیان لێوە بکەین ، بەڵام بەداخەوە هەندێ هۆ بونە بەرهەڵست .

## - ٢ -

# کۆ لە چەند زمانێکی بێگانە و هاوڕەگەزی کوردیدا

لە زوربەی زمانەکانی جیهاندا حاڵەتی کۆ هەیە ، بەڵام شێوەی کۆ لە زمانانی جوداوازدا ، وەك یەك نین • بە وێنە لە زمانی (مالایی)دا[٢٨] دوپاتکردنەوە ، نیشانەی کۆیە ، وەك : (( orang )) ـ (مرۆڤ) ، (( orang-orang ))ـ (مرۆڤان) • لە زمانی (شیلوکی) ئەفەریقادا گۆڕینی ئاواز ( Intonation ) کۆ دەردەخات ، وەك : « (( Jit ـ ژیت » ئەگەر بە ئاوازی بەرز دەرببڕێ ، ئەوە بە واتای (گوێ) دێت ـ واتە تاکە • بەڵام کاتێ بە ئاوازی نزم بە دەمدا بێت ، ئەوسا بە واتای (گوێیان) دێت ـ واتە لەم حاڵەتەدا کۆیە • لە زمانی ئەڵەمانیدا گۆڕینی دەنگی بزوێنی ڕەگی وشە حاڵەتی کۆ دێنێتە ئەنجام ، وەك : (( Mutter )) ـ (دایك) ، (( Mûtter )) ـ (دایکان) ؛ یاخود گۆڕینی نیشانەش هەر دەوری کۆکردنەوە دەبینێ ، وەك : (( das Fenster )) (پەنجەرە) ((die Fenster)) ـ (پەنجەرەکان) • لە زمانی ڕۆسیدا گۆڕینی کۆتایی وشە حاڵەتی کۆ پێكدێنێ ، وەك : «کنیگا» ـ (کتێب) ، «کنیگی» ـ (کتێبان) • لە زمانی (ناسس)دا [٢٩] کۆ بە چوار چەشنی جوداواز خۆی دەنوێنێ : زوربەی ناو و کردار حاڵەتی کۆیان بە دوپات کردنەوە پەیدا دەبێ ـ واتە بەشێك لە ڕەگ دوبارە دەکرێتەوە ، وەك : (( gyat )) ـ (مرۆڤ) ، (( gyigyat )) ـ (مرۆڤان) ؛ چەشنی دووەم بە یاریدەی هەندێ پێشگر ساز دەبێ ، وەك :

(٢٨) زمانی ڕەسمیی دەوڵەتی ئەندەنوسیایە .
(٢٩) زمانی دانیشتوانی ئەو حەڤدە هەزار کەسەیە ، کە لە دورگەی نیو پرۆڤیدنیس لە ئۆقیانوسی ئەتلەس دەژین .

(( an'on )) ـــ (دەست)، (( ka - an'on )) ـــ (دەستان)؛ (( Wai )) ـــ (سەوڵ)، (( Lu - wai )) (سەوڵان) • کۆ هەروەها بە هۆی گۆڕینی دەنگی بزوێنی ڕەگەوە پێك دێ ، وەك : (( gwula )) ـــ (پاڵتۆ)، (( gwila )) ـــ (پاڵتۆیان)• لە کۆتاییدا چەشنی چوارەمی حاڵەتی کۆ بە هاریکاری پاشگر دێتە ئەنجام ، وەك : (( waky )) ـــ (برا)، (( wakykw )) ـــ (برایان)••• هتد[۳۰]

لە زمانی فارسی ناوەڕاست (پەهلەوی)دا بۆ پێکهێنانی حاڵەتی کۆ دوو نیشانەیان (ان) و (یها) بەکار دەهێنا • نیشانەی (ان) لە کۆتایی زۆی حاڵەتی جەڕی کۆی (انان)ەوە هاتووە • لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا ئەو کۆتاییە واتای ڕەسەنی • خۆی ون کردووە و بووە بە نیشانەی کۆ • ئەم نیشانەیە ـــ واتە (ان) ، ئێجگار زۆرتر لە ( یها) بەکار دەهێنرا و بە کۆتایی هەموو ناوێکەوە دەلکا ، بێ ئەوەی جوداوازی لە نێو ناوی گیاندار یان ناوی بێ گیاندا بکات ، وەك : «پتاران» ـــ «باوکان» ؛ «داناکان» ـــ (دانایان) ؛ «گۆسپەندان» ـــ (مەڕان) ؛ «ئاتەخشان» ـــ (ئاگران) ؛ «ئاپان» ـــ (ئاوان) ؛ «مێنشنان» ـــ (فکران) ••• نیشانەی (یها)ش دەگەڕێتەوە بۆ دەوری کۆتایی پەهلەوی • لە سەرەتادا تەنیا بۆ ناوی بێ گیان بەکار دەهات • ئەم نیشانەیە زۆر کەمتر لە گەڕدا بوو ، وەك لە نیشانەی (ان)[۳۱] •

لە زمانی فارسی نوێدا دوو نیشانەی (ها) و (ان) کۆ سازدەکەن •

---

(۳۰) ئا. ئا. ڕێفۆرمانسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ۱۹٦۷ ، ل ۲٦۲ ( لە باس‌کردنی ئەو چەند زمانە بێگانەیەدا مەبەستم ئەوەیە ، بڵێم هەر زمانە خاوەنی تایبەتێتی خۆیەتی ! ) .

(۳۱) ف. س. ڕاستۆرگویڤا ، زمانی فارسی ناوەڕاست ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٦ ، ل ٥۰ ـــ ٥۱ .

هەرچەندە جوداوازی لە نێوان واتا گەیاندنی ئەو دوو نیشانەیەدا نییە ، بەلام لە چالاکیدا وێك ناچن • نیشانەی (ها) دەتوانێ بە هەموو ناوێکەوە بلکێ (بێ ئەوەی حاڵەتی بیژۆکی تێدا بێ) • هەرچی نیشانەی (ان)ە تەنیا توانای لکاندنی بە کۆمەڵێکی کەمتر لە وشەوە هەیە[32] • لێرەدا سەرنج ڕاکیش ئەوەیە کە لە مەسەلەی نیشانەی کۆدا ، زمانی فارسی نوێ لە زمانی فارسی ناوەڕاست دوور دەکەوێتەوە و جوێ دەبێتـــەوە ، کەچی زمانی کوردی لە زمانی فارسی ناوەڕاست نێزیك دەبێتەوە[33] •

لە زمانی ڕۆشانیدا (ێن)[34] نیشانەی کۆیە [35] •

لە زمانی ئەفغانیدا (ونا) و (ان) نیشانەی کۆی جنسی نێرن • (ی) و

---

(۳۲) ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، شێوەی ژمارەی نـــاو لە زمـــانە ئێرانییەکانـــدا ، لێنینگراد ، ۱۹۷٤ ، ل ٦۲ .

(۳۳) ئەگەر ئەمە بەڵگە بێ بۆ پتەوکردنی ڕای ئەو زانایانەی ، زمانی فارســی ناوەڕاست بە بناغەی زمانی فارسی نوێ دانانێن ، یاخود پێشکەوتن و گەشەکردن و گۆڕانی مێژوویی زمانی فارسی بێت ، یاخود کارتێکردنی زمانی کوردی یان زمانە ئێرانییەکانی تر بێ بۆ سەر زمانی فارسی ، یاخود هەر هۆیەکی دیکە بێ ، بێگومان پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زانستی و مێژوویی هەیە .

(۳٤) لە ئاخاوتن و ئەدەبیاتی زوربەی بەشە دیالێکتەکانی کرمـــانجی ژووروودا (ێن) وەك نیشانەی ئیزافەی کۆ بەدەردەکەوێ ، بە وێنە :

**ئافەرین سەد ئافەرین　　هێ مـــن ژ وانـــڕا ئافەریـــن**
**ئێ ژ تیرێـــن دلبـــەران　　دائم و دل پەیـــکان و گـــار**

( جزیری ، ل ۲۲۱)

**خورتێـــن کورد هـــۆزانێن وەلاتـــێ مـــە**
**ئەڤـــن ڕابونـــە ژ شـــاخ و لاتـــێ تـــە**

( جگر خوین ، ل ۱۳۸ )

(۳۵) سەرچاوەی ناوبراو ، ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، ل ۹۳ .

(انی)ش نیشانەی کۆی جنسی مێن [٣٦] •

لە زمانی بلوجێدا نیشانە و حاڵەتی کۆ بە گوێرەی دەور و خۆنواندنی ناو لە ڕستەدا دەگۆڕێت [٣٧] •

## – ٣ –

## کۆی ناو لە زمانی کوردیــدا

هەرچەندە لە زمانی کوردیدا هەندێ نیشانە هەن کە کۆ پێك دێنن و هەروەها هەندێ حاڵەت هەن کە مانای کۆ دەگەیــەنن ، بەلام نیشــانەی ڕەسەن و سەرەکی کۆی ناو [٣٨] (ان)ە •

ئەم نیشانەیە (یان) نیە ، وەك هەندێ لە نوسەران دایان ناوە [٣٩] ، بەلکو (ان)ە ، چونکە لە باری ئاساییدا ــ واتە کاتێك بە دوای دەنگێکی کۆنسۆنانتدا دێ ــ بە باشی دەردەکەوێ • بەلام وەك زۆر دیاردەی تــری زمانی کوردی ، لە هەندێ حاڵەتدا بە شێوەیەکی دیکە دەبینرێ و ئەمــە

(٣٦) هەمان سەرچاوە ، ل ١٩٦ .
(٣٧) هەمان سەرچاوە ، ل ١١٠ .
(٣٨) هەروەها مەسەلەی کۆ پەیوەندی بە هەندێ بەشی دیکەی ئاخاوتنەوە ، وەك (ئاوەڵناو ، جیناو ، ژمارە ، کردار ...) هەیە ، بەلام ئێمە لێرەدا لە حاڵەتی کۆی ناو دەدوێین .
(٣٩) گەلێك لە زانایان و ڕۆناکبیرانی کورد و بێگانە وایان داوەتە قەڵەم ، کە گوایا ئەو ناوانەی بە بزوێنی ( ا ، ۆ ، ێ ، ی ) کۆتاییان دێت بە هۆی باشگر / ئـامراز ( ڕاستــتر نیشــانە ــ ئەوڕەحمــان )ی (یــان)ەوە کۆدەکرێنەوە (بڕوانە بەشی یەکەمی ئەم وتارە) ... شایانی باسە مامۆستا ڕەشید عومەر دزەیی هەستی بەو ڕاستییە کردووە کە نیشانەکە (ان)ە و لە وتاری (چەند سەرنجێکی زمانەوانی ، ڕۆژنامەی «هاوکاری» ، ژ ١٥ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٤ )دا لەم کێشـەیە دواوە .

بووەتە هۆی نەناسینەوەی • جا بەم بۆنەیەوە سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشین کە:

١ــ ئەگەر ناوێك کۆتایی بە دەنگی کۆنسۆنانت بێت ، ئەوە (ان)ی بە ڕەوانی پێوە دەلکێنرێ ، بێ ئەوەی هیچ زیادێ و کەمییەك بێتە گۆڕێ ، وەك :

ژن + ان = ژنــان

**ژنان دەچون بۆ شایی**

شار + ان = شــاران

**نــاله هــاته زمــان وتی یــــاران**
**لازمـــه ڕۆ بکەینـــه ڕێی شــــــاران**

( زێوەر ، ل ٧٥ )

مشك + ان = مشـــكان

**ئەگەر پشیله له مال نەبێ ، مشكان تلیلی لیانه**

( پەندی پێشینان ، ل ٣١)

کێو + ان = کێوان

**له خەوفی طەلعــەتی ڕۆژ هەر وەکــو شــێت**
**بــه ڕۆژەردێ هـــەلات و کەوتـــه کێـــوان**

( نالی ، ل ٣٢١ )

٢ــ ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی ( ا ، ۆ ، ێ ، ی ) بێت ، ئەوە لە نێوان ناو و نیشانەکەدا ( ی ــ Y )ی نیمچەبزوێن پەیدا دەبێ ، وەك :

( ا )

برا + ان = برایــان

**برایانی تۆ چاویان لە ماڵی خەڵك نییە**

( ۆ )

پەڕۆ + ان = پەڕۆیــان

**ئەو پەڕۆیانــە دڕاون**

( ێ )

پێ + ان = پێیــان

**ئەو ڕۆژە بە پێیان ڕۆیشتم**

( لە خەوما ، ل ٢٩ )

( ی )(٤٠)

صۆفی + ان = صۆفییــان

**صۆفییان هاتنە مەجلیــس وەرەقــی دیــدە بشــۆن**

**لە کن ئــەو دیمییــە وشــکانە لە دەریــا نییە باس**

(نالی ، ل ٢٣٤ )

٣ــ ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنــی ( وو ) بێــت ، ئەوە لە نێــوان ناوەکە و نیشانەکەدا نیمچەبزوێنی ( و ــ W ) دێتە کایەوە ؛ هەروەهــا بزوێنی ( وو )ی کۆتایی وشەکە کەمێك لە باری ئاسایی کورتتر دەوترێت ، وەك :

(٤٠) لە حاڵەتی کۆکردنەوەی وشەی کۆتایی هاتوو بە (ی)دا ، هەروەها شێوەی کورت کردنەوەش دەبینرێ،بە وێنە وەك کە دەوترێ « صۆفیان ...».

بەڕۆ + ان = بەڕووان
**پیاو بە بەڕووان تێر نابێت**

مۆرۆ + ان = مۆرووان [41]

**عومری گەیشتە شەستە ، مۆرووان ئەکاتە دەستە**

( پەندی پێشینان ، ل ٣٠٥ )

٤ـ ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (ە) بێت ، ئەو کاتە (ە)ی کۆتایی ناوەکە تیّدەچێ ، وەك :

بەڕە + ان = بەڕان
**سەیران ئەو بەڕانەی داخستووە**

وەك لە سەرەوە وتمان ، جگە لە (ان) هەندێ نیشانەی دیکە هەن ، کە کۆ ساز دەکەن ، وەك :

**ـ ات ـ**

هەرچەندە (ات) لە زمانی عەرەبیدا نیشانەی کۆیە ، بەڵام لە کوردیدا هێندە بەکار دەهێنرێ ، کە ناکرێ لە باسی کۆدا پشتگوێ بخرێ .

نیشانەی (ات) لە زمانی کوردیدا بەڕەوانی بە هەندێ وشەوە دەلکێ ، وەك :

باغ + ات = باغـات
**باغاتی شەقڵاوە بەناوبانگن**

(٤١) لەم حاڵەتەشدا هەروەها شێوەی کورتکردنەوە هەیە ، وەك کە دەوترێ: « بەڕوان ، مۆروان ... » .

خەیاڵ + ات = خەیالاّت

**خەیالاّتی شەو و ڕۆژم ژیانی میللەتی کوردە**

**تەمەننام لای خودا دائیم ژیانی میللەتی کوردە**

( بێکەس ، ل ٢٤ )

هەندێ جاریش لە نێوان ناو و نیشانەکەدا دەنگی ( و ، ج ، ه ) پەیدا دەبێ ، بەتایبەتی ئەگەر ناوەکە کۆتاییِ بە دەنگی بزوێـــن هاتبێ ، وەك :

ئاغا + و + ات = ئاغاوات

**دەمێکە ئاغاوات هێزیان نەماوە**

میوە + ج + ات = میوەجات[٤٢]

**میوەجات لە کوردستان زۆرە**

دێ + ه + ات = دێهـــات

**دوهـــاتی ئەورووپـــا وەك ئـــەهلی دێهـــات**

**لــە چـــارەی دەردی عیشقـــا جوملە دامان[٤٣]**

( مەحوی ، ل ٢٤٢ )

ئەوەش بەدی دەکرێ کە ناوناوە بۆ سەر ئەو ناوانـــەی بە یاریـــدەی

(٤٢) لە وشەی «میوە»دا چۆن دەنگی (ج) ، هەروەها دەنگی (ه)ش دەتوانێ بێتە ناوەوە و بوترێ «میوەهات» .

(٤٣) زوربەی زۆری زمانەوانانی کورد ناوی نیشانەی (ات)یان نەهێنـــاوە . مامۆستا سەعید صدقی ئەوەندەی وتووە کە ناو لە زمـــانی کوردیـــدا « بعضا بە ( ات ) جمع دەکرێتەوە » ( بڕوانە : مختصر صرف و نحوی کوردی ، ل ٧ ) . شایانی باسە کە مامۆستا عەبدولڕەحمـــان محەمەد ئەمین زەبیحی لە «قامۆسی زمانی کوردی»دا (بەرگی یەکەم ، بەغـــدا ، ١٩٧٧ ، ل ٤ ) زانیاریِ بە کەڵکی دەربارەی ئەو نیشانەیە تۆمار کردووە و هەندێ ڕۆی ڕاستی ساغ کردۆتەوە .

نیشانەی (ات)ی کۆ کۆدەکرێنەوە ، نیشـــانەی (ان)ی کۆشـــیان ئیزافـــە دەکرێ ــ واتە ناوێك لە بریــتی یەك نیشـــانەی کۆ ، دوان وەردەگرێ • هەروەها پێویستە ئەوەش لەبیر نەکەین کە لەو حاڵەتەدا بە زۆری نیشـــانەی ناسیاوی (ەکە) لەنێوان دوو نیشانەکەی کۆدا پەیدا دەبێ ، وەك :

دێ + ە + ات + ەکە + ان = دێهـــاتەکان

**« لە نیهایەتی حاسلاتدا قیمەتی ئەو وەختەی دەغــڵ و دان چەند بوو ، دوو قاتم لە اهالی دێهاتەکانی خۆم ئەسەند ••• »**

( مەسەلەی ویژدان ، ل ٢٢ )

**ــ ەها ــ**

مۆرفێمی (ەها)ش یەکێکە لەو نیشانانەی لە زمانی کوردیدا کۆ پێك دێنێ ، بەڵام تەنیا دەتوانێ بچێتە سەر ژمارەیەکی کەم لە ناو ، وەك :

دەرد + ەها = دەردەها

**ئەو نەهــاتن : دەردە ، داغی ئەو نەهــاتن : دەردەهـــا**
**کەس بە دەردی من نەچێ ، وەك مــن نەبێ تووشــی نەهــات**
( مەحوی ، ل ٥٩ )

وەك لە سەرەوە لێی دواین ، ئەم نیشانەیە لە زمانی فارسی ناوەڕاستدا هەبووە و ئێستاش لە زمانی فارسی نوێدا نیشانەی سەرەکی کۆیە • کــەم بەکارهێنان و سستی نیشانەی (ەها) لە زمانی کوردیدا ، ئەوە دیار دەخەن ، کە سەرچاوەی نیشانەی (ەها)ی کۆی کوردی زمانی فارسی ناوەڕاست یان زمانی فارسی نوێ بێ •

**ـ گەل ـ (٤٤)**

هەروەها ئەگەر بە ناوی هەندێ گیانلەبـەرەوە مۆرفیمـی (گەل) بلکێنرێ ، ئەو دەمە کۆ پەیدا دەبێ ، وەك :

کوڕ + گەل = کوڕگەل

**زۆری نەمـاوە کـوڕگەلی کورد بێنـە نـاو کایـەوە**

**ئەو سایە شخصی شخصی خۆی بە خۆی سەنگەسار نابێ(٤٥)**

( پیرەمێرد ، ل ٢٨٥ )

گا + گەل = گاگەل

**گاگەل بە گردەوە زۆی ، پیرێژن گۆلکە سوری ئەپێچایەوە .**

( پەندی پێشینان ، ل ٣٦١ )

سەگ + گەل = سەگگەل (٤٦)

---

(٤٤) وا ڕێدەکەوێ ئەو نیشانەیە لە شێوەی ( ەگەل )دا بە دەردەکەوێ،وەك دواتر لە وشـەی « کارەگەل »دا دەبینرێ. لێرەدا پێویستە ئەوە بلێین کە ئەو بزوێنی (ە)یەی لە نێوان وشە و نیشانەکەدا پەیدا دەبێ ، ڕەسەن نییە ، بەڵکو پەیوەندییە و بۆ ئاسانکردنی کۆکردنەوەکە ـ واتە بـۆ یاریدەی لکاندنی نیشانەکە بە وشەکەوە ـ هێنراوە . بەڵگەش بـۆ سەلماندنی ئەوەی کە نیشانەکە (گەل)ە ، نەك (ەگەل) ، ئەوەیە کە هەمو ئەو وشانەی (گەل)یان پێوە لکاوە (جگە لە چەند نمونـەیەکی زۆر کەم نەبێت ) بێ یاریدەی (ە) پێکهاتون.

(٤٥) هەرچەندە ئەو شیعرەی پـیرەمێرد لەو سەرچـاوەیەدا کە لێمـانەوە وەرگرتووە بەو جۆرەی سەرەوە تۆمارکراوە ، بـەڵام لەو ڕایـەدام کە شێوە ڕاستی بەو چەشنەی خوارەوە بێت :

**زۆری نەمـــاوە کوڕگەلی کورد بێنـــە کایـــەوە**

**ئەوسایە شخصی شخصی بە خۆی سەنگەسار ئەبێ**

(٤٦) لەبەر ئەوەی لە وشەی «سەگگەل»دا دو دەنگی (گ) ـ واتە دو دەنگی کۆنسۆنانتی وێکچو ـ کەوتونەتە پاڵ یەك ، لە دەربڕیندا کورتکردنەوە ڕو دەدات ، واتە (گ)یەك فوت دەدرێ و « سەگەل » دەوترێ .

**گورگ کە پیر بۆ ئەبێ بە مەخسەرەی سەگگەل**

( پەندی پێشینان ، ل ٣٦٧ )

کار + ە + گەل = کارەگەل

**چیفێکی کۆنی پڕ لە چڵك و تۆز**
**کە بۆ کارەگەل کرابێت بە کۆز**

( پیرەمێرد ، ل ٢٧٣ )

**کارەگەلی وان بلبلاسان**
**بەرم دایتە ناو زێواسان**
**وەرنە سەیری سەر بە تاسان**

( فۆلکلۆر ، ل ٧٠ )

تاکو ئێرە ئەوەمان ڕۆنکردەوە کە لە زمانی کوردیدا ــ (ان) نیشانەیەکی سەرەکی و ڕەسەنی کۆیە • نیشانەی (ات) و (ەها) و (گەل)یش لە پلەی دووەمدا کۆ سازدەکەن [٤٧] •

ئێستاش دێینە سەر ئەو حاڵەتانەی لە ڕێگای‌ترەوە مانای کۆ دەگەیەنن و دەردەبڕن :

**١ــ زۆر جار نە بە ناوەوە ، نە بە کردارەوە نیشانەی کۆ نییە ــ واتە چ ناوەکە ، چ کردارەکە بە تاك هاتون ــ کەچی مەبەست مانای کۆ دەگەیەنێ ، وەك :**

(٤٧) هەرچەندە وشەی «بەرخەل» کە لە ڕواڵەتدا لە وشەی «بەرخ» و نیشانەی (ەل) پێکهاتووە ــ واتە (ەل) کۆی ساز کردووە ، بەڵام وا پێ دەچێ هەر (گەل)ەکە بێ و کورت‌کرابێتەوە ، ئەویش چونکە نمونەی دیکە لەو جورە بەرچاو ناکەوێ و هەروەها هەندێ جاریش «بەرخ‌گەل» بەکاردەهێنرێ .

**ئەرێ کارگ لە کوردستان شین دەبێ ؟ .**

٢ــ گەلێك جار کۆی ناو بە یاریــدەی کردار یــاخود ئاوەڵنــاو بە دەردەکەوێ ــ واتە ناوەکە لە حاڵەتی تاکدایە و کردارەکە یان ئاوەڵناوەکە کۆ ــ ئەمەش دەبێتە هۆی نیشاندانی ناوەکە بە واتای کۆ ، وەك :

**سێوی گەیشتو لە دار کەوتنە خوارەوە**

**سێوە گەیشتووەکان لە دارەکە کەوتنە خوارەوە .**

٣ــ هەروەها ئەگەر لە پێش ناوەوە (ژمارە) یاخــود وشــەی وەك (هەندێك/هەندێ ، کۆمەڵ ، چەپك ، دەسك ، دەستە ، پۆل ، تاقم ، ڕەوە، چەند ، بڕ ، هۆز ، خێڵ ، تیرە ، چین ، گەل ، لەشکر ، سوپا ...) کە لــە بنەڕەتدا واتای کۆیان تێدایە ، بێن ، ئەوە هەرچەندە ناوەکە بە تاك دێــت ، بەڵام بە ناوەرۆك واتای کۆ دەگەیەنێ . بە وێنە :

**سەد ســاڵ بکەیت بێگانە پەرستی ، دوایی هەر دێنیت نشوستی .**

( پەندی پێشینان ، ل٢٧٤ )

**لە خواری دێوە هەنــدێ کەپــری شــاش ،**
**شــایی هەڵپــەڕکێی تیــا دەرئەکەوت باش !**

( گۆران ، ب ، ل ١٧١ )

**بردیــانینە بــن کۆمــەڵێــك دارتــو**
**لێفــە و بەڕەیــان بــۆ داخستــین زۆ**

( گۆران ، ب ، ل ١٦٧ )

**چەپکێ لــە گوڵەکەی بــاغەکەی ســەرا**
**کــە بــە خوێنــاوی لاوان ئــاودرا**

( پیرەمێرد ، ل ١٠٢ )

... هتد .

لە زمانی کوردیدا ، ئەوەش بە دیِ دەکریِ کە کۆ لە حاڵەتی ناسیاویدا خۆی دەنویِنیِ . وەك :

١ـ ئەگەر ناویِك (ەکە)ی[٤٨] نیشانەی ناسیاویِ پیِوەبیِ ، دەتوانریِ (ان)ی نیشانەی کۆی بخریِتە سەر[٤٩] . ئەو کاتە کۆ لە حاڵەتی تەئکیددا پەیدا دەبیِ [٥٠] وەك :

---

(٤٨) ئی. ئا. سمیرنۆڤا لە لاپەڕە (١٦٤)ی کتیِبی ناوبراودا ، وای داناوە کە نیشانەی (ان)ی کۆ دەچیِتە سەر ئەو ناوانەش کە نیشانەی (ە)ی ناسیاوییان پیِوەیە . بیِگومان نوسەر لەمەدا بەهەڵە چووە و (ان) ناتوانیِ بە وشەیەکەوە بلکیِ کە (ە)ی نیشانەی ناسیاویِ پیِوە بیِ . هۆی ئەم هەڵەیەش ئەوەیە ، کە پەیدابونی (ە) بە کۆتایی ناوەوە لە حاڵەتی هاتنی جیِناوی نیشاندان لە پیِشیەوە ، بە نیشانەی ناسیاویِ تیِگەیشتووە .

(٤٩) بەڵام ئەگەر ناویِك (ەکە)ی نیشانەی ناسیاویِ پیِوە بیِ ، ناکریِ نیشانەی (ات) و (ەها)ی کۆی بخریِتە سەر . ڕەنگە ئەمەش بتوانیِ ببیِتە بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی ناڕەسەنیِ ئەو دوِ نیشانەیە .

(٥٠) بەشیِك لە ڕۆناکبیران و نوسەرانی ڕیِزمانی کوردیِ وایان داناوە کە ( ەکان ) نیشانەی کۆیە و پیِی دەڵیِن پاشگری ( ەکان ) . بەداخەوە بۆ ئەوە نەچوون کە لە ( ەکە )ی ناسیاویِ و ( ان )ی کۆ پیِك هاتووە و بە هەردوِ نیشانەکە کۆ لە حاڵەتی تەئکیدا دەردەخەن . بەوێنە ، بڕوانە : ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، ڕیِزمانی کوردیِ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٩١ ، صەباح غالب ، کتیِبی ڕیِزمانی ئاخاوتنی کوردیِ لەبەر تیشکی لیِکۆڵینەوەدا ، ڕۆژنامەی «هاوکاریِ» ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، (ژ ٤ بڕوانە : سەرچاوەی ژمارە ١١ ).. وە هەندیِ نوسەری تر .

هەرچەندە ئی. ئا. سمیرنۆڤا لە لاپەڕە (١٦٤)ی سەرچاوەی ناوبراودا پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکیِشاوە ، کە (ەکان) لە (ەکە + ان) دروست بووە ، بەڵام هەڵەی لەوەدایە کە ناوی ناوە پاشگری (ەکان) . بیِگومان لە زمانی

کوڕ + ەکە + ان = کوڕەکان

**وا چـــاکە هەتــــاکو هـــــەم**
**کوڕەکانـــم تــــەمێ کــــەم**

( بێکەس ، ل ١٤١ )

لوتکە + ەکە + ان = لوتکەکان

**کە لــە نــاو کەپــران جلەویـــان گرتـــین ،**
**زەردەی لوتــکەکان پــاش و پێــش ئەفڕێــن !**

( گۆران ، ب ، ل ١٧١ )

٢ـ ئەگەر لە پێش ناوێکەوە کە بە (ەکە) کرابێتە ناسراو ، (ژمارە) یان وشەی ( چەند ٠٠٠) بێت ، ئەوە هەرچەندە ناوەکە شێوەی تاکی دەبێ، بەڵام لەگەڵ تەئکیدا واتای کۆ پێك دێ ٠ وەك :

**چوار نامەکەم ڕەوانە کرد**

**چەند پیاوەکە دوور کەوتنەوە**

٣ـ ئەگەر لە پێش ناوێکەوە کە نیشانەی (ێك ، ێ)ی نەناسیاوێ پێوە بێ ، (ژمارە) یاخود (چەند ، هەمــوو ، کۆمــەڵە ٠٠٠) بێــت ، ئەوە هەرچەندە ناوەکە شێوەی تاکی دەبێ ، بەڵام بە یاریدەی ئەو وشانە واتای کۆ پێك دێ٠ وەك :

**ئەو وتارە بیست لاپەڕەیەك دەبێ**

**لە پاش چەند سەعاتێك هێز لە ئەژنۆم بڕا ٠٠٠**

( لەخەوما ، ل ٢٩ )

---

کوردیدا پاشگرێك (ڕاستتر نیشانەیەك ـ ئەوڕەحمان ) نییە بە نــاوی (ەکان)ەوە ٠

نــازانم دنیــا ڕۆژە یــا شــەوە
هەمــوو کاریــکم خواردن و خــەوە

( بێکەس ، ل ٩٦ )

کۆمەڵە شاخێك سەخت و گەردن کەش ،
ئاسمــانی شــینی گرتــۆتە بــاوەش ،

( گۆران ، ب ، ل ١٤٥ )

بینیمان کە لە زمانی کوردیدا ، جگە لە نیشــانەی (ان) ، هەنــدێ نیشانەی تر و چەند حاڵەتێکی تایبەتی هەن کە دەبنە هۆی گەیاندنی مانای کۆ ... بەڵام ئەوەی دیار و ئاشکرایە ، ئەوەیە کە نیشانەی (ان)ی کۆ لە هەموان سەرەکی‌تر و چالاکتر و ڕەســەنترە . ئەم نیشــانەیە لە حــاڵەتی ڕاستەوخۆدا لە گشت بەشــە دیالێکــتەکانی کرمــانجی خــوارو[٥١] و ژوورودا[٥٢] ( لە چەند ناوچەیەکی کەمدا نەبێ ) بەدی دەکرێ .

(٥١) گومان لەوەدا نییە کە لە دیالێکتی کرمانجی خوارودا نیشانەی (ان)ی کۆ لــە حاڵەتی ڕاستەوخۆدا خۆی دەنوێنێ . ئەوەی جێی سەرسوڕمان بێ ، ئەوەیە کە ئی. ئا. سمیرنۆڤا لە لاپەڕە (١٥٨)ی کتێبی ناوبراودا ، وای داناوە کە لە بەشە دیالێکتی کوردی موکریدا تەنیا لــە حاڵەتی تیان ( غیر مباشر )دا بەرچاو دەکەوێ . بەڵام کەرەستەی بەردەســتی ئــەو بەشە دیالێکتە و هەندێ لە نموونەکانی نوسەر خۆی و وتاری ( دیسان دەبارەی فۆرمی ناوی کۆ لە زمانی کوردیــدا ، گۆڤــاری «نــوسراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژووی کولتوری گەلانی ڕۆژهەڵات » ، مۆسکۆ، ١٩٧٧ ، ل ٢٥٧ )ی مامۆستا قەناتی کوردۆ ... بەڵگــەی تەواون بۆ ڕەتکردنەوەی ڕای ئی. ئا. سمیرنۆڤا و سەلماندنی ئەوەی کە نیشــانەی ( ان )ی کۆ لە بەشــە دیالێکتی کوردی موکریدا بە ڕەوانی لــە حاڵەتی ڕاستەوخۆدا دێت .

(٥٢) هەندێ لە نوسەرانی کرمانجی ژوورو بە هەڵە کۆتایی ناویان لە حاڵەتی جوداوازی تیاندا بە نیشانەی کۆی ناو داناوە . بە وێنە مامۆستا جگەر خوێن (ێن ، ن ، ێد ، ێت )ی وەك نیشانەی کۆ باس‌کردووە ( بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٧ ) ؛ مامۆستا صادق بەهائەدین (ن ــ in )ی

**نیشانەی (ان)ی کۆ بە نیسبەت دیالێکتی کرمـانجی خـواروەوە ئاشکرا دیارە کە لە ناوچەی سۆران و بابان و موکریان ... زۆر باوە .**

بە نیشانەی کۆی ناو داوەتە قەڵەم ( بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٧٠ ) ؛ مامۆستا قەناتی کوردۆ لە کتێبی « گراماتیکا زمانێ کوردێ » ، یەریڤان ، ١٩٦٠ ، ل (٦٣ ــ ٦٤)دا (ێد ، ێ)ی بە نیشانەی کۆ ژماردووە؛ بەڵام لەو کتێبەدا کە ساڵی ١٩٥٧ بـە زمانی ڕۆسـی لە ژێـر نـاوی «دەستوری زمانی کوردی»دا بڵاوی کردۆتەوە (ل ٥٣ ــ ٥٦) ڕاسـتی هەڵکەوتی ئەو جۆرە نیشانانەی دیاری کردووە ...

بێگومان ، ئەو چەشنە نیشـانانەی لە سـەرەوە ناومـان بردن و هەندێکی تر ، وەك (نۆ ، نە ...) هەڵەیە بە نیشانەی کۆی ناو ، نـاو ببرێن ... نیشانەی کۆی ناو ئەوەیە کە لە باری ئاساییدا دەبینرێ ، نەك ئەوەی لە حاڵاتی جوراوجۆری ڕێزمانیدا کە گۆڕانی بە سەردا دێت. وەك ئاشکرایە ، ناو لە ڕستەدا گەلێك ئەرك دەبینێ و هەمەچەشن خۆی دەنوێنێ . جا ڕاست نییە کە کۆتایی هەمۆ بارێکی بە نیشانەی بـاری ئاسایی دابنرێ . بە وێنە ئەگەر ناو لە حاڵەتی ئیزافەی کۆدا بۆ ئـەوە لە زوربەی زۆری بەشە دیالێـکتەکانی کرمـانجی ژۆرۆدا نیشـانەی (ێد/ێت) یاخود (ێن)ی پێوە دەلکێ ، وەك :

**زولفێـد خـوە کرنـە پـایە ئەنـداز**

**دەسـتێد خـوە کرنـە فەرقێ پـەرواز**

( خانی ، ل ٢٠٤ )

**خورتێـن کـورد هۆزانێـن وەلاتـێ تـە**

**ئەڤـن ڕابـۆنە ژ شـاخ و لاتـێ تـە**

( جگر خوین ، ل ١٣٨ )

بێتۆ ناو لە حاڵەتی بانگهێشتنی کۆدا بێ ، ئەوە کۆتایی بە (نۆ/ێنۆ) دێت ، وەك (خورتنۆ/ینۆ هەڕن ). لە ڕستەی وەك (ئـەو سـوارن)دا ( ن ــ in ) جێناوی لکاوی کەسـی سێیـەمی کۆیـە لە حـاڵەتی مەفعولیدا . هەرچی (نە)یە بۆ دەربڕینی حاڵەتی کۆی ناوی نەنـاسراو بەکاردێ ... و هەندێکی تر .

لە دیالێکتی کرمانجی خوارۆدا حاڵەتی یەکەم ــ واتـە . حاڵەتـی

بۆ بەشە دیالێکتەکانی کرمانجی ژوورووش دەبینین کە لە ناوچەی بادینان[٥٣] و جەزیرە[٥٤] و بۆتان[٥٥] و کوردەکانی سوریا [٥٦] نیشانەی سەرەکییە • لە نێو زمانی کوردەکانی یەکێتی سۆڤیەتیشدا زۆر بەکار دەهێنرێ[٥٧] ،

ئیزافەی ناوی کۆ ، کۆتایی بە (انی) راستتر (ان + ی) دێت ، وەك : ( سوارانی کورد هاتن ) یاخود ( کچانی گوندی ئێمە چوون بۆ سەر کانی) . .

حالەتی دووەم ــ واتە حالەتی بانگهێشتن ــ کۆتایی بە (ینە) دێت ، وەك ( هۆ کوڕینە ئەوە چی دەکەن ) . . . جا نابێ ئەو جۆرە کۆتاییانە لەگەڵ نیشانەی حالەتی ڕاستەوخۆی ناودا تێکەڵ بکرێن .

(٥٣) بڕوانە : صادق بەهائەدین ئامێدی ، ڕێزمانا کرمانجی ، بەغدا ، ١٩٧٧، ل ٧٠ .

(٥٤) بە وێنە بڕوانە : بەرهەمەکانی مەلای جزیری .

(٥٥) بە وێنە بڕوانە : بەرهەمەکانی ئەحمەدی خانی . . . ئـەو نمونـەیەی خوارەوە مشتێکە لەو خەروارە :

تــە دوور کــرم ژ نــك هەڤــالان

مەهجــوور کــرم ژ ملــك و مــالان

( خانی ، ل ٤٨٦ )

(٥٦) بڕوانە : جگر خوین ، ئاوا ئو دەستورا زمانێ کوردێ ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ١٧ . (ئەم نوسەرە ژمارەیەك نیشانــەی بۆ کۆی نــاو ڕیزکردووە و «ان»ی لە پێش هەموویانەوە داناوە ) . هەروەهــا بڕوانە : بەرهــەمی ئەدەبی نوسـەرانی ئەو مەڵبەندە . . . ئەو نمونەیەی خوارەوەش یەکێکە لە صــەدان :

پشتی گەلــەك شــەڕ ، کوشتن و مــرن

ئــالا شــەڕ داخست خوە سپارت ترکان

( صەبری ، ل ٥٢ )

(٥٧) فۆلکلۆر و بەرهەمی ئەدەبی کوردەکانی سۆڤێت باشترین بەڵگەی ئــەو وتانەمانن . بە نمونە :

بەرتــل کەڤــران نــەرم دکە

( کوردۆ ، ل ٢٢٦ )

بەڵام هەندێ تایبەتێتی هەیە (٥٨) :

لە بەشە دیالێکتەکانی کوردی تورکمەنستان و ئازربایجاندا نیشانەی ناوبراو بە دوو شێوە دەبینرێ ــ (ان) و (ا) • هەرچی شێوەی دووەمە کورتکراوەی یەکەمە • شێوەی یەکەم پتر لە دووەم ــ واتە (ان) پتر لە (ا) ــ بەکاردەهێنرێ • لە بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستانیشدا هەردوو شێوە هەیە ، بەڵام لەمەدا شێوەی (ا) زیاتر لە کاردایە • هەرچی لە زمانی ئەدەبی (زمانی نوسینی کوردەکانی سۆڤێت)یشدایە تەنیا شێوەی (ا) باوە و (ان) بە هیچ جۆرێك بەدی ناکرێ •

لە بەشە دیالێکتەکانی کوردی سۆڤێت و زمانی ئەدەبییاندا نیشانەی (ان/ا)ی کۆ دەتوانێ بە هەموو ناوێکەوە بلکێ چ گیانلەبەر بێ و چ بێ گیان• حاڵەتی بیژۆك (شاذ) تەنیا ئەو ناوانەن ، کە واتایان ناتوانێ کۆ وەربگرێ ، وەك : (ڕۆن ، شیر ، توراغ ، هەوا ، شەکر ، بەفر ، ماست ، ئاو ، دۆ ، دۆکەڵ ، ئارد ، زێو ، گۆشت ، جۆ ، هەنگوین ، گەنم •••) • بەم وشانەوە نیشانەی ( ان/ ا ) نالکێ ، بەڵام لە حاڵەتی ئیزافەدا هێندێکیان دەتوانن شێوەی کۆ وەربگرن ــ واتە نیشانەی ئیزافەی کۆیان پێوە بلکێ ، وەك : ( ئاڤێد کانیان •••)

جوداوازی بەکارهێنانی نیشانەی ( ان/ا ) لە بەشە دیالێکتی کوردی تورکمانستان و ئازربایجان و هەروەها کوردی ئەرمەنستان و زمانی ئەدەبیدا لەوەدایە کە لە دوو بەشە دیالێکتی یەکەمدا وەك نیشانەی کۆی ناو

(٥٨) چەرکەزی بەکو (باکایێڤ) ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ٦٠ــ٦٥ •

لە حاڵەتی ڕاستەوخۆ و حاڵەتی تیـــاندا [٥٩] بەکار دێ • بەڵام لە بەشـــە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستان و زمانی ئەدەبیدا (ا) تەنیا وەك نیشـــانەی کۆی ناو لە حاڵەتی تیاندا خۆی دەنوێنێ • بە وێنە :

١ ــ لە بەشە دیالێکتی کوردیِ تورکمەنستان و ئازربایجاندا •

أ ) وەك نیشانەی کۆ لە حاڵەتی ڕاستەوخۆدا :

گۆلکا (ن) لە چەم دەرییێ دەچێرن

بزنا (ن) ژە پرا دەرباز بۆن

لەم جۆرە حاڵەتانەدا ــ واتە حاڵەتی ڕاستەوخۆ ــ لە بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستان و زمانی ئەدەبیدا ، ناو نیشانەی (ا) وەرناگرێ ، بەڵکو هەر وەك حاڵەتی تاك بێ نیشانە دەمێنێتەوە ، بەڵام واتای کۆ دەگەیەنێ ، وەك : (گۆلك ، بزن •••) • ئەم جۆرە بەکارهێنـــانە لە بەشە دیالێـــکتی تورکمەنستان و ئازربایجاندا زۆر باوە •

ب) وەك نیشانەی کۆی ناو لە حاڵەتی تیاندا :

برێ من بەرخا(ن) دەچێرینە

لاوێ تە لە بازاڕێ سێڤا(ن) دەفریشە

٢ــ لە بەشە دیالێکتی کوردیِ ئەرمەنستان و زمانی ئەدەبیدا :

**کەچکا کولیك بەرەڤ دکرن ، خۆرتا ژی بەرخ دشۆشتن •**

(٥٩) مەبەست لە حاڵەتی تیان ( غیر مباشر Oblique case ) ، ئەوەیـــە کە ناو لە حاڵەتی ئیزافە یاخود نیدا یاخود کارا ... دا نەبێ .

لە تەك نیشانەی (ان/ا)دا لە بەشە دیالێکتی کوردی ئازربایجاندا ، هەروەها نیشانەی (یدە ، ەدە ، نە ، ەنە)ش نیشانەی کۆن • لەمەدا لە بەشە دیالێکتەکانی دیکە و زمانی ئەدەبی جودایە • لەو کۆمەڵە نیشانەیەدا ، یەکەمیان زۆر بەکار دێ ، بەڵام سیانەکەی کۆتاییان زۆر کەم دەبینرێن • وەك :

**کەڤریدە ژە مامان دەکەڤن**
**ئێڤارە مە دیت ك سەچار کورەدە لە ناڤ مامان ڤەدەرکێتن •**
**لە ڤشتاغا مە دۆ بیست مالنە هەنە**
**من ژە تەرا ڤەلەمەنە ئانین**

لێرەدا پرسیارێك دێتە گۆڕێ : نیشانەکانی (یدە ، ەدە ، نە ، ەنە) لە کوێوە هاتوون ؟

لە بەشە دیالێکتی کوردی ئازربایجاندا لە حاڵەتی ئیزافەی کۆدا (یدە) دەبینرێ ، وە جێناوی کەسی سێیەمی کۆ هەر (یدە)یە • سەرنج و لێکۆڵینەوە ئەوە دەردەخەن ، پێشکەوتنی وای کردووە کە ببێتە نیشانەی کۆ ••• نیشانەکانی دیکەش هەر بەو جۆرە پەیدا بوون •[٦٠]

لە کۆتاییشدا سەرنج بۆ تایبەتییەکی گرنگی نیشانەی کۆ لە زمانی کوردیدا ڕادەکێشین ، کە ئەویش ئەوەیە :

لە کرمانجی خوارۆ و ژۆرۆشدا ئەگەر لە ڕستەدا دۆ ناو یاخود پتر

(٦٠) چەرکەزی بەکۆ لە کتێبی «زمانی کوردەکانی سۆڤێت» ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ٦٠–٦٥ دا لەو تایبەتیانە دواوە . بۆ ئەم مەبەستە سۆدێکی زۆرم لە سەرچاوەی ناوبراو وەرگرتووە .

بە یاریدەی (و)ی پەیوەندیی پێکەوە بەسترابن ، ئەوە دوا ناویان نیشانەی کۆ وەردەگرێ ، بەڵام لە ناوەڕۆکدا پەیوەندیی ئەو نیشانەیە ، هەروەهـا بۆ ناوەکەی سەرەتا ــ واتە یەکەم ــ یش دەگەڕێتەوە ، وەك :

**قـــاز و قولنـــگان هـــاتنە خـــوارەوە**

**قیـــژ و هۆڕیـــانە بـــە ســـەر شـــارەوە**

( پیرەمێرد ، ل ١٤٩ )

**زولـــا ئـــاغـــا و بـــەگان خویـــا بـــۆ**

**بـــەرێ مـــە د گـــۆت تـــە دگۆ نـــا ، هەڤـــال**

( جگر خوین ، ل ١٣٦ )

**نیشانەی نموونەکان***

١ ــ ( بێکەس )

دیوانی بێکەس ، محەمەدی مەلا کریم ڕێکی خستووە و سەرپەرشتیی لە چاپدانی کردووە • بەغدا ، ١٩٧٠ •

٢ ــ ( پەندی پێشینان )

پەندی پێشینان ، کۆکردنەوەی شێخ محەمەدی خاڵ ، چاپی دووەم ، ١٩٧١ •

---

* بۆ سەلماندن و چەسپاندنی ئەو دەستوورە ڕێزمانییانەی لێیـان دواوم ، بە زۆری لە کەرەستەی فۆلکلۆر و ئەدەبـەوە نموونـەم هێنـاوەتەوە و کردوومنەتە بەڵگە . بێ گومان ئەم جۆرە ڕێبازەش پتر شێوازی زانستیی دەداتە لێکۆڵینەوەی زمان ...

بۆ هەر نموونەیەك کە هێناومەتەوە ، سەرچاوەکەیم دیاری کردووە . بەڵام لەبەر کەم داگیرکردنی جێگە و دووپات نەبوونەوە ، نیشانەم بۆ داناون. جا لێرەدا ناونیشانی تەواویان دەنووسم .

٣ ــ ( پیرەمێرد )
پیرەمێردی نەمر ، محەمەد ڕەسوڵ هاوار ، بەغدا ، ١٩٧٠ •

٤ ــ ( جزیرێ )
دیوانا مەلایێ جزیرێ ، تویژاندنا صادق بەهائەدین ئامێدیێ بەغدا ، ١٩٧٧ •

٥ ــ ( جگر خوین )
جگر خوین ، سەورا ئازادیێ ، شام ، ١٩٥٤ •

٦ ــ ( خانیێ )
ئەحمەدی خانێ ، مەم و زین ، ئەستەمۆل ، ١٩٦٨ • م• بۆزئەرسەلان لە چاپی داوە •

٧ ــ ( زێوەر )
دیوانی زێوەر ، بەغدا ، ١٩٥٨ •

٨ ــ ( صەبرێ )
عوسمان صەبرێ ، باهۆز و چەند ڤیسارێن دن ، شام ، ١٩٥٦ •

٩ ــ ( فۆلکلۆر )
فۆلکلۆری هۆزاوەکانی کوردەوارێ ، کۆکردنەوەی محەمەد کەریم شەریف ، کەرکوك ، ١٩٧٤ •

١٠ــ ( کوردۆ )
کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردێ ، پڕۆفیسۆر قەناتی کوردۆ لە زاری کوردەکانی سۆڤێتەوە تۆماری کردووە • شوکور مستەفا و ئەنوەر قادر هێناویانەتە سەر ڕێنوسی کوردێ ، بەغدا ، ١٩٧٦ •

١١ــ ( گۆران ، ب )
گۆران ، بەهەشت و یادگار و فرمێسك و هونەر لەگەڵ دوو هاوینە گەشت ، سلێمانی ، ١٩٧١ •

١٢ــ ( لە خەومــا )
جەمیل صائب ، لە خەوما • پێشکەش کردن و لێکۆڵینەوەی جەمــال بابان ، بەغدا ، ١٩٧٥ •

١٣ــ ( مەحوی )
دیوانی مەحوی • لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی : مــەلا عبدالکریمی مدرس و محمدی مەلا کریم ، بەغدا ، ١٩٧٧ •

١٤ــ ( مەسەلەی ویژدان )
ئەحمەد موختار جاف ، مەسەلەی ویژدان • پێشەکی و لێکۆڵینەوە : د• ئیحسان فوئــاد •

١٥ــ ( نــالی )
دیوانی نالی • لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی : مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم ، بەغدا ، ١٩٧٦ •

# سەرچــاوە

## بە زمانی کوردی

(١) ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ •
(٢) ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، هەوڵێکی سەرەتــایی بۆ دۆزینــەوەی نیشانەکانی ناسیاوی و نەناسیاوی لە دیالێکتی کرمانجی خوارودا ، «گۆڤاری زانکۆ» ، ب ٣ ، ژ ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٧ ، ل ١٢٢ــ١٦٦ •

(٣) تەوفیق وەهبی ، دەستـــوری زمانی کوردی، جیزمی یەکەم، بەغدا ، ١٩٢٩ •
(٤) جگر خوین ، آوا ئو دەستورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ •
(٥) جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتوی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ •
(٦) ڕەشید عومەر دزەیی ، چەند سەرنجێکی زمـانەوانی ، ڕۆژنامــەی «هاوکاری» ، ژ ١٥ ، بەغدا ، ١٩٧٤ •
(٧) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بە پێی لێکۆڵینەوەی لیژنــەی زمــان و زانستەکانی کۆڕ ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغــدا ، ١٩٧٥ ، ل٣٩٨ـــ٤٩٦ ، ب ٣ ، ژ ٢ ، بەغــدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٤١ـــ٣٥٨ ، ژ ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٨٩ـــ٤٠٠ •••
(٨) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بە پێی لێکۆڵینەوەی لیژنــەی زمــان و زانستەکانی کۆڕ ، بەغدا ، ١٩٧٦ •
(٩) سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ •
(١٠) صادق بەهائەدین ئامێدی ، ڕێزمانا کرمانجی ، بەغدا ، ١٩٧٦ •
(١١) صەباح غالب ، کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی لەبــەر تیشـــکی لێکۆڵینەوەدا ، ڕۆژنامەی «هاوکاری» ، بەغدا ، ١٩٧٦ ( ئەم زنجیرە وتارەی مامۆستا صەباح غالب کە لە چەند ژمارەیەکی «هاوکاری»دا بڵاوکراوەتەوە ، ئەو بەشەی لەم وتارەدا لێی دواوین ، پەڕێنراوە ••• بەڵام نوسەر دەستنوسەکەی بۆ کۆڕ ناردووە و ئێمەش کردومانەتــە سەرچاوە ) •
(١٢) قەناتێ کوردۆ ، گراماتیکا زمانێ کوردی ، یەریڤان ، ١٩٦٠ •
(١٣) قەناتێ کوردۆ ، زمانێ کوردی ، یەریڤان ، ١٩٧٠ •

(١٤) عەبدولڕەحمان محەمەد ئەمین زەبیحی ، قــامۆسی زمــانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٧ .
(١٥) عەبدوللا شالی ، د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ ، د. ئەمین عەلی ، نوری عەلی ئەمین ، فەرەیدوون عەلی ئەمین ، عەلائەدین ســەجادی ، کەمال مەحمود فەرەج ، ئەبوزەید مستەفا سەندی ، زمان و ئەدەبی کوردی ، بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .
(١٦) محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ .
(١٧) نوری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .
(١٨) نوری عەلی ئەمین ، قواعدی زمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەغدا، ١٩٥٦ ؛ بەرگی دووەم ، بەغدا ، ١٩٥٨ .

### بە زمانی ڕۆسی

(١٩) ئۆ. س. ئاخمانۆڤا ، فەرهەنگی زاراوەکانی زمان ، مۆسکۆ، ١٩٦٦.
(٢٠) ك. ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤــا ، دیــالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ .
(٢١) چ. خ. باکاییێف ، زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکو ، ١٩٦٥ .
(٢٢) چ. خ. باکاییێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤیێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ .
(٢٣) ڤ. س. ڕاستۆرگویێڤا ، زمانی فارسی ناوەڕاست ، مۆسکۆ، ١٩٦٦.
(٢٤) ئا. ئا. ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .

(٢٥) ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، شێوەی ژمارەی ناو لە زمـانە ئێرانییەکانـدا ، لێنینگراد ، ١٩٧٤ .

(٢٦) ق. کوردۆ (کوردۆییڤ) ، دەستوری زمانی کوردی ، مۆسـکۆ ـ لێنینگراد ، ١٩٥٧ .

(٢٧) ق. کوردۆ (کوردۆییڤ) ، دیسان دەربارەی فۆرمی ناوی کۆ لـە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری «نوسراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژوی کولتوری گەلانی ڕۆژهەلات» ، مۆسکۆ ١٩٧٧ ، ل ٢٥٦ـ٢٥٩ .



## ملخص المقال

# جمع الاسماء في اللغـــة الكردية

الدكتور عبدالرحمن معروف

يعرض كاتب البحث في بداية موضوعه الدراسات التي كتبت بشـــأن جمع الاسماء في اللغة الكردية ويقومها ، ثم يبـــين ان الاعمال التي انجزت في هذا المجال لايخلو معظمها من اخطاء ونواقص وثغرات ، فضلا عن انها لـــم تتطرق الى العديد من جوانب الموضوع ولم تســـلط الاضواء الكافية عليها ولذلك فانها لم تحرز نجاحات كافية •

وبغية الولوج في الموضوع ولابراز خصائص كل لغة في التعبير عـــن مفهوم الجمع ، فقد قام كاتب البحث بجولة سريعة بين بعض من اللغات الاجنبيه ذات الجذر الواحد مع اللغة الكردية وابرز اختلاف صـــور الجمع في هذه اللغات ، واعار اهتماما خاصا للغة الفارسية الوسطى والفارسية الحديثـــة وبعض اللغات الايرانية ، كمدخل للحديث عن اصل علامة (ان) بوصفهـــا العلامة الاساسية والاصلية للجمع في اللغة الكردية •

وبعد ان يمهد الكاتب الارضية لبحثه بهذه المقدمات ، يبدأ بالحديـــث عن جمع الاسماء في اللغة الكردية •

تحدث في البداية عن علامة (ان) وحدد صورتها الصحيحة في الالحاق

بمختلف انواع الاسماء من حيث اختلاف اواخرها وما اذا كانت حروفا صحيحة ام حروف علة او اي حرف من حروف العلة كانت •

ثم قام بتحقيقات في علامات اخرى للجمع هي (ات ، ەها ، گەل) • وهكذا فقد اوضح صاحب المقال ان (ان) هي العلامة الرئيسة للجمع في اللغة الكردية ، وان (ات) و (ەها) و (گەل) تشكل علائم للجمع من المرتبة الثانية • ثم تحدث عن طرق اخرى لاداء معنى الجمع ، فافاض الحديث عن الحالات التي يؤدى فيها مفهوم الجمع لا من خلال علائمه وانما عن طرق اخرى •

هذا كله بالنسبة للهجة الكرمانجية الجنوبية • اما بالنسبة للكرمانجية الشمالية فقد بذل محاولات لالقاء الضوء على اوجه الالتقاء بينها وبين اللهجة الكرمانجية الجنوبية في هذا المجال •

وفي ختام بحثه لفت كاتب البحث الانظار الى بعض خصائص جمع الاسم في اللغة الكردية •

وقد اعتمد الباحث لاعداد هذا الموضوع على ٢٧ مصدرا كرديا وروسيا، كما أفاد من ١٥ كتابا من وثائق الفولكلور الكردي ودواوين الشعراء ، وذلك للاتيان بالامثلة والشواهد اللغوية التي يبرهن بها على صحة ما ذهب اليه •



# شارۆیەک لە باخچەی ئەدەبی مەولەوی

محەممەد عەلی قەرەداغی

## پێشـــەکی

ئەگەر زنجیرەی ناو و ڕێز بۆ ئەوانە بگیرێت کە لە مەیدانی توانای خۆیاندا کاریان کردوە و ، وەك دەڵێن «نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەساب» یـان « کاڵا بـە قەد باڵا » لـە کاری ئـەواندا هاتوەتـە جێ ، دەبێ مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس ــ زیاد لە هەمو کارە بەنرخەکانی‌تری ــ لە لێکۆڵینەوەی ( دیوانی مەولـەوی )دا لـە ڕزی هــەرە پێشـــەوە جێگەی بۆ دیاری بکرێت ؛ چونکە مامۆستا زیاد لە هەمو توانا و زانستی و شارەزایی و ئەدیبی خۆی ••• بێ ئەوەی خۆیشی ــ لە ســەرەتاوە ــ هەستی پێ بکات زەمینەیەکی تایبەتی بۆ دیوانی مەولەوی بۆ گونجا و ، ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو زەمینەیە خۆشتر دەبو •

مامۆســتای مودەڕڕیس سەرەتای ژیانی مامۆســتایی ــ جگە لـە ماوەیەکی کەم ــ لە ( بیارە )وە دەستی پێ کرد و ماوەیەکی باش لە بیارە لە ناو کۆڕی صــۆفی و موریدانی طەریقەی نەقشبەندیدا هەڵســاوە و دانیشتوە ، ئەو کۆڕەیش هەمیشـــە جمەی هاتوە لەو پیاوانە کە زۆر لـــە

هۆنراوە و قسە و باسی مەولەوییان لە بەر بوە و موناسەبەی زۆری شیعرەکانییان زانیوە و ، مامۆستا ویستبێتی یان نەیویستبێ زۆر جار خۆی لە کۆمەڵی باسی مەولەویدا دیوەتەوە و گوێی بە دەنگی بەسۆزی موریدان و شیعرە بە تینەکانی مەولەویّ زرنگاوەتەوە و موناسەبە و حیکایەتیان لە گەڵ شی‌کراوەتەوە• مامۆستایش ــ وەك خۆی دەفەرموێ ــ هەرچەند لە سەرەتاوە خەیاڵی ئەوەی لە کەللەدا نەبوە دیوانی مەولەویّ بکات بە کتێب •• شیعری مەولەویّ بۆ خۆی نوسیوەتەوە •[1] تا دوایی ئەو کارەی کە لەو سەرەتاوە جۆگەی بۆ هەڵگیراوە بوە بەو کارە گەورە و ئەو دیوانە فراوان و بە نرخەی لێ پێکهاتوە کە لە ساڵی ١٩٦١ی‌زدا لە بەغدا لە چاپخانەی (النجاح) چاپکرا و چاوی خوێنەری کوردی پێ رۆن بوەوە •

لێرەوە دەتوانین بڵێین ئەم کارەی مامۆستا بەتەمەن‌ترین پرۆژەی ئەدەبی کوردییە کە گەلاڵەکردن و بەدیهاتنی نزیکەی (٣٠) ساڵێکی خایاندبێت •

دیوانی مەولەویّ مامۆستا مەلاعەبدولکەریم بە یەکەم کاری رێك و پێکی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردیّ دەژمێردرێت و تا ئەو کاتەی ئەو دیوانە دەرچوە نمونەی لە کتێبخانەی کوردیدا نەبوە •

منیش ماوەیەك قوتابی مامۆستای مودەڕڕیس بوم و سودم لەو سەرچاوە بێ پەیی و بێ سنورە وەرگرتوە ، زیاد لەوەی لە دەرس‌خوێندن و فێربونی زانیاریدا کەڵکم لە مامۆستا وەرگرتوە گەلێ لە دانیشتن لە خزمەتیا و بەشداربونی کۆڕی ئەدەبی ئەودا بەهرەمەند بووم ؛ چونکە

(١) بڕوانە : مەلا عبدالکریمی مدرس ، دیوانی مەولەویّ ، چاپخانەی ( النجاح ) بغدا ، ١٣٨٠ ھ ١٩٦١ م ل : (د) ، پێشەکی .

دانیشتن لە خزمەت مامۆستادا و گوێ گرتن لە فەرمایشتە بە نرخەکانی جۆرە خوێندنێکی ترە و تام و چێژێکی تایبەتی خۆی هەیە .. گەلێ جار وا بوە لە خزمەتیدا دانیشتوم شیعرەکانی مەولەوی بە سۆزێکی خۆشەوە خوێندوەتەوە و ، بێ پەروا هۆنە هۆن فرمێسك لە چاوەکانییەوە جۆگەلەی بەستوە و ریشە سپییە جوانەکەی تەڕ کردوە .. ئەو دانیشتنانە و ئەو سۆزە بە تینانە شەیدای مەولەوی و شیعری مەولەوییان کردم و ، بە زۆرەملێ خۆم بە سەردا دەبڕین ، کاتێ وا هەبو ماوەیەکی زۆر لەگەڵ قەسیدەیەك خەریك دەبوم ئەوسا شتێکم لێ هەڵدەکڕان .

هەر بەوەی کە شەیدای جیهانی ئەدەبی مەولەوی بوم هەر باسێك یان شیعرێکی چاپنەکراوی مەولەویم بیستبێ لە سوچێکدا توسیومە . وە تا زیاتر لەو دیوانە ورد بومەتەوە زیاتر بۆم رۆن بوەتەوە جیهانی مەولەوی جیهانێکی تایبەتییە و ، هێشتا ڕێزی خۆی لێ نەگیراوە و ، گەلێ لەوە زیاتر هەڵدەگرێت کە تا ئێستە بۆی کراوە . لە ئەنجامی ئەو سەرنجدانانەشمەوە بۆم دەرکەوتوە کارەکەی مامۆستا لە گەڵ ئەو هەمو نرخەیدا و لە گەڵ ئەوەشدا کە بە هەمو بڕوایەکمەوە دەڵێم : ئەو کارە بە مامۆستا نەبوایە بە کەس نەدەکرا .. هێشتا کاروانی شیعر و ئەدەبی مەولەوی نەگەیاندوەتە دوا قۆناغ و زۆری بە بەرەوە ماوە . خۆ ئەگەر بلوێ و دو سێ دەسخەتی جۆرا و جۆری دیوانی مەولەوی دەست بکەون و لە گەڵ چاپەکەدا بەراورد بکرێن ئەو کاتە هەست بە گەلێ جیاوازی و ئاڵۆزی دەکرێت کە مامۆستا کەرەسەی ئەوەی نەبوە ئەو ئاڵۆزییانە ساف و ڕێك بکاتەوە . پاش ئەو بەراوردانەیش دەتوانین شێوەی ئەو ئاڵۆزییانە و هۆی پەیدابونیان لە چەند خاڵێکدا دیاری بکەین .

**١ـ شێوە و جۆری ئاڵۆزییەکان :**

أ ــ زیاد لەوەی گومان لەوەدا نیە کە مــامۆستا هەمۆ شیعــرەکانی مەولەوێ بۆ کۆنەکراوەتەوە ، کاتی وا هەیە شیعری شاعیرێکیتر بۆ مەولــەوێ نوسراوە و بەو جۆرە لە دیوانەکەیشدا بۆ مەولەوێ تۆمار کراوە •

ب ــ جاری وایش هەیە یەك پارچە شیعر بەش بەش بوە و ، بە پرژ و بڵاوێ لە ناو دیوانەکەدا چاپ بوە •

ج ــ جێگای وەهایش رێك دەکەوێت کە دۆ سێ پارچە تێکەڵ دەبن و بە یەك پارچە چاپ دەکرێن •

د ــ وەختی وایش هەیە شیعرێك یان دۆ شیعر لە نــاو پارچــەیەکی دیوانەکەدایە کەچی هەر ئەو شیعرە جارێکی تر هەر لە دیوانەکەدا بە ناوی ( فەرد ) یان ( روباعێ ) چاپ بوەتەوە • (٢)

**٢ـ هۆی ئەم ئاڵۆزییانە :**

أ ــ هۆیەکی سەرەکێ ئەم ئاڵۆزییانە ئەوەیە : تا ئێستە نوسخەیەکی دەسخەتی شاعیر ــمەولەوێـ خۆی یان نوسخەیەکی باوەڕپێکراو کە لە بەر دەسخەتی شاعیر نوسرابێتەوە دەست نەکەوتوە و ، ئەو کەشکۆڵ و دیوانانەیش کە تا ئێستە دەستکەوتۆن لەملا و لەولا کۆکراونەتەوە و دەماودەم لەمولەو وەرگیراون ، کەم و زیــاد و تێکەڵاوییان بەسەر هاتوە •

ب ــ هۆیەکی تر ئەوەیە مەولەوێ هەمۆ شــیعرەکانی لەســەر یەك

---

(٢) نمۆنەی ئەم خاڵانە لەم باسەدا دەخوێنیتەوە .

کێشن و ، وەکو شاعیرانی تر سوودی لە کێشەکانی عەرووزی وەرنەگرتوە •

ج ــ پەیڕەوی قافییەیەکی تایبەتی لە یەك قەسیدەدا نەکردوە •

د ــ سەرەتای دیاری و تایبەتی بۆ قەسیدەکان بەکار نەهێناوە و نازانری سەرەتای قەسیدەکە کامەیە •

هـ ــ لە کۆتایی قەسیدەکانیەوە ــ کەم جار نەبێ ــ نازناوی خۆی نەوتوە •

جا خوێنەرێك تۆزێ ــ بە ئینصافەوە ــ سەرنجی ئەم هۆیانە بدات دەزانێت مامۆستا مەلا عەبدولکەریم هیچ خەتایەکی لە ئالۆزی و تێکەڵاوی شیعرەکاندا نیە و ، ئەو چی لە دەست هاتوە ــ بێ درێغی ــ کردویە و ئەو دیوانە رەنگینەی پێشکەش کردوین • دوای ئەوە ئەرکی سەر شانی رۆشنبیرانی کوردە و ئەمانەتی ئەدەبییە لە ئەستۆیاندا ، وەك مامۆستا لە پێشەکی دیوانەکەیدا دەفەرموێ ، هەر شیعر و باس و موناسەبەیەکی تازەی سەر بە مەولەوی و دیوانەکەیان زانی بیگەیەننە جێگەی خۆی •

منیش لەو چاوەوە ــ چاوی ئەمانەتی ئەدەبی گەیاندن بە جێگەی خۆی ــ ماوەیەکی باش خۆم بە دیوانی مەولەوییەوە ماندو کردوە و ، چەند جار ئەمسەرە و سەری دیوانەکەم کردوە و ، شیعرەکانیم لە گەڵ کەشکۆڵ و دەسخەتدا بەراورد کردوە ، بە تایبەتی کاتێك لەم ماوەدا دەسخەتێکی کۆنی دیوانی مەولەویم دەست کەوت (٣) و گەلێك جیاوازی و زانیاری بە نرخی ــ جگە لە هەندێك شیعری بڵاونەکراوە ــ تێدایە و ،

(٣) لەمەودوا هەندێك باسی ئەو دەسخەتە پێشکەش دەکەم .

وێنەی کەشکۆڵی مەلا فەتاحی کاگردەلیشم لایە (٤) کە ئەویش لە عاستی خۆیەوە سەرچاوەیەکی باشی لێکۆڵینەوەی دیوانی مەولەوییە • ئەنجامی ئەو بەراوردانە ئەم باسە بچکۆلەیە لێرەدا وەك مەلۆیەك دەخەمە سەر خەرمانی ئەدەبی مەولەوی •

## باسێکی دەسخەتەکەی دیوانی مەولەوی

ماوەیەك لەمەوپێش دەسخەتێکی پەڕەپەڕە و پەرپوت و تێکەڵ و پێکەڵم دەست کەوت ، ماوەیەکی زۆری زەحمەت دام تا توانیم هەندێك یەکی بخەمەوە و سەر و بەری بنێم • ئەم دەسخەتە وا دەردەکەوێ کاتی خۆی زۆر بە رێکی نوسراوەتەوە و نوسەرەکەی گەلێ بە تەنگیەوە هاتوە و، زۆریش شەیدای شیعری مەولەوی بوە و بە سۆزەوە خوێندویەتیەوە • لە ژێر گەلێ شیعردا وشەی رێز و نرخاندنی شیعرەکانی نوسیوە ، وەك دەڵێ: « ئەی رەحمەت بە قەبرت لە گەڵ بەیتت » • ( ل : ٧٩ ، م ) وە :«ئەی بێسارانی قەبر هەڵتەکێنی ! » • ( ل : ١١٥ ، م )یان : « بەخ بەخ »یان : «هەتا خوار چلۆنە مەرگی من ؟» یان : «هەی هاوارمە !» یان : «نازك بەیت» یان : «سوبحانەڵلا لەم بەیتە ! » یا « ئەڵلاهو ئەکبەر لەم بەیتە ! » یان :«تێفکرە چە حەشرێ دەکا» (ل : ١١٧ و ١١٨ ، م) هەروەها بەم پێیە لە گەلێ جێگەدا ئاوا دەنوسێت •

ئەم دەسخەتە سەرەتاکەی ماوە و نوسەر وێنەیەکی تێداکردوە و لە

---

(٤) لە ژمارە (١٢ ــ ١٣)ی پاشکۆی رۆژنامەی (عێراق)دا باسی مەلا فەتاح و کەشکۆلە رەنگینەکەیم کردوە ، هەروەها لە پێشەکی دیوانی (وەفایی)شدا لە سەر ئەم باسە رۆیشتوم ، بۆیە لێرەدا بە پێویستی نازانم جارێکیتر باسی ئەم کەشکۆلە بکەمەوە .

ناویا ــ جگە لە (بسم اللە الرحمن الرحیم) ــ نوسیویە : (کلام مولوی) • دوای ئەوە پارچەکەی (ضاد)ی چاپەکە دەست پێ دەکات • کۆتاییـەکەی نەماوە ، لە ناوەوە لە (٥) جێگەدا نوقسانی تێدایە و رەنگە بە شێکی زۆری لەناوچوبێت ، وا دیارە دیوانی هەمو شیعرەکانی مەولەوی بوبێت ، بـەڵام بەخت ئەیبڕیوە ئەو دیوانە بە ساغی بمێنێتەوە و ، دەست بەڵای ناگەهان و، دەم مشك و مۆرانەی بێ ویژدان کەوتوە • لە چەند جێگادا مشـك لـە ناوەڕاستی لاپەڕەوە لێی خواردوە ، لە چەند لای ترەوە سەر و گوێلاکی لاپەڕەکان لە ناو قوڕ و چڵپاوی دڵۆپەدا پتورکاوە •

ئەوەی کە ماوەتەوە (١٣٠) لاپەڕەیە ، هەر لاپەڕەیەکی (٨) شـیعری تێدایە ، بەشی زۆری شیعری مەولەوییە ، لە یەك دو جێگەدا شیعری (وەلی دێوانە) و (ئەحمەد بەگی کۆماسی) و (شێخ حەسـەنی مەولانـاوایی) و ( کاکە ئەحمەدی مەجذوب )ی تێدایە[٥] • دەسخەتەکە بە شێوەی (بەیاض) نوسراوەتەوە ، پانایی لاپـەڕەکانی (١١) سانتیمـەترە و درێژیشـی (٢٠)

(٥) ئەمە زیاد لەوەی شیعری (بولبول) و (نظام) و .. ئەوانـەی تر کە لـە دیوانەکەدا هەیە و منیش باسم نەکردون .

**تێبینی :** لە بەر ئەوەی رەنگە وشەی (شارۆ) لە «شارۆیەك لە باخچەی ئەدەبی مەولەویدا » سەروتاری ئەم باسە لە گوێی هەندێك لە خوێنەرانـدا جۆرە نامۆییەکی هەبێت دەڵێم : شارۆ : ئەوەیە کە پاش ئەوەی باخەوان باخی هەنار و میوەی خۆی دەڕنێت و بە خەیـاڵی خۆی هیـچی پێـوە ناهێڵێت .. خەڵکی تر ــ بە تایبەتی منداڵ ــ قەڵەنگی درێژ دروسـت دەکەن و بە ناو باخەکەدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی ئەگەر هەناری دەمتەڕەك و، قاوخی شەمشەمەکوێرە خواردو و ، هەنـاری بچکۆلـەی سـەر لقەبەرزەکان و ناو دۆلقەکان بدۆزنەوە . دایانبگرن ، بەو کارە دەوترێت: «شـارۆ» . لێرەوە دەردەکەوێـت بـۆچی ئەو وشـەم بۆ سـەروتار هەڵبژاردوە .

ساتتیمەتر • مێژوی نوسینەوە و ناوی نوسەری نازانرێ •

## رێنومایییەك بۆ خوێنەری ئەم باسـە

١ ــ دەبێ پێش هەمو شت ئەوە بە خوێنەر بڵێم کە ئەم بـاسە تێکڕای جیاوازێ نێوان ئەو دو دەسخەتە و دیوانە چاپەکە ناگرێتـەوە ؛ چونـکە تەواوی ئەو جیاوازییانە لە وزەی باسێکی وا بەدەرە و کات و دەرفەتێـکی لەمە فراوانتری دەوێت • لە هەموان رونە کە دو سێ دەسخەتی جـۆرا و جۆری چەند نوسەر لەوانە نیە لە هەمو رویەکی نوسینەوە یەك بگەرنەوە ، بەڵکو کاتی وا هەیە ئەم دێڕێك بە شێوەیەك دەنوسـێت ، ئـەوی تر بـە جۆرێکی تری بۆ دەچێت ، یان وەری دەگرێت • جا من نەمتوانیوە لەو هەمو جیاوازییانە بدوێم •

وەك دەبێ ئەوەش لە خوێنەری ئازیز نەشارمەوە کە ئەم باسەی مـن تەنها نوسین و کۆکردنەوەی ئەو زانیارێ و باسە تازانەیە بێ لێکۆڵینەوەی ورد لە سەریان ، یان چونە بنجوبنەوانی هەمـو باسێك و دەرخستنی روی راستێ ئەو باسە ؛ چونکە دوبارە ئەمەش هـەر زۆر ، بەڵـکو زۆرتـری دەوێت •

٢ ــ لەم نوسینەدا لە ژێر هـەر باس و موناسـەبە و شیعرێـکەوە شوێنەکەیانم لە دەسخەتەکاندا دیارێ کردوە ، کاتێك نوسیومە :

(ل : ٤٠ ، م) مەبەستم لاپـەڕەی (٤٠)ی دەسخـەتەکەی دیـوانی مەولەوییە کە پێشتر هەندێك باسم لێ‌کرد • وە کاتێك نوسیومـە : ( ل : ٤٥٠ ، ف) مەبەستم لاپەڕە (٤٥٠)ی کەشکۆلی مەلا فەتاحی کاگردەڵییە ،

وە لە هەر جێگەیەکدا هەردوێ ئیشارەکەم نوسیبێت مانای وایە ئەو مەبەستە لە هەردوێ دەسخەتەکەدا هەیە •

٣ ــ بۆ رێگەکورتکردنەوە ئیشارەم بۆ ژمارەی پارچــە و پیــتی سەرەتای قەسیدەکانی دیوانەکە کردوە و ئیتر لە پــەراوێزەوە ژمــارەی لاپەڕەم نەنوسیوە ، چونکە بە زانینی پیتی سەرەتا و ژمارەی پارچــەکە لاپەڕەکەش دەزانرێت • زیــاد لەوەی چاپێکی دوهەمی دیوانی مەولەوێ مامۆستا مەلا عەبدولکەریم هەیە کە سەیدیان چاپی کردوەتەوە ، زنجــیرەی لاپەڕەکانی تێکداوە ، بەڵام زنجیرەی پارچەکانی تێــك نەداوە هەندێــك دوربینێ ئەوەیشم کردوە کە لاپەڕەم نەنوسیوە •

٤ ــ ئەو باس و موناسەبانەی لە سەر پارچە شیعرەکان نوسراون بە زۆرێ بە فارسین ، من جێگا کەمەکانم راستــەوخۆ وەرگێڕاوەتــە ســەر کوردێ ، بە تایبەتێ موناسەباتەکانی (ف) ئەوانی تر تێکستەکەم لە سەرەوە نوسیوە و لە پەراوێزەوە تەرجەمەکەیم نوسیوە •

٥ ــ زنجیرەی باسەکەم بەم شێوەیە :

أ ــ دوای پێشەکێ ، شیعرەبڵاونەکراوەکانی مەولەوێ •

ب ــ موناسەباتەکانی (میم) ــ م ــ •

ج ــ موناسەباتەکانی (فێ)ــ ف ــ •

د ــ جیاوازییەکانی ــ م ــ •

ه ــ جیاوازییەکانی ــ ف ــ •

٦ ــ وەك باسم کرد جگە لە شیعری مــەولەوێ لە نوسخــەی (م)دا

شیعری چەند شاعیرێکی تریش وەك (ئەحمەد بەگی کۆماسی) و ( شێــخ حەسەنی مەولاناوایی) و (وەلی دێوانە) (٥) ... هەیە ، هەرچی وەکو وەلی دێوانەیە شیعرەکانی چاپکراون و هاوچەرخی مەولەویــش نەبوە تــا بڵێین موناسەبەیەك لە گۆڕێدا بێت، بەڵام چونکە (ئەحمەد بەگ) و (شێخ حەسەن) هاوچەرخی مەولەوی بوون نامەیان بە شیعر بۆ یەکتر نوسیوە و ، رەنــگە ئەو شیعرانە بە موناسەبە کەوتبنە ناو ئەو دەسخەتە و ، لە بــەر ئەوەیــش نوسینیان لێرەدا زیندوکردنەوەی بەرهەمی ئەو شاعیرانەیە .. دوای شیعرە بڵاونەکراوەکانی مەولەوی ئەو شیعرانەی تریش دەنوسین و ، زنجیرەکە بەم شێوە دەبێت :

أ ــ شیعرە بڵاونەکراوەکانی مەولەوی .

ب ــ شیعرە بڵاونەکراوەکانی ئەحمەد بەگی کۆماسی .

جـ ــ شیعرە بڵاونەکراوەکانی شێخ حەسەنی مەولاناوایی .

## شیعرە بڵاونەکراوەکانی مەولەوی

**ــ ١ ــ**

**واچەیَ چە وەعدەی نشینگەی تەنگەن ؟ (١)**
**یاران چەمەڕا ، برا دەرەنگەن !**

---

(١) ئەم پارچەیە لە (م)دا پارچەیەکی درێژە و ، بەو شێوە لە دیوانە چاپەکەدا نیە . لە دیوانە چاپەکەدا پاش گەڕانێکی زۆر ئەم شیعرانەم دۆزیەوە کە لێرەدا دیاریان دەکەم :
أ ــ شیعری یەکەمی ئێرە وەك شیعری پێنجەمی پارچەی (٢)ی (پێ) وایە.
ب ــ لە شیعری دۆهەمەوە تا شیعری پێنجــەمی بە پارچــەی (٢٩)ی (ئەلف) چاپکراوە .
جـ ــ شیعری شەشەمی ئێرە بە تاك لە ژێر ژمارە (٣٦)ی (ئەلف)دا چاپ کراوە .

ئاخ ئاخ ! جە چراخ ، ئاخ پەی داخداریٚ
چون من خاطر خار خەمبار داخداریٚ

بشیای وە سەیر سەر سەرا و چەمەن
جە ئەو ( چراخم ) جە چەمەن جەمەن

نالەمان کەردا چەنی بولبولان
چەنی ئێش سەخت سفتەکەی دلان

تا جە قەفەسدا ماما نەفەسیٚ
ئەوان پەی گولان ئێمەیچ پەی کەسیٚ

ئەیهۆ چەند سەر چنگ چەرخ چەپوەردم
چەرخ چەند چەرخیا من مام نەمەردم

یە گەردوٚن مەدام گەردەلوٚلشەن
دلداران دلدان های چەند توٚلشەن !

ئالەم بەرکەنار ، وێم بە حاڵ وێم !
ئای گیان سەخت بیم چەند چەرخش دا پێم !

ئەووەڵ بارخانەی بەدبەختیش ئاوەرد
هەر وێم مزانوٚم چوٚن باربەندیش کەرد

مجری و مەحفەرەش کەیل نە شادیٚ پڕ
وە بار ئیبلیس پەردەی حەیا دڕ

ئاوەرد پارچەی بەد پوٚشا نە وەرم
روٚسیا و رەنگ زەرد سەر تا کەمەرم

نزوٚل کێشا دەست بەختم ئەو رای بەد
پای ئەدەب نە دەرک عادەت کەردم رەد

رێزە کەرد شیشەی بەزم بیساطم
زرنگنا زەنگ نەرد نەهاتم

پارە پارە کەرد مینام وە مەینەت
با دا لە تەرە بە بەست و بەینەت

ئەی سەر تا ئەو سەر خول ئاوەردەوە
هەودای هەم و غەم مەحکەم کەردەوە

ئیسە نە عەیش و ، نە سروٚر ، نە راز
نە دایرەی دەف ، نە چلچەنگ ، نە ساز

**یەکسەر پەردەی چەرخ چون ئەهل کاران**
**مالا بەرد ، هەر عەکس طاپۆم دیاران**
**باز هەم کلافەم چون بزلەی دەرویش**
**هەر چەرخم مدۆ چەنی چەرخ ویش**
**هەی چەرخ ! وە بەدی ویت گرفتار بی**
**هەر چەرخ بەدەری هەرتا دیار بی**
**شەرط بۆ چەنی خۆن ( یوسف بەدکاری )(۲)**
**تۆ ئەو چەپ‌گەردی ، من ئەو بێ‌عاری (۳)**

( ل : ۱۰۲ ، م )

**ـ ۲ ـ**

**خالۆ ویەردەن ... ... (۱)**
**هیجرانت یەکجار جە حەد ویەردەن**
**وەسواسەت شادیت جە بێخ ئاوەردەن**
**دوریت خێمەی دل ریشەکەن کەردەن**

---

(۲) ئەم ( یوسف بەدکاری ) یە کە مەولەوی لێرەدا ناوی دەهێنێت ، رەنگە زەلامێکی بەد و نالەبار بوبێت و بۆ نموونەی بەدکاری بە (مەثەل) هێنرابێتەوە ، بەلام بە هۆی لە ناوچونی ئەوانەوە ئەو بەسەرهاتەیان زانیوە و ، بە هۆی تۆمار نەکردنی ئەو رووداوەوە دیارە لە کون و قوژبنی لەبیرچونی مێژوودا لە ژێر قوڕ و لیتەی بەسەر یەکا پەسیوی ئەم چەند سالەدا ون بوە .

(۳) لێرە بە دواوە شیعری :
**« موبارەکت بۆ بەزم نەو وە خەیر**
**تو خودا تەنخوای من خاص بکەرە سەیر »**
نوسراوە کە لە چاپەکەدا سەرەتای پارچەی (٦)ی (میم)ە ، لە بەر ئەوەی لێرە بە دواوە جیاوازییەکی وا ـ جگە لە زیادەی شیعری (٤)ی چاپەکە ـ لە نێوان چاپەکە و (م)دا نیە و ، لە بەر ئەوەیش رەنگە نوسەری (م) ، (ولە)ی نێوان پارچەکانی لەبیرچوبێ ؛ چونکە مانای دوو پارچەکە ـ هەندێك ـ لە یەکەوە دورە ، ئێمەیش ئەو پاشماوەی (م) ـ پارچەی (٦)ی (میم)ی چاپەکە ـ نانوسین .

**( ۲ )**

(۱) ئەم پارچە ، وەك دەبینی ، لە (م)دا پارچەیەکی درێژە و لە کۆتاییشیدا

**فیراقت فەرقم وە توتیا کەرد**
**جیاییت ئەعزام جە هەم جیا کەرد**
**پەژارەت بەو تەور نێش دان نە جەرگم**
**وە مەرگت قەسەم ! رازیم وە مەرگم**
**وێت بەدەر ئینصاف ، خاڵۆکەی خۆش خۆ :**
**مەردەن خاصتەرەن ، یاخۆ دۆری تۆ !**
**مەردەن یەك ساتەن ، ئەرواحەكەی وێم !**
**دۆریت هەر ساتیٚ صەد مەرگەن پەرێم**
**مەر جەستەی خەستەی من جە فۆلادەن**
**یەند دۆریت وینۆ هێمان دڵشادەن !**
**دەك رەحمەت ئەو قەبر گشت سینە صافان**
**خوصوصەن ( یەعقوب ) میرزاکەی جافان**
**چەرخ چەپ چەنیم راست بەستەن کەڵەك**
**چمان سەنگم دان وە مینای فەلەك**
**دایم پەرێو من ها جە بەهانە**
**گاهیٚ ( ئەصفەهان ) ، گاهیٚ جە ( بانە )**

پەخشانێکی کوردیٚ لە گەڵدایە ، وا دەردەکەویٚ مەولەویٚ بۆ خاڵـۆی کۆماسیٚ نوسیبیٚ و وەڵامی نامەیـەکی ئەوی پیٚ دابێتـەوە ، دەریـش دەکەویٚ ، وەك مەولەویٚ خۆی لە پەخشانەکەدا دەڵیٚ ، کە خاڵۆ داوای لە مەولەویٚ کردوە نامەی بۆ بنێریٚ بۆ (پەنجە) ..

لە لایەکی ترەوە باس و ناوی میرزا یەعقوبێکی جافی تێدایە ، کە مـن پیٚبزانم ، لە دیوانە چاپەکەدا ناوی نەهاتوە . زۆر بە دیوانەکەدا گەڕام بەڵکو ئەم پارچە شیعرە بدۆزمەوە ، ئەنجام دەرکەوت کە : بەم شێوەیە چاپ نەکراوە ، بەڵکو بە پرژ و بـڵاویٚ لە دوٚ جێـگەدا هەندێـکی بڵاوکراوەتەوە و ئەوەکەی تریـم هـەر بۆ نەدۆزرایـەوە . ئـەوەی بڵاوکراوەتەوە بەم جۆرەیە : لە شیعری دوٚهەمەوە تا شیعری هەشتەمی ـ واتە (٧) شیعری ـ بە پارچەی (٦)ی (پیٚ) چاپکراوە . وە شیعـری (٩) و (١١) و (١٦)یشی بە پارچەی (٦)ی (خیٚ) چاپکراوە . جگە لـە هەندیٚ جیاوازیٚ تریش کە لە چاپکراوەکاندا هەیە و (م)یش راسترە و ماناکەی رێکترە . بۆیـە لێرەدا بە تـەواویٚ ئـەم پارچەیـــە وەك (م) دەنوسمەوە .

نەمدۆم فرصەت ساتێ وە بێ خەم
گەرد پاڵاکەت بماڵو نە چەم
یا شەوێ شین کەم وە شەوناڵینت
یا روێ رۆکەم وە زارێ و شینت
یا ناڵەم چەنی ناڵەت بخێزۆ
یا دیدەم ئەسرین پەرێت بڕێزۆ
یا شەممی جە شەرح دوورێ دۆبارە
داخ هیجر وەصڵ دڵەی صەد پارە
عیشوەی گریشمەی حۆر چەمین‌گوڵ
عەرزکەم وە پابۆس پەی تەسکین دڵ
چەپ گەرد نمازۆم دەمێ فەراقەت
سا خودا : یا وەصل ، یا مەرگێ ، یا طاقەت

★ ★ ★

طاقەت خۆ نابێ ! خاڵۆ (٢) (فرمودەبودند) کاغەز بنۆسمە پەنجە(٣)،یانی لەگرەوە نزدیك ترە ، ئەرێ خاك وە سەرم بەو خاص نزدیکە ! لەگرە تا پەنجە پەنج رۆژ (ریگەاست) ! نازانم چە بنۆسم ؟ دەردم دۆبارە تازە بۆگەسوە(٤) ، یاخودا خۆم لە کاغەز زۆتر ڕۆمەوە ، ئاخ خاڵۆ ! .

( ل : ٣٩ ، م )

— ٣ —

دڵە دیارەن بێ قەرارەنی (١)
خەیاڵ صوحبەت راگەی یارەنی

---

(٢) ئەم پەخشانەش لە (م)دا لە دوای ئەم پارچەوە نوسراوە ، منیش لێرەدا وەك خۆی نوسیم .

(٣) پەنجە دێیەکە لە ناوچەی (دیواندەرە)ی کوردستانی ئێران ، ( بڕوانە : مەلا عبدالکریمی مدرس ، دیوانی مەولەوێ ، ل : ١٩٦ ) .

(٤) تازە بۆگەسوە : تازە بوەتەوە . وشەی (تازەبۆگەسوە) بە رێنوســـە کۆنەکە دەشگونجێ (تازە بۆگەسەوە) بێت .

( ٣ )

(١) ئەم شەش شیعرەم لە دیوانە چاپەکەدا نە دۆزییەوە ، ئەمە پارچەیــەکە

ئەر صەد دەوڵەتمەند جە خەدەنگەنی
پەشەی گیان نە دەر دڵ جە سەنگەنی

بەڵام پەی کەسێ دڵ پڕ جە باسەن
هامسایەی یانەی دەوڵەتمەند خاصەن

( بنیش ! ) سەروەشم وە رەفیقێ تۆ ،
وەر ملی چەنێش خودات چەنی بۆ

من بازە وە دەرد هیجران باڵاش
ئانە تۆ صوحبەت گەردەکەی پاڵاش

بەڵام یادت بۆ وەی فەقیرەوە
چون تلیەی وە زام مەودای تیرەوە

( ل : ٧٨ ، م )

— ٤ —

ها زرنگەی زەنگ سەرقەطار مەیۆ (١)
وێنەی دڵەی من ناڵەش زار مەیۆ

صەداش رێی کاروان گرتەن بێ پەردەن
ماچی شاگردێ دڵەی من کەردەن

هەی تیجارباشێ خەیر نەیۆ نە رێت
بێ رەنج وینی گەنج جە سەرمایەی وێت

من خۆ کەفتەکار خەریك دەردم
خەستەی زامەتدار وێڵ رۆی هەردم

( ل : ٩٥ ، م )

لە هەردێ نوسخەکە ــ م و ف ــ دا هەیە و (٩)شیعرە ، ئەم شەش شیعرە و سێ شیعرەکەی پارچەی (٣١)ی (ئەلف) .
لە نێوان هەردێ دەسخەتەکەدا جیاوازییەکی زۆر کەم هەیە .

( ٤ )

(١) ئەم شیعرانە سەرەتای پارچەیەکن لە (م)دا لە بەر لەناوچوونی بەشێکی دەسخەتەکە دوایبەکەی فەوتاوە ، لە دیوانە چاپەکەیشدا نەمدۆزینەوە .

— ٥ —

قوربان چەم چەمش وە تۆ نە کەفتەن (١)
بەلاَم نەوساوە نامت شنەفتەن
ئارەزۆی وە گەرم دیدار تۆشەن
پەی فەردای خەدمەت ئارۆ و فەرداشەن (٢)
تا ئیستە چەند جار تەدبیرش کەردەن
تەقدیر ریشەی ئەو جە بێخ ئاوەردەن
بەندە ئیحرام بەند کەعبەی حوضوورەن
رانمەزانۆن بەڵەد زەرۆرەن
مەواچان : هیممەت پەی بەڵەد خاصەن ،
راسشان فەرمان ، ئەڵبەت هەر پاسەن
هیممەت تا سەر بۆ چەم بالاَ پەی لات
سەر سەر بڵند بۆ چەم وە خاك پات
ئەر صەد واوەیلان هیجران بالاَت
مەینەتەن دووری تۆزەکەی پالاَت
بەلاَم چون کەردەی گەردشی چەپگەرد
گەردەلوول چەرخ هیجرانت هۆرکەرد
رەزام وە تەقدیر دڵ دام وە رەضا (٣)
تەن کەردم سوپەر تیرەکەی قەضات
وە بەرد هاوێر وەصڵەکەی جاران
ئاما و لواکەی صەبا و ئێواران
ئیستە پێچ وەردەم چون مارکوشتە
مقرچۆ وینەی دانەی برشتە

( ٥ )

(١) ئەم پارچە بەم شێوە لە (ف)دایە ، لە چاپەکەدا زۆری بۆ گەڕام ، نەمدۆزییەوە ، بۆیە وادەزانم تا ئێستە بلاَونەکراوەتەوە ، وا لێرەدا پێشکەشی دەکەم .

(٢) رەنگە مەولەوی (فەردێشەن)ی مەبەست بوبێت و ، بە هەڵە (فەرداشەن) نوسرابێت .

(٣) دیارە یان (ت)کە زیادە ، یان نیوەکەی تر (ت)کەی کەوتوە .

صەڕصەڕ هیجران هۆر کەردەم پەی دڵ
هەر تۆزم بەردەن مەنزڵ وە مەنزڵ
جە دووریٚ باڵات ناڵە ناڵەمەن
ئاماو ناماکەم ئەڵلا و ئاڵەمەن (٤)

( ل : ٥١٢ ، ف )

– ٦ –

پەی چێش خاڵۆکەی دەرۆن جە هۆن کەیل (١)
خەیلێن ئەجزای مەیل لەیلەکەی پڕ مەیل
ئامێتەن وە جزو ریزەی مەجنوٚندا
حەیفەن ئاو بەرۆش وە تۆنای تۆندا
ئازیز تای رشتەی دڵەی خەم بێ شۆ
ئازەڵیا نە بەند تای رشتەکەی تۆ
خاڵۆ چون تەدبیر دەرد زانات نەبی
هانام کەرد ئەو تۆ تەوانات نەبی
ها خودام بە حەق ، شادەتم ئاوەرد ،
خاڵۆت مەوج گێج دەریای بێ پەی کەرد
متاوای وێت دی وە مەودای وەیدا
گێج مدی نە گێج دەریای بێ پەیدا
جەو کەنارەوە سەعیت کەردە بۆ
هەوڵ پل و پۆش ئاو ئاوەردە بۆ
هەردوٚ چەنی هەم پێچ وەردەن وە هەم
جیایی نییەن ، عەوەئەن ستەم
سەر مەودای ناخون یەکسەر تێدا شی
هەرچەند سەعیم کەرد جیایی نەوی

(٤) ئەم شیعرە بە رواڵەت هەندێك لە دوا شیعری پارچەی (٢)ی (جیم)ی چاپەکە دەچێت .

( ٦ )

(١) ئەم پارچە لە چاپەکەدا لە گەڵ گەلیٚ جیاوازیٚ و پاش و پێش و کەم و زیاددا لە دوٚ پارچەی (٢٥)ی (ئەلف)و (٤)ی (خێ)دا چاپ کراوە . وا لێرەدا بە گوێرەی (م) دەینوٚسینەوە .

**ئیسته خاص پاسەن تۆ نەی سەردەمدا**
**هەردۆ چەنی هەم پێچدەی وە هەمدا**
**تا یاران زانان ریشەی جەرگمەن**
**پاچیان ئاوێزان وە رۆی بەرگمەن**
**هەنی نە داران دەم وە ئەناوە**
**ئافەرین واچان جە گردین لاوە**

( ل : ٤٩٩ ، ف )

## - ٧ -

**دیدەم ! چون میقراض بێ‌شەرطیت تیژ کەرد (١)**
**دات جە تاشەی وەصڵ جەو پەڕش ویەرد**
**شەرطە تا جەستەی خەستەی مەهجۆریت**
**پاکتاوش کەرۆ مەردەن چون دۆریت**
**جەو شۆم پڕ شۆم ئەڵحەدسەرای خەم**
**جە سەروازی هۆن جۆی سەرچەمەی خەم**
**وە بۆی ئەو باڵا و خەط و کوڵم و فەم**
**سەرو و سەوز و گوڵ غونچە بدۆ دەم**
**دڵەی مەینەت‌کار سفتەی کۆی قەفنەس**
**نەبۆ وە نیشان تیر موژەی کەس !**

( ل : ١١٠ ، م )

---

(١) ئەم پێنج شیعرە لە چاپەکەدا لەگەڵ پارچەی (٧)ی (بێ)دا چاپکراوە .
لە (م)دا دوای ئەم پێنج شیعرە ـ بێ جیاکردنەوە ـ شیعری :
**« شیفای ئێش و دەرد زامەتان سەخت !**
**ضیای دیدە و دڵ (مەعدۆمێ) بەدبەخت ! »**
دێت کە لە چاپەکەدا سەرەتای پارچەی (٧)ی (شین)ە ، واتە لە (م)دا ئەو پێنج شیعرە و پارچەی (٧)ی (شین) بە یەك پارچە دانراون ، جــا نازانم دەبێ نۆسەری (م) لێی تێك‌چۆبێ ، یان (ولە)ی نێوان دۆ پارچەکەی لەبیرکردبێ ، یان هەر لە بنجدا یەك پارچە بن و بە هەڵە لە چاپەکەدا وا چاپ کرابن ؟ .
دەبێ ئەوەیش لەبیرنەکەین کە مانای ئەم پێنج شیعرە لە گەڵ ئــەو پارچەدا زۆر جۆر و گونجاو نیە .

— ٨ —

تەسکینی دڵەی پڕ جە خارەکەم ! (١)
دەرمان دەروون بێقەرارەکەم !
نامەکەت کیاست وە لای من یاوا
پەیا پەی نە رۆی دۆ دیدەم ساوا
دەروونت وە کوڵ جۆش ئاوەردە بی
گرەی دووری وێت ئیظهار کەردە بی
دێونای دوودی کوورەی دەروونم
کولناتەوە زام دڵەی پڕ هوونم
نمازی ساتێ راحەت بۆ پەی وێم
دەك بێ بەڵا بای ! چێش مەکەری پێم ؟
من خۆ کەم زوخاو هیجرانم وەردەن .
ئەمجار گرەی تۆ تەمامش کەردەن

( ل : ٨١ ، م ، ٤٦٠ ، ف)

— ٩ —

یادم نمەشی جە گردین حاڵدا (١)
چەنی باڵ طەیر یا وە شەماڵدا

---

( ٨ )

(١) ئەم پارچە لە هەردوو نوسخەکەدا — م و ف — هەیـە و لەگەڵ هەندێ جیاوازیدا ئەم (٦) شیعرەیان وەك یەك وان ، لەم شەش شیعرە بـە دواوە لە (ف)دا پارچەی (٢٤)ی (ئەلف) دێت ، لە (م)شدا پارچـەی (١٧)ی نوون دێت ، بەڵام ئەم شەش شیعرەی لێرەدا نوسیمن لە چاپەکەدا نەمدۆزینەوە ، ئەوەندە هەیە نیـوەی یەکەمی بەیتی یەکەمی ئێرە وەك نیوەی دووهەمی بەیتی دووهەمی پارچەی (٥)ی (دال)وایە ، هەروەها نیوەی دووهەمی بەیتی یەکەمی ئێرە لە نیوەی یەکەمی بەیتی یەکەمی ئەو پارچەی چاپەکەوە — (٥)ی (دال) — نزیکە .

( ٩ )

(١) ئەم پارچە شیعرەم لە دیوانە چاپەکەدا نەدۆزییەوە .

ئیظهار ئایر گرِیەستەی دەروّن
دیەم وە دیەت فرصەت مزانوّن
دڵ دایم پەریّت پرّ ئیّش و نیّشەن
دنیام پیّ ئیّدەن بالاّی توّ تیّشەن
بە غەیر جە دوّریّ ئەو بالاّ نەمـــام
هەنی هیچ غەمیّ نەمەنەن جە لام
بەلاّم چیّش کەروّن ؟ گەردش چەپگەرد
دوّریش وە مابەین من و توّ ئاوەرد
کار گەردوّنەن نمونەمام نوّ
ومرنە من جە کوّ دوّریّ توّ جە کوّ ؟ !

( ل : ٩٠ ، م )

## ئەحمەد بەگ

– ١ –

چراخم جەی روّ ... ...
من جە روّی ئەزەل مترسام جەی روّ
مزانام گەردش ئەی چەرخ بیّ پوّ
مکەروّم مەحروّم جە دیدار توّ
روّی وەصڵت هەر بیم ئەی روە پیّم بی
جەو بوّنە هەر روّ روّژوّ خدیّم بی
ها فەلەك ئەو روّ نیشان دادەن پیّم
دەك وە تەرساکەی گیرئاوەردە ویّم
ئیسە کیّ طاقەت دوّریّ توّ دارو ؟
دەك بەرق غەضەب وە بەختم واروّ (١) !
پەی چیّشەن ئەی عەمر تاڵتر جە ژارە
ئەی ئەعزای بیّ صەرف مەینەتان بارە
چونکە کوّ جەمین جە دیدار توّ
هەر یەك وە دەردیّ با گرفتار بوّ

(١) ئەم شیعرە و دوّ شیعری پێشەوەی لە پارچـــەی (٧)ی (ن)دا هەیە .
هەروەها تەنها ئەم شیعرە لە (٥)ی (ئەلف)دایە .

دیدیۆ نەوینۆ هەر سەحەر دیدەت
نەدیۆ وە خاڵان قودرەت رەژیدەت
ئەو دیدە دینش نەشتەر کیا بۆ
زۆ یانەش وێنەی زوڵف سیا بۆ
زوانێ چەنیت هەر شەو نەیۆ باس
فرقە فرقە بۆ چون سفتەی پەڵاس
دەستێ جەم نە جید جەیرئاسات نەبۆ
گاگا شانەی زوڵف تاوتات نەبۆ
ئەو دەستە گەستەی مار پڕ ژار بۆ
وە گاز ماران لەتار لەتار بۆ
گۆشێ نەشنەوۆ رێزەی راز تۆ
ئەو چفەی وە نەرم دڵنەواز تۆ
هەر پەی ئێد خاصەن ئەطرەش بۆ دەربەس
بادا نەشنەوۆ هەرگیز دەنگ کەس
( والحاصل ) ژیان بێ دیدار تۆ
بەدتەرەن جە مەرگ ئەونەمام نۆ
(ئەحمەد) ئومێدش بە داناى‌داوەر
یا طاقەت ، یامەرگ ، یا وەصل دولبەر

( ل : ٤١ ، م )

— ٢ —

کاکە ! یەند دۆریت دەرۆنم کاوان
چون قەیس مەجنۆن وێڵم نە کاوان
شنەفتم بۆی عیشق جانان میۆ لێت
دەك روێ صەد جار بۆ وە گەرد رێت
بەڵێ چە حاصڵ شای وەفاداران
مەجرۆح غەمزەی تیپ تەتاران
مەترسۆن وەی دەرد تۆ نە دینەوە
وەی فوغان بەرز زارێ و شینەوە
سەر بنیۆن وە خاك ئەڵحەد سەرای نۆ
بمانۆ وە حەشر دەرد دۆرێ تۆ

دەرد وە بان دەرد زامگەل کاری (۱)
گرد جە لام جەم بی یە تەشریف باری
ئەی یە چێشت کەرد تەشریفت ناوەرد
دەردت دا وە دەرد ، منت ماتەم کەرد
ئیسەیچە دیدەم چەم ها وە راوە
هالآناوشەم بەو تەمەنناوە
ئەمرت موطاعەن ( اطعنا ) وەندم
دۆعای ( چەشم زەخم ) جە پیران سەندم
تەعویذبەند ریشەی دڵەی صەد پارەم
بەرگش پەڕەی جەرگ وە دەرد ئاوارەم
حافیظ بۆ وە عیشق مەستان یاهوٓ
بپێچەش نە دەور باهوٓی بێ ئاهوٓ
ئینە عادەتێن وە ظاهیر ئامان
وەرنە هەی سەرخێڵ نازك ئەندامان !
تۆ یەند نازکیت جە حەد ویەردەن
دیدەی بەدخەیاڵ راگەش گوم کەردەن
دیدەی بەد دەردش نادیاریٓ بۆ
جە کۆ موینۆت تا لێت کاریٓ بۆ !
صەفات خەجاڵەت دان وە جام جەم
دیدەی بەد مەر عەکس وێش وینۆ وە چەم !

( ل : ٤٣ ، م )

## شێخ حەسەنی مەولانابادیٓ

قیبلەم مەستەنان ... ...
بیٓ مەی جە بادەی عیشقت مەستەنان

---

( ۲ )

(۱) لەم شیعرەوە لە دیوانی مەولەویدا بە پارچەی ژمارە (۱۰)ی پیتی ( د ) بۆ مەولەویٓ تۆمار کراوە ، بەڵام وەك دەبینی لە (م)دا لە تەك ئەو شیعرانەی تردا بۆ خاڵۆی کۆماسیٓ تۆمار کراوە .

**نەك مەست مەخمۆر دەست بەستەنان**
**سەرشار سەرمەست رۆی (الست)ەنان**
**هەردەم مگێلۆن چون (لائوبالی)**
**خاطر جە رەخنەی رەقیبان خالی**
**شۆر شەیدایم یاوان وە جایێ**
**جە لام فەرق نیەن شا جە گەدایێ**
**ئەر شێخان عەصر نۆبە بە نۆبە**
**بەدەران تۆبەی ( حەسەن ) جەو تۆبە**
**ساتێ جە سەودات دڵ سەرد نەبۆ**
**دەمێ جە عیشقت بێ دەرد نەبۆ**
**سەودات سەرمایەی زیندەگانیمەن**
**نوسخەی ئازادێ بەندەگانیمەن .**

( ل : ٣٧ ، م )

**ئەم پارچە لە دوای پارچەی (ا)ی (جیم)ی چاپەکەوە نوسراوە .**

## موناسەباتەکانی نوسخەی ( میم )

شایانی باسە نوسخەی (م) لە دوای چەند پارچە شیعرێکەوە چەند پارچە پەخشانی تێدایە ، لەو پەخشانانەدا سۆز و هەستی موریدێ مەولەوێ بۆ شێخانی (بیارە) و هاوەڵان و موریدانی خانەقای بیارە و ، نیشانەی خۆشەویستێ و وەفادارێ دۆستانەیان تێدا دەدرەوشێتەوە ، هەروەها خۆشەویستێ رەفیقایەتێ و هاوەڵایەتێ نێوان مەولەوێ و چەند کەسێکی وەکو: زهاوێ و ،ئەحمەد بەگی کۆماسێ و، کاکە ئەحمەدی مەجذوب...یش لایەنێکی کەی ورشەداری ناو ئەو پەخشانانەیە . تا ئێستەش ــ من بزانم ــ ئەو پەخشانانە بڵاو نەکراونەتەوە و خوێندەواری ئەم سەردەمەی کورد شارەزایێ لێیان نیە. زۆری ئەو پەخشانانە فارسین، هەندێکیشیان کوردین. ئەمەیش لە لای خۆیەوە کە : مەولەوێ پەخشانی کوردێ ــ با کەمیش

بێ ــ نوسینی جێگەی بایەخێکی تایبەتییە ؛ چونکە تا ئێستە ــ جگە لە مەولود نامەکەی شێخ حسەینی قازی ــ پەخشانێکی کوردی ئەو سەردەمەمان نەدیوە و ، بۆیشمان باس نەکراوە •

جا ئێمە لێرەدا ئەو پەخشانانە ــ بە فارسی و کوردییەوە ــ بە گوێرەی لاپەڕەی دەسخەتەکە دەنوسین و ، دەس‌نیشانی ئەوەیش ئەکەین کە لە دوای چ قەسیدەیەکەوە نوسراون ، بۆ ئەوەی وەك موناسەبەی قەسیدەکە یارمەتی خوێنەر بۆ روونکردنەوەی مەبەستی شیعرەکان بدەن •
ئەوا لێرەدا دەست بە موناسەباتەکانی (م) دەکەم و پەخشانەکانیشیان بە گوێرەی زنجیرەی لاپەڕەی دەسنوسەکە لەگەڵ دەنوسم :

١ــ وەك لەگەڵ شیعرە بڵاونەکراوەکاندا نوسیومە ، لە دوای پارچەی « خاڵۆ ویەردەن •••»ەوە نوسراوە :

« طاقەت خۆ نابێ ، خاڵۆ (فرمودەبودند) کاغەز بنوسمە (پەنجە) ، یانی لەگرەوە نزدیك ترە ، ئەرێ خاك وە سەرم بەو خاص نزدیکە ! لەگرە تا پەنجە پەنج رۆژ (ریگەاست) ! نازانم چە بنوسم ؟ دەردم دوبارە تازەبوگەسەوە ، یا خودا خۆم لە کاغەز زوتر بڕۆمەوە ، ئاخ خاڵۆ ! » (ل : ٤١ ، م) •

٢ــ لە سەر روباعی ژمارە (٥)ی (پێ) نوسراوە : روباعی موعەمما بە ئیسمی ئەحمەد • (ل : ٥٠ ، م) وەك لە (ف)شدا هەر وا نوسراوە •

٣ــ چوار شیعر هەیە کە لە چاپەکەدا نین لە سەریان نوسراوە : « ولە در عقیدە • » (ل : ٥٠ ، م) •

٤ــ لە سەر پارچەی (٥)ی (فێ) نوسراوە : لە لاواندنەوەی مەلا مەحمودا • (ل : ٥٢ ،م ) لە چاپەکەدا مامۆستا دەفەرموێ : مەولەوی ئەم

قەسیدەی لە سەر قەبری دۆستێکی وتوە ، کە نەمانتوانی بزانین کێیە ، وە مێژوی مردنی تیا باس کردوە بە پێی حەرفی ئەبجەد .

٥ـ لە دوای پارچەیەکەوە کە سەرەتاکەی بە «تەسکینی دڵەی پڕ ...» دەست پێ دەکات و لە چاپەکەدا نیوەی یەکەمیم نەدۆزییەوە نوسراوە :

**« کاکە نە زبانرا طاقت تقریر ، و نە قلمرا یارای تحریر ، اینقدر میگویم کە اشتیاق بسیار و ذوق بی شمار دارم ( چە خوشاست کە بعد از غم کشیدن ، خدا روزی کند دیدار و دیدن ) ، جناب شیخ بزرگوار از تنخوای فقیر دست بوسندە ، و التماس ازو بفرمانید ، مخدومی شیخ مولان سلام برسان ، و ازو دعا خوانم ، والسلام » (١) ( ل : ٨٢ ، م ) .**

٦ـ لە دوای پارچەی (ا)ی (ضاد)ەوە نوسراوە :

**« ضیای دیدە و دلم ! نامەات رسید ، شادمان بخشید ، خدا از منت نستاند ، وجود مبارکت برای خاطر من خیلی خیلی بماند ، الحمدللە از همت شیخ بزرگوار و دعای آن دوست راستی شعار .. روزگار حسب المرام درگذراست ، و دست صاحبی شیخ و کاکە مولانرا زیارت بفرمانید ، و امینرا هم و کاکە حسینرا خیلی سلام رسانم . وسلام » (٢) (ل : ١١٤ ، م).**

---

(١) واتە : کاکە ! نە زوبان هێزی تەقریر و ، نە قەڵەم توانای نوسینی هەیە ، ئەوەندەش دەڵێم بە هۆی بیرکردنەوەی زۆر و ئارەزوی بێ ئەندازەوەیە ، (چەند خۆشە دوای خەفەت خواردن خوا رۆژێك بێنێت بە دیداری یەك شاد بین !) . لە باتی من دەستی شێخی مەزن ماچ بکە و داوای هیممەتی لێ بکە ، سەلام لە گەورەم شێخ مەولان بکە ، داوای دوعای لێ دەکەم . وەسەلام .

(٢) واتە : رۆناکی چاو و دڵم ! نامەکەت گەیشت ، شادمانی بەخشی ، خوا لە منت نەستێنێ و ، تا ماوەیەکی زۆر بۆ ئێمە بمێنن . سوپاس بۆ خوا لە هیممەتی شێخی گەورە و ، دوعای ئەو دۆستە راستی پێشەوە رۆژگارمان بە گوێرەی ئارەزو دەگوزەرێت . دەستی شێخ و کاکە مەولان زیارەت بکە ، زۆر سەلام لە ئەمین و کاکە حسەین دەکەم . وەسەلام .

٧ـ لە دوای پارچەی «ئازیز شۆخ و شەنگ شیرین تارەنی ...»ەوە کە لە (م)دا بە پارچەیەکی سەربەخۆ نوسراوە و لە چاپەکەدا لە گەڵ پارچەی (ا)ی (چیم)دایە .. پارچەیەکی فارسی دێت و دیاری نەکراوە هی کێیە ، لـە کۆتاییدا ناوی (خالد)ێکی تێدایە ، لە دوای ئەو پارچە فارسییەوە ئەم پەخشانە فارسییە نوسراوە :

**« از مادەی امری کە فرمودەبودند حسب الامر عمل نمودە ، چاکران‌رابر سر خود حکم نیست ، هر چە فرمان تو باشد آن کنند ، حرکت بدن نمانـدە و جان دست از توانایی افشاندە ، و نە دلرا تحمل نیامدن ، و نە مارا طاقت آمدن ، اگر بفریاد خواهید رسید عمریست عزیز منت دوبارە . والسلام .» (٣) (ل : ١١٦ ، م) .**

٨ـ لە دوای پارچەی (٦)ی (نون)ەوە نوسراوە :

**« بە خودا ئەگەر ئینصاف بوێ تۆ بۆ بەشەکەی قیامەتیچت بەسە ، بە شەرطێ لەگەڵ (زەهاوێ) وەیەکوە بخوێنن ، کاکە ! بە مەرگی تۆ جارێ تر کەس ناوێژێ . » (ل : ١١٩ ، م) .**

٩ـ لە دوای پارچەی (١٨)ی (ئەلف)ەوە نوسراوە :

**« شمال عبارت نامەات ضیای دیدە فردهای معنی باریك دارد ، یکی یکی‌را بخوانید ، خوب ملاحظە کنید ، نادانستە نگذاریدشان ، ( ئاخ خۆم لـە کوێم بۆت بخوێنم ؟ ) . » (٤) ، (ل : ١٢٤ ، م) .**

---

(٣) واتە : لە بارەی ئەمرێکەوە کە فەرموبوتـان بە گوێـرەی فەرمـانتان جوڵاینەوە ، خزمەتکاران هیچیان لە دەستدا نیە ، چی فەرمانی ئێـوە بێت ئەوە دەکەن ، بەدەن هێزی نەماوە ، گیـان دەسـتی لە توانایی شۆردوە ، نە دڵ توانای نەهاتنی هەیە ، نە ئێمەیش توانای هاتن . ئەگەر فریا بکەوی ژیانێکی تازە و منەتێکی دوبارەیە .

(٤) شنەی شەماڵ لە باتی نامەیە ، ڕوناکی چاوم ! شیعرەکان مانایان زۆر وردە ، یەکە یەکە بیانخوێنەرەوە ، باش سەرنجیان بدە ، نەزانانە بـە سەریاندا تێمەپەڕە .

١٠ــ لە دوای پارچەی (٢)ی (ری)وە نوسراوە :

**« بفرست (ذهابی)را بیاورند ، یکی یکی‌را باو بخوانید . (کاکە ! بە مەرگی تۆ هەر بەیتێکی هەزار (تومان) قیمەتیە ، ئەمما بە شەرطی خاصیان بخوێنن ) ، کاکە ! زانوهایم درد میکند ، والا ایندفعه می‌آمدم ، بی طاقتی مکن ، رمضان نزدیك‌است ، چنان دانستی یکشب برخواستم آمدم ، ( ذهابی )را بگو : عجب بی انصافاست ! دیدید مرا تنها گذاشته دفعهء نمی‌آید من هم دور باشم او دور (دیدیدیم !) عاجز می شود » ، (٥) (ل :١٢٩، م ) .**

وە لە سەر هەمان پارچە نوسراوە :

**« ضیای دیده ! عزیزم ! این‌را هم تفأل حافظ گفته‌ام ، هنوز اسماعیل آقا نیامده بود ، بخوان ، ملاحظه‌کن » . (ل : ١٢٨ ، م) .**

١١ــ لە سەر پارچەی (٤)ی (هێ) نوسراوە :

**« قافلەی بەهارییە ، ها خاصی بخوێنە ، ئامان هەی داد . » (ل : ١٣٠ ، م) .**

١٢ــ لە دوای پارچەی (٨)ی (ئەلف)ەوە نوسراوە :

**« دیده‌را از تنخوای من سلام برسان ، و اورا بگو :**

**سەنگی سەنگ و خاك نە سەر دۆشم بۆ**

**مەر ئەوسا مەیلت فەرامۆشم بـۆ**

---

(٥) واتە : بنێرە زەهاوی بێت ، یەکە یەکە بۆی بخوێنەرەوە . (کاکە بە..) کاکە ! ئەژنۆم دێشێ ، ئەگینا ئەم جارە دەهـاتم ، بێ‌تاقـەتی مەکە ، رەمەزان نزیکە ، هەر ئەوەندەت زانی شەوێك هەستام و هاتم ، بـە زەهاوی بڵێ : چەند بێ ئینسافە ؟ ئاگـات لێیە چـۆن بە تەنیـا جێی هێشتوم ! جارێك نایەت ، من دوور بم و ئەویش دوور چاوم دادێت ! . رووناکی دڵم ! خۆشەویستم ! هێشتا ئیسماعیل ئاغا نەهاتبو فـاڵم بە (حافظ) گرتەوە ئاوای هێناوە ، بی‌خوێنەرەوە و لێی وردبەرەوە .

**کاغذ هم بـ (ذهابی) بنویس که انشاءالله چند روزەء دیگر فلانی عودت خواهـد نمود بلکه عاجز نشود تا بیایم ، عبدالرحیم المعدوم ضیای دیده و دل ! سرور عزیزم ! دمیدن صبح و صال در آخر شب فراق نزدیك است ، اگر فلـك بگذارد . » (٦) ، (ل : ١٣٦ ، م) .**

١٣ــ لە دوای پارچەی (١٠)ی (بێ)وە نوسراوە :

**« شیخ بزرگوار دستبوسی برسان ، و امین‌را هـم و کاکه مـولان‌را کنلك ، و کفش زرد بخواهر عزیز برسان ، از تنخوای من عرض‌کنیـد زور زردست ، پا بنهد بەبخشد ، عبدالرحیم المعدوم » . (٧) ، (ل : ١٣٧ ، م) .**

١٤ــ لە دوای پارچەی (١٢)ی (نون)ەوە نوسراوە :

**« سرور عزیزم ! برسیدن عریضه آمدن‌را فریضه دانید ، خیلی دلتنگ و نالەء درونم فرسنگ ، و بخت بد دل در جنگ‌است ، و ساز دعای خیرم در آهنگ ، زود بیاید ، زودتر بیاید ! » . (٨) ، (ل : ١٤١ ، م) .**

١٥ــ لە سەرەتای لاپەڕەی (١٥٦)دا ، کە پەڕەی پێشەوەی لەناوچوە ، ئەم پەخشانە فارسییە نوسراوە :

---

(٦) واتە : لە باتی من سەلام بە چاوەکەم بگەیەنە و پێی بڵێ :

**سەنگی سەنگ و خاك نەسەر دۆشم بۆ**

**مەر ئەوسا مەیلت فەرامۆشم بۆ**

کاغەزیش بۆ زەهاوێ بنوسە کە : (انشاءالله) چەنـد رۆژێکی تر فـلان دەگەڕێتەوە ، با تا دێم عاجز نەبێت (عبدالرحیم المعدوم) .

ڕوناکی چاو و دڵ ! سەروەری خۆشەویست ! کاتی بەیانی بەیـەك گەیشتن لە کۆتایی شەوی دوریدا نزیکە . ئەگەر چەرخ بێڵێت .

(٧) واتە : دەستماچ‌کردن بە شێخی گەورە عەرز کە ، هەر وەها ئەمـین و کاکە مەولان ، کەوشی زەرد بدە بە خوشکی خۆشەویست و لە باتی من پێی بڵێ : زۆر زەردە ، لە پێی‌کات و بمبەخشێ . (عبدالرحیم المعدوم)

(٨) واتە : سەروەری خۆشەویست ! عەریزەکە هات ، فەرزەکە درایەوە ، زۆر دلم تەنگە و ، نالەی دڵ فەرسەخ (بە فەرسەخ دەڕوات) ، بەختی دڵرەش لە گەلم لە جەنگدایە ، داوای دۆعای خێر دەکەم ، زو بـێ ، زوتربێ .

**« درویشان بلی ازیشان جوشیدن و خروشیدن ، و کمان کشیدن ، و از دلریشان سرخوشی کردن ، و کسی بوسیدن ، و چشیدن دم . عبدالرحیم المعدوم .» (٩)**

١٦ـ لە کۆتایی پارچەی (٩)ی (تێ)دا نوسراوە :

**« خاك بر سر من ! نه دلبر و نه یاور ، و نه خورسند از خبر ، من غم خوردن تا روز محشر . عبدالرحیم المعدوم . » (١٠) ، (ل : ١٥٩ ، م) .**

١٧ـ لە دوای پارچەی (١)ی (تێ)وە نوسراوە :

**« برادر عزیزم ! نشینگان تاریك ، نشینان دور و باریك ، بر آب حیات عبارت نامهء بصحابت خضر میراب فرمودند . جزاکم الله ، بدین شکسته دست مصدع شدم ، والسلام . عبدالرحیم المعدوم .**

**برادر عزیزم ! پیش از آمدن آدمت تدارك تسبیح‌را باین بیتهای شکسته و بسته‌کرده‌بودم ، روانهء خدمت نمودم تا جواب دگررا خواهم نوشت که ویرادیراست » ، (١١) ، (ل : ١٦٢ ، م) .**

بە دوای ئەمەشدا پارچەی (٥)ی (جیم) دێت کە باسی تەزبیحی تێدایە .

---

(٩) دەروێشان ! بەڵێ ، لەوان هەر جۆش و خورۆش و کەوان‌کێشان ، وە لە دڵبرینداران سەرخۆش بوون و ، ماچ‌کردنی کەسێك و ، ئاخ هەڵکێشان .

(١٠) خاکم بە سەر ! نە دولبەر و نە هاوەڵ ، نە دڵم خۆشە بە هەواڵێك ، خەفەت‌خواردن تا رۆژی حەشر . (عبدالرحیم المعدوم) .

(١١) برای خۆشەویستم ! ئەوانەی لە تاریکایی دوور لە سەر ئاوی حەیات دانیشتون نامەیەکیان بە خدری میراودا رەوانە فەرمو ، خوا پاداشتان بداتەوە ، بەم خەتە پەرپوتەی خۆم سەرتان دێشێنم . وەسەلام .
برادەری خۆشەویستم پێش هاتنی پیاوەکەت تەزبیحەکەم لەگەڵ ئەو شیعرە شەق و شڕانە سازکردبو ، رەوانەم کرد ، تا جوابێکی تر دەنوسمەوە پیاوەکە پەلەیەتی .

# موناسەباتەکانی نوسخەی ( ف )

١ــ مەلا فەتاحی کاگردەڵێ ــ نوسەری نوسخەی ف ــ لە سەر پارچەی (٢)ی (ئەلف) نوسیویە : کاتێ مەولەوێ لە (سنە)وە چوە بۆ (بانــە) ئــەم پارچەی بۆ ئازیزی نوسیوە • لە چاپەکەدا باسی (سنە) نەکراوە و ، نوسراوە کە بۆ شێخ عەزیزی جانەوەرەیێ نوسیوە کە بە هۆی چونیەوە بۆ (بانە) لێی جوێ بوەتەوە • (ل : ٣٨٥ ، ف) •

٢ــ لە سەر پارچەی (٢)ی (نون) نوسراوە : فیراق‌نامەیەکە مەعدوم لە فەصڵی بەهاردا فەرموێەتی • لە چاپەکەدا نوسراوە : مەولەوێ ئەم قەسیدەیەی بۆ شێخ عەزیزی جانەوەرەیێ نوسیوە ، وە وای بڕیار داوە کە ئەبێ نەسیم بۆی بەرێ (ل : ٤١٨ ، ف) •

٣ــ لە سەر پارچەی (٤)ی (نون) نوسراوە :

حەسرەت‌نامەیەکە وەختێ ئێڵی جاف چــوە بۆ لەیــلاخ مەولــەوێ فەرموێەتی • لە چاپەکەشدا نوسراوە : مەولەوێ ئەم قەسیدەیەی لە کاتــی کۆچ‌کردنی جافەکانا بۆ کوێستان ، وتوە • (ل : ٤٢١ ، ف) •

٤ــ لە سەر پارچەی (١٣)ی (ئەلف) نوسراوە : بۆ قسەکردن لەگەڵ خوادا فەرموێە • لە چاپەکەدا هیچ باسی موناسەبە نەکراوە • ( ل : ٤٢٧ ، ف ) •

٥ــ لە چاپەکەشدا و لە (ف)یشدا لە سەر پارچــەی (١٨)ی (دال) نوسراوە کە بۆ لاواندنەوە و تەئریخی کۆچی دوایێ شێخ عەبدوڕڕەحمانی طالەبانێ وتراوە ، بەڵام مەلا فەتاح سالی (١٢٧٥)ی کۆچــێ بۆ مێــژوەکە

دیاری کردوە و مامۆستا مەلا عەبدولکەریم سالی (١٢٧٧)ی دیاری کردوە ، هەروەها ئەمین زەکیش لە مەشاهیرەکەی خۆیدا سالی (١٢٧٥)ی بۆ کۆچی دوایی شێخی طاڵەبانی دیاری کردوە (١) (ل : ٤٥٠ ، ف) •

٦ـ لە سەر پارچەی (١٠)ی (بێ) نوسراوە : مەعدوم کاتێ لە بەغدا بوە بۆ کاکە ئەحمەدی (مەجذوب)ی نوسیوە • لە چاپەکەدا نوسراوە : لە وەڵامی دۆستێکا کە عابایەکی بۆ ناردوە نوسیویە • (ل : ٤٥٧ ، ف) •

٧ـ لە سەر پارچەی (٥)ی (یێ) نوسراوە : موعەمما بە ئیسمی ئەحمەد• بەڵام لە چاپەکەدا نوسراوە مەولەوی ئەم دوو شیعرەی بە بۆنەی کوێربونیەوە وتوە • ( ل : ٤٥٩ ، ف ) •

٨ ـ لە سەر پارچەی (٢٥)ی (دال) نوسراوە : روباعی مەعدوم بۆ مەهچیرە خانمی خێزانی والی نوسیوە • لە چاپەکەدا لە سەر ئەو پارچە نوسراوە : مەولەوی جارێکیان لە گەڵ برادەرێکی لە شوێنێکی نسرما دائەنیشێ ، تاقمێکی تر لەولاوە بانگی ئەکەن بۆ نایەیتە ئێرە شەماڵ ئەیگرێتەوە ، ئەویش لە وەرامیانا ئەم دوو شیعرە ئەڵێ • (ل : ٥٠٧ ، ف)•

لە (ف)دا لە دوای ئەم روباعییەی مەولەوییەوە شیعری :

**« هەر کاتێ زانا چەم دا وە هەمدا**
**باڵەخانەی چەم دا وە رۆی چەمدا »**

نوسراوە و ، لە سەری نوسراوە : فەردی حەرەمی والی کە بۆ مەعدومی نوسیوە •

---

(١) بڕوانە : محمد امین زکی ، مشاهیر الکرد ، الجزء الثانی ، ص : ١٢ .

دوای ئەوەیش تاکی ژمارە (١٢)ی (خێ) نـوسراوە و ، لە سـەری نوسراوە : فەردی مەعدوم لە جوابی حەرەمی والیدا • لە چاپەکەدا بـاسی حەرەمی والی نیە و ناوی زێباخانمی شاعیرە نوسراوە •

٩ـ لە سەر شیعری یەکەمی (١٧)ی (دال) نوسراوە : فەردی موعەمما بە ئیسمی مەحمود ، لە پاش ئەوە شیعری «زرنگەی صەدای •••»ی کـە شیعری دوهەمی ئەو پارچەیە بە سەرەتای پارچەیەکی سەربەخو دانراوە ، بەم پێیە ئەو پارچە ـ ١٧ی دال ـ دەبێ بە دو پارچە : شـیعری یـەکەم پارچەیەکی (دال) ، شیعری دوەم و شیعرەکانی دوای ئەو پارچەیەکی تـر ئەبن لە (زێ)دا •

## جیاوازی دەسنوسەکان و چاپەکە

بێگومان لە وتاریکی ئاوادا دەرتانی ئەوە نیە قسە لە جیاوازی تەواوی نێوان دو دەسخەت و دیوانێك بکرێت،چونکەکاری وا ماوە و دەرەتانی لەمە فراوانتری دەوێت ، بۆیە من لێرەدا تەنها ئەو جیاوازییانەی بە لامەوە زۆر گرنگن و سود بە رونکردنەوەی هەندێك جێـگا دەدەن دیـاری دەکەم و جیاوازییەکانی تر دەهێلمەوە بە هیوای لێکۆلینەوەیەکی فراوان لـە لایەن سوارچاکی ئەم مەیدانەوە ؛ وا لێرەدا لە پێشەوە جیاوازییەکانی نوسـخەی (م) پێش‌چاو دەخەم :

### جیاوازییەکانی نوسخەی ( م )

١ـ لە نوسخەی (م)دا پارچـەی (٢)ی (کاف)و پارچـەی (٢٦)ی (ئەلف) یەك پارچەن ، بەلام لە گۆڤاری گەلاوێژدا ئەم پارچە (١٨) شیعرە و

پارچەی (٣)ی (میم)یشی لە گەڵدایە (١) ، (ل : ٩٠ ، م ) •

٢ـ لەم نوسخەدا پارچەی :

**« شەمـــاڵ وارانەن ••• •••**
**« زەردی دەر وە رەنگ وەڵگ دارانەن »**

کە سەرەتای پارچەی (٣)ی (شین)ی چاپەکەیە •• (٢٥) شیعرە ؛ (١٢) شیعری پارچەی (٣)ی (شین) و (١٣) شیعری پـــارچەی (٩)ی (هێ) ، وە شیعری : « **خولاصەی کەلام •••** » و شیعرەکەی دوای ئەو کە دوا شیعری پارچەی (٣)ی (شین)ن پارچەیەکی جیاوازن و ، لە ســـەریان نـــوسراوە : ( روباعی ) (ل : ١٠٧ ، م) •

٣ـ بە گوێرەی (م) پارچەی (١٩)ی (هێ) و پارچەی (٢)ی (گاف) و پارچەی (٦)ی (شین) یەك پارچەن ، بەو زنجیرەی کە نوسیمان :

پارچەکەی (هێ) دوایی (گاف) دوایی (شین) ، بـــەڵام پارچـــەکەی (گاف) یەك شیعری لە (م) زیاترە • (ل : ٨٨ ، م) •

٤ـ لەم نوسخەدا پارچەی (٩)ی (ئەلف)و پارچەی (٢)ی (زێ) یـــەك پارچەن • (ل : ٧٥ ، م) •

٥ـ لە (م)دا شیعرەکانی (١) و (٢) و (٤)ی پارچەی (٢٠)ی (نون) و پارچەی (١٣)ی (هێ) یەك پارچەن • (ل : ٨٠ ، م) •

٦ـ بە گوێرەی (میم) پارچەی (١٥)ی (واو) ، کە دو شیعرە ، چوار

(١) بڕوانە : گۆڤاری گەلاوێژ ، ژمارە (٥) . سالی (٩) .

شیعرە ئەم دوو شیعرەی خوارەوەی لە سەرە :

**« ئەر وەستەی ئایر وەردای جە گیانم**
**ئازیز ئامانەن سەبەب جە چێشەن ؟**
**دڵ ها بی وە گەرد ، شەماڵ بەرد پەی هەرد**
**رێزەی مەیل تۆ هێما هەر تێشەن ! »**

( ل : ١١٣ ، م ) •

من بزانم لە دیوانی مەولەویدا ئەمە یەکەم جارە پەیڕەوی یەك قافییە لە تەواوی پارچە شیعرێکدا بکرێت ، وەك دەبینی قافییەی ئەم دوو شیعرە ــ هەروەها دوو شیعری چاپەکەیش ــ ( •• ێشەن )ە •

نیوەی یەکەمی شیعری دووهەمیش لە (م)دا بەم جۆرەیە :

**« دڵ هەر یەکێ بی ئەووەڵ جار بەردت »**

٧ــ لە (م)دا (٥) شیعری سەرەتای پارچەی (٣)ی (پێ) پارچەیەکی سەربەخۆیە • (ل : ٩٢ ، م) •

٨ــ لەم نوسخەدا و لە دوو نوسخەی تردا کە دیومن و ئێستە لە لام نین و لە سەر دیوانە چاپەکە ئیشارەم کردوون ، چوار شیعری دوایی پارچەی (١٢)ی (نوون) پارچەیەکی سەربەخۆیە • (ل : ٧٨ ، م ) •

٩ــ بە گوێرەی (م) پارچەی (٤)ی (بێ) و پارچەی (٩)ی (واو) یەك پارچەن • بەڵام چاپەکە ــ پارچەکەی (بێ)ی ــ دوو شیعری زیاترە • ( ل : ٧٠ ، م ) •

١٠ــ لە (م)دا پارچەی (٧)ی (پێ) و پارچەی (٨)ی (واو) یەك پارچەن و ، هەندێ جیاوازێ تریشیان لە نێواندایە • بەڵام رەنگە نووسەری

(م) (ولە)ی لەبیر چۆبێ ؛ چونکە مانا و شێوازیان هەندێك لە یەك دۆرن • (ل : ١٠١ ، م) •

١١ــ لە (م)دا شیعری یەکەمی پارچەی (٥)ی (خێ) بە جیا نۆسراوە و، لە سەری نۆسراوە (فرد) = تاك • (ل : ٣٨ ، م) •

١٢ــ بە گوێرەی (م) پارچەی (١١)ی (واو) و پارچەی (١)ی (یــێ) یەك پارچەن • (ل : ٥٦ ، م) •

## جیاوازیبەکانی نوسخەی (ف)

١ــ مەلا فەتاحی کاگردەڵێ ــ نۆسەری نوسخەی (ف) ــ لە ســەر شیعری : « **لەیلێ شیفای زام مەجنۆن ..** »ی ، کە لە چاپەکەدا لە پەراوێزی پارچەی (٥)ی (گاف)دا چاپکراوە ، نۆسیوە :

« مەعدۆم بە بۆنەی نەخۆشیێ خوشکی کاکە ئەحمەدی مەجذۆبەوە (خوا رەحمیان لێ بکا ) نۆسیویە • » دوای ئەوە پارچەی (٥)ی (گاف)ی ــ لەگەڵ هەندێ جیاوازیدا ــ نۆسیوە و ، لە سەری نۆسیوە : مەجذۆب لە وەڵامی ئەودا نۆسیویە و • هەروەها لە(م)شدا بەو جۆرەی (ف) دیــاری کراون ، واتە : بەم پێیە دەبێت لە چاپەکەدا ئەو دۆ روبــاعییە گوڕرابن و بە هەڵە لە جێگەی یەکتردا دانرابن • (ل : ٥٠٩ ، ف) •

٢ــ لە سەر پارچەی (٢٦)ی (دال) نۆسراوە :

بۆ قسەکردن لە گەڵ گوڵێکی پەژموردەی ئیفتادەدا فەرمۆیە • بەڵام لە چاپەکەدا دەڵێ : مەولەویێ بەم دۆ شیعرە قسە لەگەڵ گۆزە شکاوێك ئەکا • ( ل : ٥١٣ ، ف) •

٣ــ پارچەی «وەی من دیارەن ...» کە لە چاپەکەدا بە پارچــەی (١١)ی (واو) دەست پێ دەکات ، لە (ف)دا (٢٢) شیعرە : (٥) شیعرەکەی (١١)ی (واو) و (١٣) شیعری پارچەی (١)ی (یێ) و (٤) شیعری تر کە لــە کۆتایی پارچەی (٨)ی (دال)دا چاپ کراون . (ل : ٤٦٦ ، ف) .

٤ــ بە گوێرەی (ف) پارچەی (٢١)ی (نون) دوو شیعری سەرەتــای روباعییە و ، شیعرەکەی دوای ئەو ــ کە لــە چاپەکەدایــە ــ سەرەتــای پارچەیەکی سەربەخۆیە .

زیاد لەوەیش ئەو شیعرەی دوایی پارچەی ناوبراو ــ ٢١ی نون ــ بە تاك لە ژێر ژمارە (١٣)ی (بێ)دا جارێکی تر ، بە هەڵە ، چاپکراوەتــەوە ، ئەم شیعرە ، کە لە چاپەکەدا دوو جار چاپکراوە ، بە گوێرەی (ف) سەرەتای پارچەی (٣)ی (سین)ی چاپەکەیە . (ل : ٣٧٩ ، ف) .

٥ــ لە سەر پارچەی (١٩)ی (ئەلف) نوسراوە : کاتی دوورکەوتنەوەی دۆستان وتراوە . واتە : وەك لە چاپەکەدا دەڵێت بۆ عەنبەر خاتونی خێزانی نەوتوە . (ل : ٤٠٧ ، ف) .

٦ــ بە گوێرەی (ف) پارچەی (٩)ی (واو) و پارچەی (٢٠)ی (دال) یەك پارچەن . (ل : ٣٩٥ ، ف) .

٧ــ لە (ف)دا پارچەی (٥)ی (فێ) و (٢٢)ی (نون) یەك پارچــەن . (ل : ٤٥٩ ، ف) .

٨ــ لەم نوسخەدا پارچەی (٩)ی (شین) و (٢٢)ی (ئەلف) و (١٢)ی دال یەك پارچەن، هەروەها بە گوێرەی ژمارە (١٢)ی ساڵی (٦)ی گۆڤاری

(گەلاوێژ)یش • ( ل : ٤٠٦ ، ف ) •

٩ــ لە (ف)دا دوو شیعری سەرەتای پارچەی (١١)ی (نوون) روباعییە و شیعری « **نامەی ئایرین ...** »ــ کە لە چاپەکەدا سێهەم شیعرە ــ لە چاپەکەدا سەرەتای پارچەیەکی سەربەخۆیە و ، ئەو پارچەیە بۆ وەڵامی قادر بەگی دۆستی مەولەوی نووسراوە • (ل : ٥٠٦ ، ف) •

١٠ــ لە (ف)دا پارچەی (٧)ی (هێ) و پارچەی (١٢)ی (ئەلف) یەك پارچەن • (ل : ٤٥١ ، ف) •

١١ــ بە گوێرەی (ف) پارچەی (١٠)ی (بێ) و پارچەی (٦)ی (شین) یەك پارچەن • (ل : ٤٥٧ ، ف) •

١٢ــ پارچەی (٢٥)ی (دال) لە (ف)دا وا نووسراوە کە (مەولەوی) بۆ (مەهچیهرەخانمی حەرەمی والی) نووسیوە و ، شیعری «هەرکاتێ زانات»ی پەراوێزی پارچەی (١٢)ی (خێ) وەڵامی حەرەمی والییە بۆ مەولەوی و شیعرەکەی ژمارە (١٢)ی (خێ)یش وەڵامی مەولەوییە بۆ حەرەمی والی • (ل : ٥٠٨ ، ف) •

١٣ــ بە گوێرەی (ف) و (م) پارچەی (٢)ی (یێ) (٩) شیعرە و ، بە « **جۆشی کورەی مەیل ...** » دەست پێ دەکات و شیعری « **یاشێخ ...**»ی سەرەتای چاپەکەی لە سەر نیە • (ل : ٣٩٨ ، ف ، ل : ٧٤ ، م) •

١٤ــ بە گوێرەی (ف) لاواندنەوەی کوڕی مەحموودی یاروەیس یەك پارچەی (٥٦) شیعرییە و هەموو پارچەکانی دیوانەکە کە بۆ ئەو لاواندنەوەیە وتراون بەم شێوەیە دەگرێتەوە : پارچەی (١٦)ی (نوون) ، (٣)ی (پێ) ،

(٨)ی (بێ) ، (١)ی (كاف) ، (٧)ی (تێ) ، (١٤) و (٢٧)ی (ئەلف) • ( ل : ٤٩٥ ، ف) •

هەروەها لە دوو كەشكۆلی كەیشدا ئەو لاواندنەوەی كوڕی مەحموودی یارەویسەم بەم شێوە : بە یەك پارچەیی ، دیوە •

بە بڕوای من ئەم تەرتیبەی (ف)ــ كە ئەو شینە یەك پارچە بێــت ــ راستە و ، پێویستە ئەو پارچانەی چاپەكە بەو شێوە هەموو یەك بخرێنەوە ؛ چونكە مەولەوی شین و لاواندنەوەی بۆ گەلێ كەس ووتسیوە ، بــەلام ، جگە لە عەنبەرخاتوونی خێزانی ، بۆ كەس چەند قەسیدەی نەووتسیوە ، بــۆ عەنبەرخاتوونی عەنبەربێز و خێزانی و هاوبەشی ژیانی و دایكی منداڵەكانی كە ماوەیەكی دوور و درێژیان بە یەكەوە بەســەر بردوە ••• زۆر جیــگەی خۆیەتی مەولەوی چەند قەسیدەی بە سۆزی بۆ وتبێ ، بەڵكو زۆر جێگەی خۆیەتی گەلاڕێزانی گوڵعەنبەری مەولەوی بووبێ بە سەرچاوەی ئیلهــامی شیعری مەولەوی و ، لە مەیدانی شین و لاواندنەوەدا شیعریوای بۆ وتبێ و سۆز و كوڵی دەروونی وەها هاتبێتە جۆش كە هیچ مەبەست و ڕوداوێكی تر ئەو كارەی نەكردەبێتە سەر بیری و ، بەو جۆرە هەستی نەبزواندبێ ؛ چونكە هەموو هەڵسوكەوتێك و ، خەوتن و هەستانێك و ، خۆشی و ناخۆشییەك•••و بیركردنەوەیەكی ئەو شۆخە كۆچ كردوەی تێدا بوە و ، برینی كۆنی هاتوەتەوە گل و سوێ • ئەو كارەی ئەو نموونە جوان و مانا ورد و ناسكە بێ ئەركانەی لە قاڵبی لاواندنەوەكانی (عەنبەرخاتوون)دا بۆ تۆمار كردوین •••

بەلام كوڕی مەحموودی یارەویس ، با خۆیشی و باوكیشی زۆر دۆستی مەولەوی بووبن و ، ڕوداوەكەیش زۆر گورچك بڕ بــووبێ و ، دەنگێــكی گەورەیشی لە جیهانی سەردەمی مەولەویدا دابێتەوە ••• و هێشتا شیاوی

ئەوە نەبوە لە گەڵ سەرانسەری ژیانی مەولەویدا بمێنێتەوە و هەر بەین نا بەین پارچە شیعرێکی بۆ وتبێت •

لە گەڵ ئەوەدا کە زۆر جێگەی خۆیەتی بەو پارچە شیعرە درێژە چەند مەبەستێکی پێکابێ ؛ لە لایەکەوە لە سەر زمانی پیری جەژگ بڕاوی کۆس کەوتو شیوەن و رۆڵەڕۆی کردبێت ، لە لایەکی ترەوە خوێنی خۆش کردبێتەوە و ناوبژی کردبێت و هەوڵی ئاشت بونەوەی شێخان و بنەماڵەی یاروەیسی دابێت و ، یادی خوا و قیامەتی بیرخستبنەوە ، وەك ئەم مەبەستانە و شتی تریش لە توێی وشەکانی مەولەویدا ، وەك پزیسکەی چەخماخەی ژێر هەور ، دەدرەوشێنەوە •

١٥ــ پارچەی (٢)ی (کاف) شەش شیعرە ، بەڵام موناسەبەی وتنی لە هەردوٚلادا وەك یەکە • (ل : ٥٠٨ ، ف) •



## ( ملخص المقال )

# جولة في حديقة ادب ( مەولەوی )

بقلم : محمد علي القرەداغی

يستحق الاستاذ عبدالكريم المدرس كل الاجلال والتقدير على دراساته وتحقيقاته العلمية الواسعة في مجال الادب الكردي ، وبالاخص في جمعه وشرحه وتحقيقه لديوان الشاعر الكردي الكبير عبدالرحيم المولوي ، اذ لم يكن بميسور غيره القيام بهذا العمل الجليل ، حيث توفرت له ـ اضافة الى غزارة علمه وثقافته وتضلعه بفنون الادب ـ ارضية خاصة ساعدته على هذا العمل الكبير . ويعتبر تحقيق وطبع هذا الديوان من قبل الاستاذ المدرس اول عمل ادبي كردي متكامل في وقته اتسمت بالدقة والامانة ، اضافة الى السيطرة الكاملة على الموضوع ...

واني لازمت حلقات التدريس عند استاذنا لفترة غير قصيرة ، واغترفت من هذا الخضم الهائل . واشتركت في مجالسه الادبية التي هي مدرسة اخرى من نوع فريد . وكنت اسمع الاستاذ يقرأ قصائد الشاعر الكبير مولوي بشوق وشغف وتذرف عيناه الدموع لتبلل لحيته الجميلة البيضاء . مما حدا بي هذا المشهد المتكرر الى قراءة ودراسة ديوان مولوي . وقد عرفت ان عالم ادب مولوي عالم رحب مترامي الاطراف ، وان شاعرنا يستحق اكثر مما قدم له الى الان . ومن خلال تتبعي لدراسة ديوان الشاعر تبين لي ايضا ان

تحقيق الاستاذ لايخلو عن بعض الهنات التي لم يكن بامكانه تجاوزها بسبب قلة المصادر ، وعدم وجود النسخ المعتبرة اثناء قيامه بذلك العمل .

والامانة الادبية ـ كما يقول الاستاذ المدرس في مقدمة تحقيقه ـ تتطلب منا اضافة كل مايستجد من المعلومات الى هذا السفر المبارك . ومن خلال دراستي المتكررة للديوان ومقابلتي اياه مع بعض المصادر الاخرى تبين لي ان احدد الهفوات في النقاط التالية :

١ ـ اضافة الى ان الاستاذ لم يتمكن من جمع جميع اشعار وقصائد الشاعر فقد سجل في ديوان الشاعر مولوي قصائد هي لغيره من الشعراء .

٢ ـ نجد في بعض الاماكن من الديوان قصيدة واحدة قد تجزأت وتناثرت في الديوان لتطبع هنا وهناك .

٣ ـ كما نجد في اماكن اخرى قطعا متفرقة قد اصبحت قصيدة واحدة . وحين نبحث عن اسباب ذلك نجدها في :

١ ـ ان قصائد الشاعر كلها على وزن واحد ، ولم يستفد من الاوزان العروضية المختلفة .

٢ ـ ان الشاعر لم يلتزم بقافية واحدة في القصيدة الواحدة .

٣ ـ ليست للشاعر بداية متميزة في فاتحة قصائده .

٤ ـ لايذكر في اواخر قصائده ـ الا في القليل ـ لقبه الشعري .

٥ ـ اضافة الى كل ذلك يوجد سبب اخر له دور كبير وهو : اخذ القصائد والاشعار من الافواه وعدم وجود ديوان بخط الشاعر او نسخة مخطوطة على ديوان الشاعر ، او حتى نسخة كاملة موثوقة .

ففي هذه الاسطر احاول ، من خلال مقابلة الديوان بنسختين خطيتين ،

تقديم بعض الملاحظات المفيدة وبيان الاختلافات بين الديوان ، وبين المصدرين المذكورين ، ومعلوم ان بحثا كهذا لايفي بغرض بيان كل الاختلافات ، بل اكتفي بسردها وحتى دون التعمق في دراسة الموضوع ومناقشة التباين ، وبيان الرأي الصحيح تاركا ذلك الى مجاله الخاص وفارسه الخاص • ومنهج بحثي كالاتي :

١ ــ اضافة القصائد الجديدة التي لم تنشر في الديوان •

٢ ــ بيان المناسبات المذكورة في النسخة الاولى ، والتي ارمز اليها اثناء البحث بــ (م) •

٣ ــ بيان المناسبات المذكورة في النسخة الثانية والتي ارمز اليها بــ (ف) •

٤ ــ ذكر الاختلافات الموجودة بين الديوان المطبوع ونسخة (م) •

٥ ــ ذكر الاختلافات الموجودة بين الديوان المطبوع ونسخة (ف) •



# هۆزانا کوردیٓ و هاڤلیا ویٓ ب هۆزانا عەرەبیٓ و فارسیٓڤە

صادق بهاءالدین ئامێدی

ئەڤ هزرە د مەژیێ من دا ژ مێژە جهگیر بیوٓ کو ل سەر هاڤلیٓ و پێوەندا هۆزانا کوردیٓ ب هۆزانا عەرەبیٓ و فارسیٓڤە روهن بکەم ، بەلیٓ پاشی چاڤێ من ب دوٓ گوٓتارا ییٓت کو د کوٓڤارا ب ناڤێ : گوٓڤاری کوٓلێجی ئەدەبیات » یاکو ب ناڤێ پشکا کوردیٓ ل زانینگەها بەغدا بەلاڤ دبیت کەڤتی ئەز پێتر رژد بوٓم کو بیر و باوەرێت خو ل سەر هندە لاییٓت نە دجیٓ خودا دەرببڕم •

ژ ریٓڤە ئەز ب پیٓتڤی دزانم بیر و رایێت توٓڕڤان و روشەنبیرێت کورد و بیانیٓ دەرباری ڤی بابەتی ل بەر چاڤێت خوینەڤانێت بەرکەڤتیٓ دانم و لاییٓت نە د جهیٓ خودا ژی دیار و خویا بکەم • ئیسەڤان و روشەنبیرێت کورد و بیانیٓ د بیر و رایێت خودا دەرباری بابەتیٓ ناڤبریٓ د گەلێر و جودانە •

ماموٓستا عەلائەدین سجادیٓ د کتێبا خودا « مێژوی ئەدەبی کوردیٓ »[1]

---

(۱) سجادی علاءالدین ، مێژوی ئەدەبی کوردیٓ (۱۹۵۲) ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی معارف بەرپەڕ (۵۷۲ ــ ۵۸۰) .

گاڤا ل سەر هاڤلیا ل ناڤبەرا ئەدەبی کوردێ و فارسێ تاخڤیت دبێژیت : « ئەدەبێ کەڤنێ فارسێ کو ئەدەبەکێ دینێ بۆیە ژ ئەدەبێ کوردێ ناهێتە جوداکرن» •

رامان و پەژن ژی (ل دوی گۆتنا سجادێ) ژ ئەدەبێ کەڤن ئەدەبێ بەری (پێشی) ئیسلامەتیێ‌یە ، یان ژی ب جورەکی یا رەنگەکێ دی ئەدەبەکە هەتاکو دگەهتە وێرانبونیا دەولەتا ساسانێ ئو ژ ناڤ چۆنا وێ کو هندەك ژی درێژ دبیت هەتاکو دگەهتە سەرتایێ سەدێت ناڤەڕاستێ • پاشی دبێژیت : ئەدەبێ فارسێ یێ کەڤن یێ کو هێژ مایێ هەتا ئەڤرۆ ، ژ بەر هندە ئەگەرێت ئاڤێستایێ ئەدەبەکێ ئۆلی و ئایینیێ‌یە ئەم نەشێین (نکارن) ڤی ئەدەبێ فارسێ یێ کەڤن دگەل ئەدەبێ دینی یێ کوردێ یێ پێشی ئیسلامێ یان ئەدەبێ کوردێ یێ بەری سەدێت ناڤەڕاست ژێك جودابکەین، بەلکی ئەو ئەدەبێ دینێ یێ کو ل ناڤ کوردادا بۆیە هەر ئەو ئەدەب بیت یێ کو ل ناڤ فارساندا ژی ••• هتد • پاشی دبێژیت چ فارس چ کورد ئۆلێ وان ئەو ئۆلە (دینە) یێ گەلەلێ کەڤن بۆیە ، کو هندەکێت کەڤن باوەری پێ ئینایە ، بەلێ پاشی ژێك جودا بۆینە و باوەری ب بوتپەرستیێ ئینایە هەتا کو زەردەشت ب خو ئو ئۆلێ خوڤە پەیدا بویێ ••• هتد •

پاشی دبێژیت ، ڤێجا هەکو مرۆڤ بەرێ خو بدەتە رێز و رەوەشتان دێ بینت کو نهۆ گەلەك تشت هێژ ل ناڤ کوردان مانە کو د بنگەهـ و بنەتارێ خودا یێت بەری ئیسلامێ‌نە و ئەدەبێ کەڤن کو ئەدەبێ زەردەشتێ بۆیە ، نەمازە ژ ئەدەبێ سنجێ (ئەخلاقی) و جڤاکێ (کۆمەلێ)نە ، وەکو :

١ــ ئەو ڤیان و حەز ژ دار و بارا کرن و دبەرڕا چۆن و حەز ژ توڤچینیکرن •

٢ــ سە (سەگ) خودانکرن ؛ کیٚم مال هەنە کو (سە) تیٚدا نەبن •

٣ــ زێرەڤانیٚیا ژنێت ب تشت (ئــاڤز) دکەن • هــەر چــەند د ویٚ کریاریٚدا بەروڤاژیٚیا ویٚیە ژی کو حــەز ژ راڤ و نێچیرا دکەن ! دیارە ئەڤیٚهە ئەدەبیٚ ئیسلامەتییٚ گوهوریٚیە • هەر وەساژی رەنگە ژ بەر سڕ و سەرما وار و وارگەها بیت ئاگر چ کیٚم یان گەلەك دڤیٚ هەر کریٚبیت• نەمازە د ناڤ کوردانداناڤدارە ئو ل کارە : هەکو مروڤەکیٚ وان مر جــل و کنجێت وی دیٚ دەنە ژار و دەستکورتان • ئەڤ رێز و رەوشــتە یێت کو هیٚژ د ناڤ کورداندا ماین ، ئیسلامیٚ ژی بڕیار ل سەر مانا وان دایە •

ژ کورتیا بیر و باوەرێت سجادیٚ دیار دبیت کو ب هزرا وی ئەدەبیٚ ئۆلی یێ کورد و فارسان ئێك بۆیە نەمازە پــاشی زەرەدەشــتینی ئــانکو «ئۆلیٚ زەردەشتیٚ» دناڤ هەر دۆ نەژادانداا بەلاڤبۆی و باوەری پیٚئینای• مامۆستا سجادیٚ ڤان بڕیارێت هشك و بوچۆنا دەستنیشان دکەت بیٚ کو نمونەکیٚ ژ تۆریٚ هەر دو نەژادان نە ژی چو نیشانەیا ژ بو چەسپاندنــا وان بیر و باوەرێت دەربڕین و بوچۆیی[٢]، دەست نیشان ب کەت، ئەگەرچی

(٢) دوکتۆر محمد غنیمی هلال ، مختارات من الشــعر الفــارسی ، الدار القومیه للطباعة والنشر (٣١٤ هـ ــ ١٩٦٥ ) م ، د سەرتا ویٚدا بەرپەریٚ (١١ ، ١٢ ، ١٣) چەند نمونە ژ هۆزانێت ب ناڤیٚ (گاتاها) ژ ئاڤێستاییٚ راڤاکرینە زمانیٚ عەرەبیٚ ئو گۆتیٚیە : هەر چەند مالك ب ناڤبەرەکیٚ ژێك تێنە جوداکرنیٚ ، بەلیٚ بیٚ کو گوه بدن کێشا ویٚ . پاشی راڤا پرتا پێنجیٚ ژ سترانا چل و چاریٚ ژ سترانێت ئاڤێســتــاییٚ راڤــا دکــەت زمــانیٚ عەرەبیٚ و دبێژیت :

« بەلیٚ هنــدە پرتێت هۆزانا فارسیٚ ل سەرکێشیٚ ڤەهاندیٚنە ، بەلیٚ ب ئاوایٚ جوتکرنیٚ یان «مثنوی» هەر وەکی ب ناڤکریٚ ، کو ئەڤ کێشا هەنیٚ ژی د سیــستما خودا گەلەك نێزیکی کێشا ب نــاڤیٚ کێشــا راموبسـاییٚیە (متعانق) یاکو د هۆزانێت فرەنسیٚ و ئنگلیزیٚدا بەرچاڤە .

نموّنيّت ڤەخويندنيّت (تراتيل) زەرەدەشتييّ مانە ، بەليّ ب ناڤيّ فـارسيّ هاتينە ناڤكرن ، كو ژبەر هنديّ د سەروكانيادا چو ب ناڤيّ ئەدەبيّ كورديّ نەهاتينە دەستنيشانكرن كو بير و باوەريّت ماموّستا سجاديّ بوچوّيى پيّ بيّنە چەسپاندن • ئەگەرچى بيّگومانە كو زەرەدەشتينى ل كوردستانيّ ژى بەلاڤ بوّيە و نيشانە ژى (بەلگە) ئوّليّ ئيّزديە كو هيّژ هەتا نهو ژى مـايە ئو گوهوّڕين تيّدا بوّينە • ژبەر هنديّ بڕيـار دان كو تـوّريّ (ئـەدەبيّ) كورديّ پيّ كەڤن و ئەدەبيّ فارسيّ ئيّك بوّينە هەر وەكى ناڤبريّ بوچويّ هيّژ د تارىيا نەزانييّدا مايە ، مروّڤ نكارت بڕيارەكا هشكا راستييّ ، نـە ژى يا نەڕاستييّ لسەر بدەت ، بەليّ د دەميّ ئەم نهوتيّدا دژين و بيّ تيّكستى ژ راستييّ دويرە هەتاكو نيشانەيەك د دەستدا نەبت ئەو چـەند پيّ بيّتـە چەسپاندن • تشتيّ دمينت ئەو ريّز و رەوشتيّت ماموّستا سجاديّ بو نموّنە ل بەرچاڤان دانايين كو شوينەواريّت ئوّل و ئايينيّ كەڤنيّ زەرەدەشتيّنـە ؛ ديسا ب هزرا من نيشانەييّت گومانبڕ نينـن ، پيّ تڤـى ل دوى چـوّن و هەلشكاڤتنەكا (ليّكوّلينەوە) هوير و كويرا ل سەر خونە ؛ ژ بلى هنديّ نە ب زەردشتييّڤە بەند و بەستىنە ژ بەر ڤان ئەگەريّت ژيّرى :

١ـ د هەمى وارگەهيّت توڤچينيّ و جوتيارييّ ييّت كو ژين و ژيارا مروّڤى كو خوجهى و جهواريّت وى نە ب توڤچينى ، جوتيارى و رەزڤانى و تەرش خودانكردنيّ ، ژ چاندن و داچاندن و كەوال سەخبيّركرنيّڤە بەند و بەستىيە •

ئەو ريّز و رەوشتيّت ماموّستا سجاديّ گوّتين كو حەز ژ دار و بار و شينكاتيّ كرنيّ دكەن بەلاڤ و ناڤدارن و ب هزارا ڤشت ل سەر دانانە • هەر ژبەر هنديّ ژى ريّز و رەوشتيّت (سە) خودانكرنيّ كو چوّ مال بيّ سە نەبن پيّڤە بەندە ، ژبەركو جوتياريّ و رەزڤانيّيا بيّ تەرش و كەوال (ئاژال)

خودانکرن ناچیتە سەری ؛ چونکی «سە» هەڤال ، زێرەڤــان و بەرەڤــانێ شەڤیە ل گوند و ئاڤاهییان نەمازە د بەرێدا کو خو ل باژێرا ژی کەس ژ جان و سامان و ناڤمالیا خو پشتراست نەبویە ؛ ژبلی هندێ کو « ســە » خودانکرن ل گەلــەك وەلاتا نە هــەر ب گوندینیێڤە بەندە بــەلکۆ ب شەهرستانەتیێڤە ژی هەر وەکی د وەلاتێت پێشکەتیدا بەرچاڤە • ئــەڤ جورێ رێز و رەوشت و تیتالان دکومیونیتێت توڤچینیێدا ژ ئەنجامێت جۆر و چیشنێت ژین و ژیارا مرۆڤینە ، ب گوهۆڕین و ڤەژینا ژین و ژیارا وان ژ لایێ ئەبوری ، روشەنبیرێ و جڤاکێ و پێشڤەچۆنێ تێنە گوهۆڕین • بــو نمونە رێز و رەوشتێت کۆچەر و شڤانان یێت چو وارگەهێت جهواربوینێ نەبن ، لێ ل سەرێك ل دوی دەمێت سالێ و بوین و نەبوینا چەرەی و ئێمی (ئالفی) بو تەرشی د گەروك بن ، ژ رێز و رەوشتێت گوندیان ژ رەزڤان و جوتیار و مرێبان یێت خو جھ و جهوار ل گوند و ئاڤاهیان دژیــن جودانە . هندی رەڤەند و کۆچەرن ژ روشەنبیرێ ، زانستێ ئو شەهرستانیێ دویرن ، دەست ل سەر هەلینان و ژ گۆتنا سەرکێش و ســەروکان دەرنــەکەڤتن و مەردینی ژ رێز و رەوشتێت وان یێت بنیاتینە • بەروڤاژێ وان، جۆتیار و رەزڤان و مرێبانە نەمازە یێت ل سەر رویباران ل چەم و دەشتان ل وارگەهێت ژرێڤە یێت شەهرستانیێ ژینە یان ژی شەهرستانی ب هزر و بیر و بزاڤ و خەباتا وان یا ل سەر یەك ل سەر بنگەهێت خورستێ هــاتیە دانــان ، ب ئەردیڤە بەستن و پارزتنا رێز و رەوشتێت باب و باپیران رەوشــتێت وان یێت بنیاتینە • هەروەسا ژی ژ رێز و رەوشتێت گونــدینی و خوجهێت ئاڤاهیان ژ باژێرییان یێت کو کار و پیشێ وان ، بازرگانێ و پیشکارێ (پیشەسازێ) و کارگێری و چاپەمەنێ جودانە • هەر ژبەر هندێ ژی ئەگەر و گروڤێت ئەبوری بنگەهـ و بنیــاتێ رێــز و رەوشــت و ژینــا جڤــاکێ ،

روشەنبیرێ و شەهرستانەتیێ‌یا مرۆڤی‌نــە • کو سوشیولوجســت ئــان سوشیولوگی‌زان ، مەردینی و مێهڤانداریێ ب کۆچەراتییێ‌ڤە دبەستن و کەڤنە پەرستینی و پارزتنا رێز و رەوشتێت باب و باپیران ب رویدانەکا گشکێ یا بەلاڤ ب گوندینی و رەزڤانەتییێ‌ڤە بەند و بەستی‌یە ؛ بەروڤاژی باژێری و هێشــەتیان ییت خویندەڤانی و روشەنبیرێ لێ د بەلاڤ کو ڤەژین‌خواز و گوهۆڕین‌پەروەرن •

بەلێ مامۆستا سجادێ کارتێ‌داکرنا بەلاڤبونیا بوسولمانەتییێ و زمانێ عەرەبێ ل کوردستانێ ژ سالا بەلاڤبوینا وێ ژ (١٧ ــ ١٨)ێ مشەختێ و وێ‌ڤە د زمان و تۆرێ کوردێ هەر ئەڤ هندە گۆتی‌یــە کو کار د بــیر و باوەرێت مللەتێ کورددا کری‌یە [٣] •

سەیدایێ نەمر ئەنوەر مائی د ســەرتا ( پێش گۆتنا ) دیوانا مەلایێ جزیرێ‌دا یاکو ســالا (١٩٦٤)ێ ل هەڤلێــری مامۆستا گیو موکــریانێ چاپکرێ ل دوی گۆتنا وی کو گۆتارێ مائی ب زمانێ عەرەبێ دەرباری ژینەنیگارا جزیرێ تڤیسی ئو وی راڤا کریە زمانێ کوردێ زارێ سۆرانێ گۆتی‌یە[٤] : ژ رێڤە هــەر کەســێ بەرێ خو بدەتە هۆزانێت ( شــعرێت ) کوردێ و دگەل هۆزانێت فارسێ هەڤبەری ئێك بکەت ، دێ وەسا بــو دیاربیت کو تو دبێژی ب درستێ هەر دو هۆزان وەکی ئێك‌بن ، لێ پاشی مرۆڤ ل سەرخو هویرك هزرێت خو د هــەر دواندا بکەت دێ بو دیاربیت نەخێر ئەو هزرا ژرێڤە بو چۆیی راست نینە ژبەرکو وەکی ئێك‌نینن جودایێ

---

(٣) سجادێ علاءالدین ، ئەدەبی کوردی و لێ کوڵینەوە لە ئەدەبی کوردی (١٩٦٨)م چاپخانەی مەعارف بەرپەرێ (١٨٤)ێ رێزا (١١)ێ .

(٤) دیوانی شێخ احمدی جزیرێ ، چاپی یەکەمین ، چاپخــانەی هــەولێر (١٩٦٤) بەرپەر ( ١ــ٢ ) .

و گەلێری‌یەکا نەیا کێم تیٚدا روهن و دیارە •

سەیدایێ نەمر مائی نەگوتی‌یە کانێ ژ چ لاڤە وەکی ئێکی‌یا ژرێڤـە تێتە چاڤ ئو پاشی هزرکرنەکا ل سەرخو ژی ژ چ لاییٚ هۆزانێ گەلێریٚ و جودایێ دیاردبن • ژبەر ڤیٚ چەندیٚ هەر گۆتنەك و بریارەکا ژ خویە ، بیٚ نیشـانە و بیٚ ئەگەر و گرۆڤە ، ژبەکو بیٚ نمونە و تێکستە کو ئەو بریار پیٚ بێتە چەسـپاندن ( برهانکرن ) • هەر رویێ سـەرڤە ژیٚ هاتیـەچاڤ ، هویر و کویر بو نەچویە و چو نیشانە د دەسـتدا نەبوینە کو راسـتیێ ب جارەکی بێخی‌تە روی و دەسـتنیشان بکەت • ژبلی هندیٚ ژی کارتیٚکرنا ئۆلێ ئیسـلامیٚ ( بوسـولمانەتییٚ )و زمان و روشـەنبیریا عـەرەبیٚ ژی پشـت گوهڤە هاڤێتی‌یە •

سـەیدایێ مائی د «روناهییٚدا» هەلبەسـتەکا بابەراخیٚ هەمزانی پیٚ کو ژ ئێلیٚ هەمزان ب میر جەعفەریٚ کوریٚ میر حەسەنی گۆتی چاخ و دەمیٚ لەشکریٚ عەباسـیٚ د دەمیٚ خوندکاری‌یا ( خلافەتا ) « المعتصم باللّه »ی دەسـت ب ئێرشیٚ کری‌یە سـەر ئێلیٚ داسـنیٚ و مزویری‌یا ، وان هەر دوٚ ئێلان بەر سینگ لیٚ گرتی و بەرەڤانیا خـو ب مێرانیٚ کری ئو پێڤەهاتیٚ و شیاین ( کارین ) وی لەشکری بشکێنن • جارا دوویٚ پاشی لەشـکرەکیٚ دی بەردەسـتکریٚ و هنارتی د مەها شەوالا (٢٢٦)یٚ مشـەختیٚ هەڤبەری (٨٤٨)یٚ زاینیٚ ، بابـە راخ پیٚ هۆزان ب وی جەنگی ڤەهاندی ، بـەری میر جعفری ب چەند رۆژا هاتەکـوژتن د شەڕگەها شەڕیٚدا • پاشـی دبێژیت : ئەم دشێین ( کارین ) بێژین ، گۆتن ، کریار و بڕیارێت بابەڕاخی وەکی ئێك بۆن هەر وەکی ژ ڤیٚ هۆزانا وی دیار دبیت[٥] •

(٥) کۆڤارا «روناهی» هژمـارا (٣)یٚ سالا یەکیٚ ، کانونیا ئێـکی ( ١٩٦٠ ) بەرپەڕ (٥ ــ ١٢)یٚ •

میرێ مە ( جعفر ) بزانە
دەمێ مە چەند هزانە
ئێلێ مە یێ نەزانە
بارێ مە یێ گرانە
ئێلێ مە زۆرێ بۆشە
یێ سەر ب پۆش و گۆشە
وەك تەڤ ب مەی بڕۆشە
ئایا هەمە نە خۆشە ؟
پڕ دوژمن و نەیارین
لەورا مشەخت و ژارین
ب هەڤڕا وەك كورەمارین
دگەل هەڤ و دو دخارین
خویایە وا دیارە
ڤێ دزانیت تەیارە
كو بێ سەر و هەرارە
لەو تێ میناكی مارە
داسن و هەمی گوندی
د گەل چەند ئێلێ روانەدی
گەیسین ب ناڤ و جندی
وایس و بناس و هندی
گەر هەڤ ببین یەك كێشە
چما سەرێ مە دئێشە
مینا مرار دكیشە
نەیار ب دار دبیشە
كالین ! وەرن ب هەڤڕا
لاوین ! وەرن ب تەڤڕا
ب دەست خەنجەرێن سەدەفڕا
ب ساز و ماز و دەكڕا
هەڕن د قادێ وەك شێر
ب نەیار بكەن ستیرێ گێڕ
جهێ مە دێ ببیت تێر
جەشن و بهار و پاییز

پاشــی دبیٚژیت : وە دیارە بابە راخی بەری شەڕی داســنیا دگەل عەباســیا ئەڤ هەلبەستە دانایە لەوا دڤیٚ هەلبەستیٚدا گازندە ژ خەلکیٚ جهی کرینە ئو شیرەتا خوجهی بیٚت خوکریٚیە کو خو ئیٚك دل و ئیٚك جان بکەن • بەلیٚ دەمیٚ داسنیٚ و عەباسیٚ ب ناڤیٚك کەڤتین و شەڕ گەرم بوی و شارییٚ بابە راخی ئەڤ هەلبەستە پیٚ گۆت :

**کومیٚــدیٚ خــو ل مەیــدانیٚ ب بەزینـــە**
**دەبانــا خــو تــو ژۆردا داوەشینـــە**
**ب دەنــگیٚ زنجــەوی ل دژمــن بــکە قــیٚ**
**بــیٚ پــاکی خــو ل نــاڤ واندا بهەژینـــە**
**کوڕیٚــت داســن وەکی روســتەم ل پــەیٚتە**
**ل بەژنــــــا وان زریٚ و کومزرینـــــە**
**ب رویمــەت دابژیــن جعفــر هەمــو دەم**
**نــەکو سەرشــوڕ ب دیٚــم و دل ب خوینـــە**
**مــرن شرینتــرە ژ بەنیــاتیٚ و دیــل**
**بهــا مــە خوشــترە ژ مانــا زوینـــە**
**کوڕیٚــت داســـن ب هەڤــڕا وەرنــە قــادی**
**کو قادا جــەنگ ژ مــەڕا شــادی و شهینـــە**
**ل پــەی ( جعفــر ) بهولــن تــەڤ وەکو شیٚــر**
**نەترســن ژبۆشیــا دژمــن چــو نینـــە**
**ژ میٚــژڤە ئــەم دنالــین لــەش برینــدار**
**ئو دژمــن هــەر ب نــالیٚن مــە کەنینـــە**
**ب هــزاران کەفتنــە زینــدان ژ داســن**
**ســەروك و ریٚبــەر تــیٚدا گــش رزینـــە**
**ژن و زارو ژ مەستـــــــــاندن ب زۆریٚ**
**گەهشتــن خــورت و لاوا ســەر بڕینـــە**
**هزار وەك ( بابەراخ) کەڤتن ل ســەر ئــاخ**
**ژ بــرچ و زویــریٚ ب شەڤــڕا مرینـــە**

بیٚ گومان هەر وەکی سەیداییٚ مائیٚ گۆتی ، ناڤ تــیٚدان و توی تیٚدان ( هاندان )یاکو د هۆزانیٚدا دیار و خویایە ، د چاخ و دەمیٚ شەڕ و

ليكدانا هــەر دووان‌دا بويه • ئــەڤ جورێ ناڤ تێدان و تــوى تێدانا شەركەران نەمازە د شەڕ و جەنگ و ليكدان و بەربوينە ئێكا دو لايێت دژمن و خويندارێت ئێــك يان بەرەڤــان و وەلاتيارێــزيت وەلات و جهێ بابينيێ د فولكلورێ كوردێ‌دا ئێكجار زۆره و جورەكێ دەستهەلينانێ‌يه ، نەمازە ژ بو وان كەسێت نەشێن ( نكارن ) هەڤپشك بن ، كو هەلبەستێت فولكلورى‌نه ب پەليڤان و فێهرس و عەكيدا ب دەنگ و ئاواز دبێژن • بو نمونه ســترانا كاويس ئاغايى ياكو ب شــەرێ شێخ مەحمــودێ نەمر و بندستك و دويڤەلانكێت ئنگليزى هلدايى سالا (١٩٢٦)ێ[٦] • بەلێ تشتێ پێتڤى گۆتن ئەڤەيه ، سەيدايێ ئەنوەر مائى نەگۆتى‌يه ژ كيژ سەروكانيێ يان ژ كيژ مرۆڤى ، خو ب زاردەڤ ژى ئو ل كيرێ ئەو هەر دو هەلبەست ب دەســت كەڤتى‌نه • ژ تڤشتەكێ يان ژ فەروزەكا وێ ، ژ دەستنڤيسەكێ ڤەگوهازتى‌نه • ژ بەر هندێ ئەو چەندا پێتڤى زانينێ ، د تارى‌يا نەزانينێ‌دا هێلايه روهن نەكرى‌يه كو نرخەك و بهايەك بو بێتــه دانان كو بنه ئەگەر ، ئەگەرچى دويروكا وى شەڕ و جەنگى دەستنيشانكرى‌يه ، كــو هەكه هاتبا زانــين ســەروكانيا ژێ هاتيه ڤەگوهــازتن و جه و تڤيســەڤانێ تڤيسى دابته هۆزانا ژريڤــه يا كوردى هاتيه ڤەهانــدن ژبەركو باباتاهر هەمەدانى ( ٤١٠هـ ــ ١٠١٠م ) ژى‌يه ئو سەركێشێ هۆزانڤانێت كورده ب بير و رايێت كوردزانا • ئەو هەلبەست ب كرمانجى‌يا بۆتانــه و نەوەكــى هەلبەستێت كلاسيكى بێت وێ دەڤەرێ‌نه د سەدێ نەهێ مشەختى ، پازدێ زاينى و وێڤه كو نمونێت ماين ديوانا مەلايێ جزيرى‌يه، يا زمانێ پێ ڤەهاندنێ جودايه ژ زمانێ وان هەردو هەلبەستان كو كرمانجى‌يەكا خورى‌يه تێــكەلى

(٦) محمد امين زكى : خلاصة تاريخ كرد و كردستان الطبعة الثانية (١٩٦١) ص (٢٦٥) •

عەرەبی و فارسی نینە • ژبەر هندێ دیارەوەکی یا سەدێ نازدێ و بیستێیە•

د• عزالدین رسولی ژی د کتێبا « الواقعیة في الادب الکردی »[٧]دا چاخ و دەمێ دەرباری بەلاڤبوینا « ئسلامێ » ئانکو بوسولمانەتیێ ل کوردستانێ ئاخڤتییە گوتییە : چاخێ بوسولمانا دەست ب ڤەکرنا وەلاتێت نەیێت عەرەب کرییە و بوسولمانەتی لێ بەلاڤکرییە ، زمانێ عەرەبی ژی بویە زمانێ روشەنبیری و زانستیێ ل وان وەلاتان • مللەتێ کورد ژی ژ وان مللەتان بویە یێت کو زمانێ خو یێ ماکێ هێلایە کو زمانەکێ زانستی و ئەدەبی نەبویە ، خوڕتێت کورد ژی چەند سەد سالان د گەل مللەتێ عەرەب هەڤبشك بوینە ، د زەنگینکرن و دەولەمەندکرنا شوینەوارێت ( تراث ) ئسلامێ • پاشی زمانێ وان یێ کوردی ڤەژییەڤە و پێتڤی و گەرەکییا بزاڤ و خەباتێ جارەکا دی سەرێ ژ نوی بەرێ مللەتێ کورد دایەڤە د بەرڕاچۆن و خەم ژ زمانێ کوردی خارن و پویتە پێ کرنێ کرییە • هەلبەستا هۆزانێ یا ژ رێڤە ژی هۆزانا هۆزاڤانەکەیە توی و ناڤا د مللەتێ خو یێ کورد ددەت کو ب مێرانی هەڤبەری ئوتوکراتییا عەباسیان راوەستن بەرەڤانییا وەلاتێ خو بکەن • ئەڤ هۆزانە بویە چەکەکێ خەبات و بزاڤا وەلاتپارێزیێ • هەلبەست ژی بابەروخی هەمدانی گوتییە • پاشی دو چارنا ( چار مالکیا ) ژ هەلبەستێ راڤا دکەتە زمانێ عەرەبی •

د• رەسولی ئەو چەند بیر و باوەر دەست نیشانکرینە بێ کو نیشانەیەکێ ( بەلگەکی ) یان ژی تێکستەکا گومانبڕ ل بەر چاڤان دانیت داکو وان بیر و باوەرێت وی نرخەك و بهایەکێ زانستی هەبیت • ئەڤ پرسیارەنە دجهێ خودانە بێنە کرن : گەلۆ بەری ئسلامێ مللەتێ کورد ب

(٧) د. عزالدین رسول ، الواقعیة في الادب الکردی دار الکتب العصریة صیدا بیروت ص (٥٦-٥٧) .

زمانێ ماکێ ڤیسیێ یه یان ب زمانەکێ دی ؟ ئەو تشتێ پێ ڤیسی مایه یان نه ؟ چ پێ ڤیسیێ یه ، چیرۆك ، چیڤانۆك ؟ سـەرهاتی یا هۆزان ؟ پروس (پەخشـان) یا ڤەخوندنێت ( تراتیـل ) ئۆلی یا ئـایینی ؟ • کو پاشـی بو سـلمانەتی بەلاڤبوی و مللەتێ کورد باوەری پێ ئینایی دەسـت ژێ بەردایه پشـت گوهڤه هاڤێتیێ یه ئو دەسـت ب ڤیسنێ ب زمانێ عەرەبی کرییه پاشی هوی ( فێر ) بویه • ئەڤه ژبلی بیرورا وی کو دەسـت ب ڤیسنێ کرن ب زمـانێ کوردی و ڤەژینا وی ب بزاڤ و خەباتا مللی ئو وەلاتپارێزییێ ڤه بەستیێ یه ئو نیشانەیا وی ژی هەلبەستا بابەراخێ هەمزانی بۆیه یاکو نەمر مائی د کۆڤارا روناهییێ دا بەلاڤکری یا ئەز ب درێژی ل سـەر ئاخڤتیم و من ب تشتەکێ راست نەزانیێ یه کو ئەو هەلبەست د سەدێ (سێ) مشـەختی هەڤبەری نەهێ زاینی هاتبه ڤەهانـدن • دە رەسولی چێتربـو نمونەکا فولکلوری کرِبا نیشانه بەلێ دیاره د فولکلورێ کرمانجـیێ دا دەستهاتی نینه • ژبەر هندێ ئەو بیر و باوەرێت دە رەسـولی حوبرێ ل سەرکاغەزێ پێڤەتر نینن •

دە ئەمـین عەلی موتابچی د کۆڤارا ب نـاڤێ : گۆڤـاری کولێجی ئەدەبیات ، ئو دبن ڤێ مانشێتێ : « شاعران کورد و ئەدەبیاتی فارسـی » گۆتارەك بەلاڤکرییه دبێژیت[8] : ئەڤ گوتارێ ئـەز د ڤێـرەدا بەلاڤ دکەم بریتیێـه ژ پشـکا کێم ژ بابـەتێ ئەدەبێ فارسـی و کارێ کو د شاعرێت کورددا بۆیی ، کو شاعریت کورد ژبلی هۆزانێت ب زمانێ کوردی ڤەهاندین ، هۆزان ب زمانێ فارسی ژی ڤەهاندینه ، هەر ژبەر هندێ ژی ئەز دبێژم کو کار تێ کرنا ئەدەبیات یێت فارسی و نابێژم زمانێ فارسی ، ژبەرکو زمانێ فارسی و کوردی هەڤرەهن ( هاورێشن ) و گەلەك بێژە و زاراڤێت هەڤپشك تێدا هەنه ، ژبەر هندێ ژ رویێ زمانیڤه راست نینه

(٨) گۆڤـاری کولێجی ئەدەبیـات ژماره (١٦) سـالا (١٩٧٣)ێ بەرپـەرێ (٥ ــ ٢٨ )ێ •

بێته گۆتن كار تێ كرنا زمانی ... هتد • پاشـــی ب كورتی ل سەر زمانێ كوردی و فارسی تاخڤيت دبێژيت : د كوردســـتانا مەدا جه و وارگەهێـــت خويندەواريێ پاشی بەلاڤبوينا ئايينێ ئسلامێ مزگەڤت بون ، خويدەڤانێت كورد ژی شێخ و مەلا بۆن • دڤان خويندنگەهاندا ( فێرگەهان ) پاشـــی قورئان دخويند و دويماهی پێ تينا ژ بو هويبۆن (فێربۆن) يا ڤيســـێن و خويندنێ و پروس (نثر) زانينێ چەند ڤشت يێت فارسی دخويندن نەمازە گولستانا سەعدی• ڤيسين ژی ب فارسی بۆ،بەلێ‌وەنەبيت ب گرێ و زەحمەت بيت ، بەروڤاژی ب درستی ، ساناهی بويە ژبەر نێزيكیيا زمانێ فارســـی و كوردی ... هتد • ديوانێت هۆزاڤانێت فارس نەمازە يێت وان كەسێت ژ خودێ ترس و خۆش مرۆڤ د وەلاتێ كوردادا ب نرخ و ناڤدار بوينە ، ژبلی هنـــدێ ژی هـــەڤ ئايين و هەڤ تۆرەيی ( مەذهـــەبی ) يا رێـــكێت ســـوفياتیێ وەكی ســـەعدی يێ شيرازی و حافظێ شـــيرازی و مـــەولانا عبدالرحمن جامی كو ئەڤەنە خەليفە يێت دانەرێت تەريقا نەقشبەندی بۆن• ژبەر ڤان هەمی ئەگەرێت ژۆری هۆزانێت هندە هۆزاڤانێت فارس وەكی سەرمەشـــقان بۆن بۆ هندە هۆزاڤانێت كورد كو ب درســـتی وەكی وان هۆزانێت خـــو ڤەهينن ؛ يان ژی خويندنا هۆزانێت فارســـی د دلێ واندا چوينـــە و كار د واند كرییە • ئـــەڤـــە ژبلی هندێ ژی چو گەلێری و جودايەكا وەسا بەر چاڤ د كوميونيتێ ( موجتەمەعێ ) كوردی و فارسیدا نەبويە •

ژبەر ڤان ئەگەرێت ( هويێـــت ) ژۆری هۆزاڤانێت كورد ســـەر ب هۆزاڤانێت فارسڤە بۆن د ڤەهاندن و كێش و لێك ئينان و بابەت و لايێت هۆزان پێ هلداين ، بەلێ هندەكێت دی يێت كورد ب بابـــەتێ هۆزاڤانێت فارس هۆزان ڤەهاندنە ، بەلێ ب ئاوازەك و لێك ئينان و ڤەهاندنەكـــا

خومالی یا خو ، یان ژی گۆتن و پەیڤ و ئاخفتن و زاراڤێت هوزانڤانێت فارس د هەلبەست و هۆزانێت خودا ب کار ئینانینە نەمازە بێژە ئو پەیڤ یێت فەلسەفی • پاشی ناڤێت چەند هۆزانڤانێت کورد و یێت فارس ب رەخ ئێکڤە داتنیت : ـ

١ ـ شێخ ئەحمەدێ جزیری و ( حافظێ شیرازی ، جامی ، جلال الدینێ رومی و سعدی ) •

٢ ـ ئەحمەدێ خانی و ( نظامی گنجوی و مولانا جامی )

٣ ـ سالم و ( حافظی شیرازی ) ••• هتد •

ئەو بیر و باوەرێت دە موتاپچی ب لایێ گشکیڤە رەنگە تێزیکی راستیێ بین د چاخ و دەمێ کوردستان دبن دەستێ دەولەتا ساسانیان و بەری وان ژی ژ خوندکارێت خوندکاری ل مللەتی کورد ب هەمیڤە کری کو کورد و فارس و مللەتێت دی یێت دگەل دژین بوتپەرست و رەنگە هەڤ نەژاد ژی بوینە • بەلێ مخابن ئەڤ چاخ و دەمێ هەنێ هێژ د تاری‌یا نەزانیێدا بەرزەیە روهن وروشەن نینە ژبەرکو چو شوینەوار د دەستدا نینن خو سوی ژی پێ بێنە شکاندن •

بەلێ پاشی بەلاڤبوینا ئسلامێ د سەدێ ( ١٧ــ١٨ )ێ مشەختی و بەلاڤبوینا زمانێ عەرەبی کو زمانێ ئۆل و ئایینێ نوی و روشەنبیریێ بویە گوهورین یێت بنیاتی ئو بەرچاڤ د کومیونیتێ کوردیدا وەکی کومیونیتێ نەژادێت دژی یێت ئۆلی ئسلامێ لێ بەلاڤبویی بۆنە وەکی فارس ، تورك و هندوکان هتد • هەر وەسا ژی پاشی دەولەتا صەفەوی د سەرێ ( ١٥ــ١٦ )ێ زا • د چەند دەلیڤاندا کوردستان ڤەگرتی‌یە دیسا گوهورین د کومیونیتێ کوردیدا بۆیە نەمازە لایێ رۆژهەلاتێ یێ ب

ئیٚرانیڤە بۆیە ، بەلیٚ سەردەم بۆیە زیٚدەبار لایێ باکوریٚ روژئاڤا ، رۆژئاڤا و شەرگەهیٚ کو ژ لاییٚت پیٚشی بوینە ییٚت کو کەڤتینە د بن فەرمانداری‌یا عوثمانی پاشی ب هیٚز و ڤەژەن کەڤتی و دەستیٚ خو دانایە سەر ٠ بەروڤاژی لاییٚت رۆژهەلاتیٚ و رۆژهەلاتا ژیٚری کو پیٚتر د بن خوندکاری‌یا صەفەویانڤە بوینە ، ژ بن خوندکاریا عوثمانیان ٠ هەر ژبەر هندیٚ رەنگە د زمانیٚ کوردی‌دا زاریٚت ئیٚکجار ژێك جودا ژیٚ درست بوینە وەکی زاریٚ کرمانجی و سۆرانی ٠ کو لاییٚت زاریٚ کرمانجی لیٚ بەلاڤ وەسا دیارە کو کیٚمتر دبن خوندکاری‌یا فارسانڤە بوینە ئو پیٚتر دبن خوندکاری‌یا دەولەتا بیزەنتی یان رومی و عوثمانیان ٠ بەروڤاژی لاییٚت کوردستانیٚ ییٚت کو پیٚتر د بن خوندکاری‌یا فارسان و کیٚمتر دبن خوندکاری‌یا عوثمانیان ٠ ژبلی پیٚ بڕی‌یا د ناڤبەرا واندا بۆیی ژبەر شەڕ و هنگامیٚت ل دوی ئیٚك د ناڤبەرا وان هەر دو فەرمانڕەوایێت کوردستان دبن دەستیڤە، ئەگەرچی سەلاجقە ییٚت کو عثمانی د ناڤ واندا دژین و پەروەردە بوین و بوینە میراتگریٚت وان ، تورك بوینە ژ لاییٚ نەژادیڤە و فارس بوینە ژلاییٚ تۆری ( ئەدەبی ) و تۆرڤانییڤە ، ژبەرکو زمانیٚ فارسی زمانیٚ رەسمی بیٚ وان بۆیە ئو زمانیٚ رەسمی بیٚ دەولەتا عوثمانی ژی بۆ بۆ کارگیٚری و دیوانیٚت وان هەتاکو دەمیٚ خوندکاری‌یا سولتان مرادیٚ یەکیٚ (٧٦١)یٚ مشەختی هەڤبەری (١٣٥٩)یٚ زایینی[٩] ٠

ئەڤ ژێك جودابۆینی و ژێك ڤەبوینا مللەتیٚ کورد و بندەستی‌یا وان د بن دوّ خدندکاری ییٚت دژمن و نەیارا ، کیٚمبوینی ، یا نەبوینا ریٚکێت هاتن و چۆنی ییٚت کو دبن زیٚرەڤانی‌یا ریٚگر و میرشەلیناڤە ژ بلی

(٩) حسین مجیب المصری ، تاریخ الادب الترکی القاهرة ١٣٧٠ هـ - ١٩٥١م ص (٣٨ - ٣٩) ٠

ڤەدەربوینییا وان دەمەکێ درێژ ، چەند سەد سالان ، جودایێ و گەلێری د زمانێ کوردی ، زمانی ماکێ پەیداکر هەتا خو گەهشتە رێزمانێ ژی • نیشانەیێت ددەستدا ییت کیم کار تێ کرن ( تأثیر ) یا زمانێ فارسی د زارێ کوردی کرمانجیدا یێ کو کیمتر د بن خوندکارییا فارسانڤە بویە ب هزرا من ئەڤ لاییت ژێرینە :

١ ـ جودایی ییت رێزمانێ د ناڤبەرا زمانێ فارسی و زارێ کرمانجی ئەڤێت ژێری بەرچاڤن :

أ : دەمێ پاشی ( مستقبل Future ) دزارێ کرمانجیدا هەیە ب دو جورا دەمێ پاشی نێزیك و دەمێ پاشی دویرتر وەکی زمانێ فرەنسی و ئنگلیزی و دزمانێ فارسیدا وەکی کرمانجی ب نیشانێ ژێك ناهێتە جوداکرن بەلێ بکرنەکا هاریکار •

ب : نێرینی و مێینی د زارێ کرمانجی ب ئالاڤان و نەبوینا وان د فارسیدا •

ج : جوداییا بەرچاڤ د جهناڤێت کەسیدا کو د زارێ کرمانجیدا دو جوین ل کارن هەڤبەری جوینەکێ د فارسیدا و جودا د هەڤەکی ل کارن ، نە ب کرنێ ( فعل verb ) یان ژی ناڤی ( الاسم Noun ) یا پێربەستێ ( حرف Preposition )ڤە تێنە نویساندن بەروڤاژی فارسی •

د : کرن د ئاوایێ پەنی ( معلوم Active ) و نەپەنی ( مجهول Passive ) ب زارێ کرمانجی وەکی زمانێ ئنگلیزی و فرەنسی ب کرنەکا هاریکار ساز دبیت بەلێ ب فارسی سەر پێتر ب عەرەبی ڤەیە •

٢ ـ هۆزان ڤەهاندن د زمانێ کوردیدا ژ رێڤە ب زارێ کرمانجی بویە ، ئەگەرچی ب زارێ هەورامی هۆزان هاتیە ڤەهاندن ، بەلێ

گەلەك زمانزان ڤی زاریٚ کوردی ب تایەکیٚ دویریٚ زمانیٚ کوردی دادنــن ئو پیٚتر ســەر ب فارسیٚڤە ب ناڤ دەکەن • هەر ژبەر هندیٚ ژی زمانیٚ فارسی ییٚ کو دە موتابچی د گۆتاریٚ ناڤبری‌دا گۆتی کو تایەکە ژ زمانیٚت ئیرانی ییٚت رۆژئاڤا[١٠] ، بەلیٚ ل دوی گۆتنا زمانزانان پەهلەوی ( فهلوی ) فارسی‌یا ناڤەڕاست کو زمانیٚ ساسانیان بۆیە د بن کار تیٚ کرنا زمانیٚ ئارامی ییٚ سامی‌ڤە بویە وەکی عەرەبی[١١] •

ئەو زمانیٚ چەند سەد سالان تیٚکەلی و هاڤلی ب زمانیٚ فارســیٚڤە ب ریٚکا تیٚکەلبوینی شــەنگستەییٚت جڤاکی د ناڤبەرا ئاخڤتنکەریٚت هەر دو زمانان‌دا ئانکو پەهلەوی و ئو ئارامی بیٚژە ژ هــەر دوّ زمانان تیٚکەلی ئیٚك ( هەڤ ) بوینە • پاشی فارسان دەست ب ڤەگرتنا وەلاتیٚت چارکنار ژی کری کو ب سەر جهیٚ خوڤە بەردەن ، وەرگیٚریٚت ئارامی دانەکاری ئانکو ب کارئینان داکو ژ زمانیٚ ئارامی بابەتیٚت روشــەنبیری وەرگیٚڕین یان ژی ڤەگوهیٚزن پــەهلەوی ، ژبەرکو ئــارامی کربو زمانیٚ رەســمی • ب ڤی ئاوایی پاشی دمەکیٚ دریٚژ زمانــیٚ ئارامی کارەکیٚ ئیٚکجــار مــەزن د پەهلەوی‌دا کر ، نەکو ژ لاییٚ زاراڤ و بیٚژەیان‌ڤە ، لیٚ بەلیٚ ژ لاییٚ ریٚزمانیٚ ژی‌ڤە وەکی نیشــانیٚت یان ئالاڤیٚــت پرینییٚ ( جمع ) و جهناڤ ( ضمیر ) و ناڤیٚت نیشانکرنیٚ و پرسیاریٚ و ئالاڤیٚت پیٚوەندی و گەلەك کرنان ، کــو ئەڤە نیشانەیەکا گومان برا شەنگستیٚت فارســی‌یا پەهلەوی‌یە ب زمانــیٚ ئارامی‌ڤە[١٢] • ئەو زمانیٚ کو پەهلەوی پیٚ دهاتە ئڤیسین ل دوی ڤەحەجاندنا

(١٠) گۆڤاری کولیجی ئەدەبیات بەرپەریٚ (١١)یٚ ریٚزا سیٚ ژیٚدەریٚ بەریٚ .
(١١) دکتۆر حسین مجیب المصری ، صلات بین العرب والفرس والترك دراسة تاریخیة أدبیة ص (١١٧ـــ١١٨) .
(١٢) دکتۆر حسین مجیب المصری ، صلات بین العرب والفرس والترك ژیٚدەریٚ بــەریٚ .

( تهجئة ) دگۆتنێ ( هزوارش ) یاکو ژبو جوداکرنا بێژەیێت نەپەنی بـو ب کار تینا ، ژبەرکو هەکە تڤیسەڤانەکی ڤیابا بێژەیا « گۆشت » ب فارسـی بنڤیسێت ، دڤیا بێژەیا ئارامی « بسرا bisra » تڤیسیبا و ب « گۆشت » خویندبا • هەر ب وی جۆرەیی بێژەیا « نان » دنڤیسی « لخمه Lexme دخویند ، یان ژی زاردکر « نان » • ب هزرا من ئەڤ کار تێ کرنا زمانێ ئارامی و عەرەبی د پەهلەوی‌دا کری ، ب رێکا فارسی د هندە زارێـت کوردی ژی‌دا بویـە نـەمازە ئـەو لایێت وەلاتێ کـوردا یێت نێزکتر ژ جهێ فارسان و پێتر دبن خوندکاری‌یا وانڤە بوینە ، بەروڤاژی لایت دویرتر و کێمتر تێکەلی د گەل و دبن خوندکاری‌یا وانڤە ، کو جودایا وارگەهی ، جودایی بەرە بەرە د زمانێ‌کوردی‌دا کریە هەتا کوگەهشتیە رادەیەکا وەسا کو ئاخڤتنکەریت زارێت جودا نەشـیاینە ب درستی تێك بگەهن وەکی هندە زارێت کرمانجی و سۆرانی یان کرمانجی و لۆری • هەکە ژلایێ وارگەهی و کومیـونیتی ژی‌ڤە بەرێ خـو بدینێ ، کورد و فارسـان هەڤبـەری ئێك بـکەین دیسـا دێ بینـین جودایی هەر هەبـۆیە ، ژبلی چاخ و دەمـێ بوت‌پەرسـتێ و زەرەدەشـتیێ ، کو دیسـا چو سـیناهیەك ژی نینـە وێ چەندێ روهـن و روشـەن بـکەت ژبلی چـیرۆك و چیڤانۆکێـت بێ ئەگەر و چـو راسـتی ژبۆنە ، کو بنە جهێ باوەرێ و پشتراستیێ • پاشی بەلاڤبوینا بوسلمانەتیێ بێ گومان جودایەکا بەرچاڤ هەبویە ل ناڤبەرا کومیونیتێ کوردی و فارسی نەمازە د وان کومیونیتان‌دا یێت کو د ڤەدەر ، دویر و نە ل سەر رێکێت بازرگانیی و هاتن و چۆنێ و نە دبن خونـکاری‌یا فارسـانڤە وەکی لایێ رۆژئـاڤا و رۆژئاڤا باکورێ کوردستانێ کو پێتر ب رومان و سەلاجقە و عوثمانیانڤە بەند وبەسـتی بۆن • بەروڤـاژی وان لایێ روژهـەلات و رۆژهـەلاتا ژێـری بۆنە کو

خویندنگەهێت وان ل سەر رێز و رەوشتێت ئیرانیان بوینە د خویندنا هژمارەکا پێتر ژ کتێبێت فارسی و زانیاری یێت ئسلامی یێت کو ب زمانێ عەرەبی بوینە • ژ وان خویندنگەهێت کوردی یێت کو کێمتر ب ئیرانیانڤە بەند و بەستی ، خویندنگەهێت ژۆری و رۆژئاڤا کوردستانێ بوینە • نیشانەیا ڤێ راستیێ ژی ئەڤەیە ، د خویندنگەهێت دەڤەرا بوتان ، دیاربەکر و بەهدینان بدلیس و موش و هەکاری و وان •• هتد ، هندەکتێبێت کوردی ژبلی یێت عەرەبی و فارسی‌نەمازە د نیڤا دوویێ ژ سەدێ هەڤدێ وێڤە ب دەرس د هاتنە خویندن وەکی :

١ ــ « شرح العزی » یا مەلا حسینێ شیڤکی

٢ ــ « کتاب الظروف في النحو » یا مەلا یونسێ ئەرقەتینی

٣ ــ « معرب عوامل الجرجانی » یا مەلا یونسێ ئەرقەتینی

ئەو هەر سێ تڤشت د ناڤ شاگردێت کورددا دبەلاڤبون و ب دەرس دهاتنە خویندن[١٣] • ژبلی رەشبەلەکا ( رسالة )یا مەلا محمد ئەرڤارسی د زانستێ دوختوریێدا ( علم الطب ) • ئەڤ تڤشتەنە ، ژبلی یێت ڤەهاندی ل سەر دەریاییێت عەروزا عەرەبی و هندە دەریاییێت خومالی وەکی :

أ ــ « نهج الانام فی علم الكلام » ل سەر دەریا ب ناڤێ « المتقارب » ب ناڤ دکەن یا زانایێ مەزن سەیدایێ هەمی زانایێت چاخ و دەمێ خو شێخ خەلیلێ سێرتی •

ب : مەولویدناما باتەیی ل سەر دەریا ( الرمل ) ڤەهاندی •

جـ : نوبیهارا ئەحمەدێ خانی یاکو ل سەر سێزدە دەریان ڤەهاندی

(١٣) یوسف ضیاء الخالدی ، «الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیه» (١٣١٠)ھ ستامبول ص (٢٦٧) •

... هتد [١٤] • ژبلى ڤان ژى ، ديوانا مەلايێ جزيرى ، رسالەئى « تحفة النحلان فى زمانى كوردان ، رسالەيكە د بەحسا هنــد فەرق و جودائى د نيڤ لوغاتێد ئەكرادان » ؛ « صرف و بعض أصول لازمه ب تعليمه ب زمانێ كورمانجيه • خەبەردانا زمانێ كورمانجى ... هتد[١٥] • كو ژ خويندنا وێ هژمارا كتێبا ييێت كو گەلەك ژێ ب كرمانجىنە ، ديار و خويا دبيت كو ژ ســەدێ ( ١٥ــ١٩ )ێ زاينى ل وان خويندنگەهێت ل دەڤــەرێت ناڤبرى هژمارەكا نەيا كێم ژ روشــەنبير و هۆزاڤانان پويتە ب زمانێ كوردى كو زمانێ ماكێ بويە كرىيە • هــۆزان پێ ڤەهانــدىنە وەكــى تەرموكى ( تەرماخى ) ، عەلى حەريرى ، مەلايىجزيرى ، فەقێ تەيران ، مەلايــێ باتەيى ، مەلا مەنصورێ گێرگاشى ، ئەحمەدێ خانى ، اسماعيلێ بايەزيدى شەرەفخان ، مرادخانێ بايەزيدى ، عبدالصمد بابەك ، خالد ئاغايێ زێبارى ... هتد • بەلێ ئەو شوينەوارێت كوردى ب چيشن و ئاوايەكێ خومالى يێ ئسلامى ڤيسىنە كو ب زمانێ كوردى ، عەرەبى ، فارسى و گەلەك كێم ژ توركى ژى تێكەلى ئێك كرينە نەمازە د ڤەهاندنا هۆزانا ، چونــكى زمانێ ڤيسينێ و خويندنێ يێ وى چاخ و دەمى يێ وەســا بويە ، هەكە وەسا نەڤيسىبا چو نرخەك و بهايەك ژبو نەدهاتە دانان هەر وەكى ســەيدايێ خانى يێ مەزن ئەو راستى وەكى رۆژا نيڤرو د مەم وزينا رەنگيندا روهن كرىيە گۆتىيە :

چ بــكەم قــەوێ كەســادە بازار
نينن ژ قماشــرا خريــدار[١٦]

---

(١٤) يوسف ضياء الخالدى : الهديه الحميديه في اللغة الكرديه ژێدەرێ بەرێ.
(١٥) م. ب. رودێنكو ، دەستنڤيسێت كوردى موسكو ١٩٦١ .
(١٦) م. بوز ارسلان ، مەم و زينا ئەحمەدێ خــانى استــامبول (١٩٦٨)ێ بەرپەر (٦٢) .

هەر ژبەر هنــدێ ژی چەند شوینەوارێــت مایی ب وی جوری هاتینــە ڤیســین • هەر وەکی هاتیــە گۆتن کو هۆزان ب هــەورامی ژی د وێ دەلیڤێدا دهاتە ڤەهاندن • بەلێ گۆتنا دە موتاپچی دەربــاری دیــوانێت هوزاناتێت فارس نەماز ژ وان یێت ژ خودێ ترس و خۆش مرۆڤ ب نرخ و بها بوینە ، بێ گومانە د جهێ خو دایە ، ژبەرکو ســوفیاتی ل رۆژ هەلاتا ناڤەراست و ناڤێدا بەلاڤبویە و گەشداربویە • بەلێ نە دیوانێت هوزاڤانێت فارس ب تنێ بەلکو یێت عەرەبی و تورکی ژی هەتا رادەکێ ، چونکی ژ خودێ ترسی و سوفیاتی پەسنێت خۆش مرۆڤی ، چاکی ئو پەییسك و پایە بلندیێ بوینە هەکە د هەمی زانا و روشەنبیرادا ، ژ عەرەب ، فارس ، تورك و کوردان‌دا نەبانا ب چو جۆر و رەنگ و ئاوایا ب ناڤ نەدکەڤتن ، هەتا خو خوندکار و پسمیرا ژی خو ب هندێ تینا دەر و دیاردکر و ب چاڤەکێ بلند بەرێ خوا ددا زانا ئو روشەنبیرا نەمازە خوندکارێت کورد • بەلێ گۆتنا دە موتابچی کو دیوانێت هوزاڤانێت سۆفی یێت فارس وەکی ســەعدی شیرازی ، حافظ شیرازی و مەولانا جامی و جەلال‌الدین الرومی هۆزاڤانێت کورد بو خوکربۆنە سەرمەشق هۆزان ل بەر ڤەدهینان ، ل دوی زانینا من و نموێت دە موتابچی د گۆتارێ ناڤبرێ‌دا ل بەر چاڤان داناین ژ راســتیێ دویرە ؛ نەمازە نمۆنا یەکێ کو مەلایێ جزیری ب حافظێ شیرازی ، جامی و جەلال‌الدین رومێ و ســعدێ شیرازێڤە بەنــد بویە د ڤەهاندنا هۆزانا • چێترین نیشانە ژبو نەراستیا وێ بۆچۆنێ ئەڤ مالکا ژیری‌یە یا جزیری یا کو دە موتابچی ب خو ژی د گۆتارێ خودا دەست نیشانکری‌یە :

**گەر لۆلۆی ( منشــور ) ژ نەظمێ تــو دخــوازی**
**وەر شعری مەلێ بینە تە ب شیرازێ چ حاجەت**

هەر وەسا گۆتنا دە موتابچی دەربری کو هندە هۆزاڤانێت دژی ییت کورد ب بابەتێ هۆزاڤانێت فارس هۆزان ڤەهاندینە و ب ئاوازەك و لێك ئینانەکا خومالی ، یان ژی ، گۆتن و بێژە ، پەیڤ و زاراڤێت هۆزاڤانێت فارس ددانەکاری د هەلبەستێت خودا ب کارئینانە نەمازە بێژە و گوتنێت فەلسەفی ؛ ئەڤ بیر و باوەرە ژی دیسا نە دجهێ خودایە ژبەرکو ئەو کار و کریار ئانکو ب کارئینان ل کار و بەلاڤبوینە د ناڤ هەمی هۆزاڤانێت بوسلمان‌دا ب جارەکێ نەخاسمە د ناڤ هوزاڤانێت رێکێت سوفیاتیێ گرتی ، چ عەرەب ، فارس، تورك ئان کورد بوینە ژبەرکو تابعێ هۆزان ڤەهاندنا ئسلامی بویە • فارسان رێکا هۆزاڤانێت عەرەب گرتبو ل سەر دچۆن ، تورك ل سەر رێچا فارسان دچون و کوردا رێکا وان گرتبو • نیشانە ( بەلگە ) ژ بو راستی‌یا وێ چەندێ ، هژمارەکا هوزاڤانێت فارسە ، ییت کو دبن کار تێ کرنا هۆزاڤانێت عەرەب‌ڤە بۆن ، کو چێترین نمۆنە «منوجهری»یە[١٧] ( أبو النّجم أحمد بن قوص دامغانی ) یێ کو د سەرێ سەدێ پێنجێ مشەختی هەڤبەری سەرێ سەدێ یازدێ زایینی ژی‌یە ئو شەهرستانیا ئسلامێ کارەکێ ئێکجار مەزن د هز و بیر و باوەرێت وی‌دا گریە ، کو هۆزانا عەرەبی د هەر سێ قوناغێت بنگەهی ییت خودا ژ دەمێ « جاهلی » « أموی » و « عبّاسی » د هۆزانا وی‌دا دیار بویە ، کو ناڤبری ب دارێژتن و ڤەهاندنا چاوەکا فارسی لێك ئینایە[١٨] •

هەر وەکی منوجهری سەعدی شیرازی ب هوزاڤانێ ناڤدار «متنبی» حەیران بویە ، کو دێ ب درێژی ل سەر ئاخڤم • هەر وەکی هوزاڤانێت فارس ، هۆزاڤانێت تورك ژی نەمازە ییت ژ خودێ ترس و سوفی ، ب

(١٧) دكتر ذبيح الله صفا « كنج سخن» شاعران بزرگ پارى جلد اول .
(١٨) الدكتور على الشابى ، الادب الفارسى في العهد الفزنوى (١٩٥٥) .

بابەتێت هۆزاڤانێت فارسی و ب بێژه و پـەیڤ و زاراڤێت وان هۆزان ڤەهاندینه • ب کێش و سـەنگاندنا وان سەندگاندینه ، كو چێترین نمونه ژی ، ( جلال‌الدین رومی ) یێ فارس ویێ ل قونییێ جهوار بوییه ، هوزاڤانێ ژ رێڤه بویه كو هۆزان ب زمـانێ توركی ڤەهاندین[١٩] ، پاشـی تەریقا مەولەوی ل وێرێ بەلاڤبوی و ڤیایه مریدێت وی یێت تورك یێت نەزان تێ بگەهن • پاشی وی هۆزاڤانێت تورك وەكی عاشق پاشایی « كلشهری یێ سوفی و گەلەكێت دی ل سەر رێچا وی چۆینه هەتا كو پاشی نیڤا دوویێ ژ سەدیێ پازدیێ زایینی[٢٠] •

دمینیت گۆتنا دە موتابجی د گۆتاریێ نـاڤبری‌دا ، دەمێ دبێژیت : هۆزاڤانێت كورد هۆزان ب زمانێ فارسـی ژی ڤەهاندی‌نه نه ب تنێ ب كوردی ، كو ب كار تێ كرنا فارسی بویه و نیشانەكه ژبو چەسپاندنا بیر و را خو ، دیسا د جهێ خودا ب درستی نینه ، ژبەركو هۆزاڤانێت كورد ، هۆزان ب عەرەبی و ب توركی ژی ژ بلی فارسی ڤەهاندی‌نه ، چێترین نمونه مەلایێ جزیری‌یه كو هوزان ب فارسی و ب عەرەبی ، ب كوردی و عەرەبی تێكەل ، و چار مالكی‌یا سەیدایێ خانی یاكو ب چـار زمانان ، عەرەبی ، فارسی ، توركی و كوردی ڤەهاندی نیشانەیه و گروڤه ژ بو ویٚ راستییێ كو ئەڤ چارنا ژێری چارنا یەكی‌یه دیٚ ل بەر چاڤان دانین :

فات عمـری في هواك یا حبیبی كـل حـال
آه و نالم هم دمم شـد در فراقت ماه و سال

---

(١٩) محمد حرب عبدالمجید الادب الترکی المعاصر المكتبة الثقافیة سنة (١٩٧٥) ص (٣-٦) •

(٢٠) حسین مجیب المصری تاریخ الادب الترکی ص (٤٥) •

گر بنم قانم دلرسن چوق دن اولمشــدر حال
دین و ئەبتەر بۆم ژ عشقێ من نەما عەقل و کەمال(٢١)

هەر وەسا ب هزرا من ئەو نمونێت دە موتابچی ل بەرچاڤان داناین ژبو چەسپاندنا بیر و را خو کو چەند مالك ژهۆزانێت وان بۆن یان ژی هەلبەستەك ددیوانا واندا وەکی هەلبەستا : نەوایا موطرب و چەنگی فغان ئاڤێتە خەرچەنگی ... یا دیوانا مەلایێ جزیریدا ، تشتەکێ سەرڤە سەرڤەیە نە کاکلە کو ل دوی چــۆنەکا زانستییە ، ژبەرکو ئــەو رویێ ســەرڤە د هۆزانێت بوسلماناندا نەمازە یێت سوفیاندا بەلاڤە وەکی حافظ شیرازی ، احمد پاشا ، محمد الفاتح ، جامی و محمد الفاتحی ، هەر ژ عەرەب و فارسان، سعدی شیرازی و متنبی هتد . ژبلی هندێ ژی دیارکرنا دەستهاتنا جزیری تێدا دیار دبیت .

دە محمد محمد نوری عارفی د کۆڤارا ب ناڤی : « گۆڤاری کولێجی ئەدەبیات»(٢٢) گۆتارەك ب ڤێ ناڤ و نیشانێ « تەئسیری زمان و ئەدەبی فارسی لە سەر ئەدەبی کوردی » بەلاڤکرییە گۆتییە : ئەدەبێ کوردی یێ ڤیسی هەر ژ رێڤە ئانکو سەرێ دیاربوونییا وی و هــەتا ژ ناڤ چۆن و نەمانا دەولەتا عوثمانی و درستبوونییا دەولەتا عراقێ هاڤلی و شەنگستێت ب هێز د گەل ئەدەبێ فارسی هەیە و هێژ مایە بەردەوامە . ئەڤ هاڤلی و پێوەندییە یا ڤان هەر دو ئەدەبان بو ئەگەرا کار تێ کرنا ئەدەبێ فارسی د ئەدەبێ کوردیدا . پاشی دبێژیت : ئەڤ چاخ و دەمە من ب قوناغا یەکی دانایە کو نێزیکی شەش سەد سالانە بەر ب نهو ئو ژ مەلا پەریشانی دەستپێ

(٢١) عبدالرقیب یوسف ، دیوانا کرمانجی (١٩٧١) بەرپەرێ (٤٣)ێ .
(٢٢) گۆڤاری کولێجی ئەدەبیات ژمارە (١٨) سالا (١٩٧٤)ێ بەرپەرێ ( ٧٢ ــ ٩٢)ێ .

دکەت ، ژبەرکو ئەو ئانکو هۆزانێت پەریشانی کەڤنترین بەرهەمێ ئەدەبێ کوردی یێ ڤیسیڤە ، یێ کو هەتا ئەڤرو بەردەست بویە ، کو د ڤی چاخێ هەنێدا بێژەیا فارسی د شعرا کوردیدا تێتە دیتن • پاشی هاڤلییا مەلایێ جزیری ب حافظێ شیرازیڤە ب رێکا هەلبەستا جزیری یا ناڤبری ب هەلبەستا د دیوانا حافظێ شیرازی « ألا یا أیها الساقی ••• هتد » وەکی دە موتابچی ل بەر چاڤان دانایە • پاشی دبێژیت : « بێژە و زاراڤێت » فارسی و گەلەك بێژەیێت عەرەبی ژی ب رێکا ئەدەبێ فارسی تێکەلی ئەدەبێ کوردی بوینە نەمازە د هۆزانێ ( شعرێ )دا • پاشی دبێژیت : بەرهەمێ ئەدەبێ کوردی ژ سەرێ ڤێ قوناغێ هەتا نیڤا یەکێ ژ سەدێ نازدێ ، دیوانێت هۆزاڤانا بوینە ، ب قەتلازی نەبت چو تشتێ دی نەڤیسیە • پاشی وەکی دە موتابچی دەرباری خویندنگەهێت کوردی ئاخڤتیە بێ کو هەر ناڤێ وی ژی خول پشت کوچك و تەنویرا ژی بنیت ، کانێ بیر و رایێت وی چنە ئەگەرچی هەر د وێ کوڤاری ژیدا هەر دو گۆتار هاتینە بەلاڤکرن • دە نوری دەمێ ل سەر هاڤلی و پێوەندییا تۆرێ کوردی یێ ڤیسی و فارسی ئاخڤیت دبێژیت : « پەیوەندییا هەر دوان یا ب هێز و بەردەوام بۆیە هەتا نەمانا دەولەتا عوسمانی و درستبوینا دەولەتا عیراقێ • دە نوری ڤێ بریارا هشك ددەت بێ کو نیشانەکێ یان نمونەکێ دەست نیشان بکەت • ئەڤ پرسیارە د جهێ خودایە بێتە کرن گەلۆ هەمی کوردستان دبن خوندکارییا دەولەتا عوثمانیڤە بویە د ڤێ دەلیڤا هندا درێژ یا شەش سەد سالی ل دوی گۆتنا دە نوری کو ژ پەریشانی دەست پێ دکەت ؟ ئان ژی لایێ ژێری و رۆژهەلاتێ د دەمەکێ کێم نەیێ د بن خوندکارییا فارسی و صەفەویان ڤە بۆیە؟! پاشی نەمانا دەولەتا عوثمانی ژ بلی ولایەتا مویسلێ کو پرتەکا بچویك بویە ، لایێ ژێری بتنێ دگریت د بن خوندکارییا دەولەتا عراقێڤە، ئەوا مایی

ل ناڤبەرا تورکی و ئیرانێ و پرتەکا بچویك ژی سوریێ هاتە ژێكڤەکرن ؟!
بەلێ ب من وەرە رامان و پەژنا ئانکو مەبەستا دە نوری ژ تۆرێ کوردێ کوردی ، تۆرێ ب زارێ سۆرانییە ، لەوا ژی گۆتییە پەیوەند هەتا نهو ژی دگەل فارسی ب هێز مایـە ، ئەگەرچی گوهورین یێت گرنگ بوینە نەجهێ پێ ئاخفتنا مەنە دڤی گۆتاریدا • رەنگە ژی تۆرێ کرمانجی نەمازە پاشی سـەدێ نازدێ پشت گوهڤە هاڤێتبت ، یان ب چو نەگرتن ، ئان ژی ژ نەشەهرەزاییێ ئو چو ب چاڤ نەکەڤتبوینێ بویە •

دە نوری دیوانا مەلا پەریشانی ب بەرهەمێ یەکێ تۆرێ ڤیسی یێ کوردی ددەتە قەلەمی ، د دەمێ کو هێژ هەتا نهو ژی سالا ژ دایێ بوینییا وی نەژی سالا دەستوپرخازی و مرنا وی ب درستی نەهاتیە زانین و بگۆتنا وی بخو ژی د گۆتارێ وی بخو ژیدا • ژبەر هندێ ئەو بیر و باوەر دێ بێ و ج و بێ نرخ و ژ خو مینت هـەتاکو ب ئەگەر ، تێکسـت یان ژی شوینەوار بێتە چەسپاندن • هەر وەسا چاخ و دەمێ ژینا مەلایێ جزیری هەر وەکی دە نوری ل سەر ڤیسـنا دە کەمال فؤادی ڤـەگوهازتی بێ هەلشکاڤتن و ل دوی چۆن ژراستیێ دویرە[٢٣] •

پاشی من بیر و باوەرێت زمانزان و روشەنبیرێت کورد دەرباری کار تێ کرنا زمان و ئەدەبێ فارسی د تۆر ( ئەدەب ) و زمانێ کوردیدا کری دگەل ئاڤرێت خو یێت سەر پێ دیار و خویا کرین ، دێ بیر و باوەرێت خو ژی ب درێژی دەربڕم •

ب هزرا من ل سەر بابەتەکێ وەکی ڤی : « هوزانا کوردی و هاڤلییا

(٢٣) سەر هوستایێ کێش و ڤەهاندنێ مەلایێ جزیری ، صادق بهاءالدین ئامێدی کۆڤارا : «کوری زانیاری کورد» سالا (١٩٧٥)ێ بەرپەر (٣٦٦)ێ.

ویَ ب عەرەبی و فارسیڤە ، تڤیسین گەرەك و پیَ تڤی ل دوی چۆن و درە چۆنەکا ل سەر خو یا کویر و دویرە ، کو د ویَ ل دوی چۆنیَدا نمایشتەکا گشکی یا بار و زروفیَت ژین و ژیارا مللەتیَ کورد پیَتڤیە بیَتە کرن د گەل روهن‌کرنا شەنگستە ئو هاڤلی ییَت مللەتیَ کورد ب مللەتیَت چارکنارڤە ، ژلاییَ ئۆلی و ئاییتیَ ، ئــەبۆریَ ، جڤاکیَ و روشــەنبیریَڤە د گەل روی پیڤانەکا گشکی یا روشــەنبیری‌یا کوردی ، داکو ژ نوی گەلــەك لاییَت ئالوزیایی و بگری و کویری پیَ بیَنــە روهن و خویاکرنیَ و ریَ ل بــەر تڤیسەڤانی ڤەبیت ل دوی کەرستیَ بەردەست کری و ب ســەر و بەرکری بشیَت ( بکارت ) بریاریَت راست ییَت د جهیَ خودا بدەت •

دا بەریَ خو بدەینە کەرستیَ ددەستدا چی‌یە؛ ژبلی هەر دو هەلبەستیَت هۆزاڤان بابەراخیَ هەمزانی ییَ کو هاتی‌یە گۆتن کو د سەدیَ سیَ (٣)یَ مشەختی ، هەڤبــەری نەهیَ (٩) زاینی ژی‌یە ئــو ب خەباتکەریَت کورد ڤەهاندی‌یە ژبو ناڤ تیَ دانیَ ئو توی تیَ دانیَ کو من بیر و باوەریَت خو ل سەر دەربڕین چو دی نینە ئو هەتا نهو ڤیَ گاڤیَ ژی کەس نەشیایە ب درستی دویروکا ( میَژوا ) تۆریَ کوردی ییَ تڤیسی دەست نیشان بکەت ؛ ژبەرکو دەست نیشانکرنا ویَ دویروکیَ یاکو گومان بڕ بت ب بەرسڤا ڤان پرسیاریَت ژیَری‌ڤە بەند و بەستی‌یە :

١ــ کەنگی و کیَ ژ ریَڤە تۆریَ کوردی تڤیسی‌یە ؟ ٢ــ ئەو توریَ تڤیسی چی‌یە ؟ ئو ل کیریَ تڤیسی‌یە ؟ ٣ــ چەوا یان ب چ ریَ گەهشتی‌یە مە ؟ •

بەرسڤا ڤان پرسیاریَت ژۆری هەتا نهو ڤیَ گاڤیَ ژی ل دوی زانینا من د تاری‌یا نەزانیَدا مایە ، ژبەرکو چو نیشانە یان ژی تیَکست د دەستا نینن

کو ئەو چەند لایێت د تارییێدا مابنە پێ بێنە روهنکرن • تشتێ بەردەست هەلبەستێت هۆزاڤانێت کوردن یێت کو ددەستنڤیس و کەشکول و ڤشتێت چاپکریدا ، بێ کو ب درستی دویروکا ڤیسینا هژمارەکا مەزن ژی دیار و خویا بت ؛ نەژی ژینەنیگارا هۆزاڤانێ ڤەهاندی ، مروڤێ ڤیسی و ل کیرێ ( جهێ ڤیسنێ ) ؛ ئەگەرچی نازناڤێ ( تخلص ) یا وان د گەلەکادا هەیە • بو نمونە دیوانا مەلا بەریشانی یا کو ل دوی گۆتنا دە نوری ل سالا ؛ ( ۱۹۱٦ — ۱۹۱۷ )ێ فتح علی زیبا چۆیی ل ( کرمنشاە ) چاپکری کو د سەرتاییێدا گۆتییە : مەلا پەریشانی نێزیکی شەش سەد سالان بەری نهو ل چار رەخێت کرمانشاه ژییە • بەلێ نەسالا ژ دایێ بوینا وی ، نەژی سالا مر نا وی ب درستی نەهاتیە زانین هەر وەکی هاتیە گۆتن ، ڤێجا دەمێ ژینا وی دێ چەوا راست بیت بەری چەند سەد سالان ژی بیت ؟!

د کتێبا : « القضية الكردية »[٢٤] دکتۆر بلەچ شێرکۆدا سەرێ سەدێ هزار و نەهێ دکەتە سەرێ ژ رێڤە یێ تۆرێ کوردی یێ ڤیسی ؛ ئو ب عەلی حەریری دەست پێ دکەت • بەلێ دپێش گۆتنا کتێبا سەرهاتی یێت کوردی بقەلەمێ د•ك•بەدرخان د بێژیت:د سەرێ دەهێداهۆزانا کوردی یاکلاسیکی بەرچاف بو ئو ژ عەلی تەرموکی دەست پێ دکەت[٢٥] • بەلێ پروفیسور قەناتێ کوردو دبێژیت : ڤیسارا ب زمانێ کوردی ڤیساندی یا بەرێ ئەولی نها کەتییە دەستێ مە ل قورنا ( ۱۰ — ۱۱ )ی هاتیە ڤیساندنێ[٢٦] • بەلێ

(٢٤) دکتۆر بلەچ شیرکو ، القضية الكردية (١٩٣٠) القاهرة ص (٢٣—٢٤).

(٢٥) سەرهاتی یێت کوردی ، لویس پول مارگریت و د. ك. بەدرخان ب زمانێ فرەنسیە سالا (١٩٣٧)ێ بەرپەرێ (٨)ێ .

(٢٦) قەناتێ کوردو ، گراماتیکا زمانێ کوردی یەرڤان (١٩٦٠) بەرپەرێ (٣٨).

ئەڤ دویرۆکە د سەدێ (١٠)ێدا یان (١١)ێدا دیسا گومانبۆ نینــە هەر وەســا ژی روهن نینە مشەختیێ‌یە یان زاینی‌یە • ئەگەرچی مشەختی بەر راستیێ‌ڤەیە ، ژبەرکو دویروکا مشەختی ل جهێت بوســلمانا ل کاربو • « توما بووا » ژی د کتێبا خودا « پێ نیاسینا کوردا »[٢٧] دبێژیت : سەرێ ژ رێڤە یێ تۆرێ کوردی یێ ئیسی هێژ د تاری‌یا نەزانینێ دایــە ، کو ژ سەدێ پازدێ وێڤە دیارە • شێخ ئەحمەدێ نیشانی دیوانەکا ســپەهی و شەنگ هەیە • ئەگەرچی پێتری زانا ئو روشەنبیرێت کورد و بیانی سەدێ دەهێ و یازدێ مشەختی ب دویروکا دیاربوینی‌یا تۆرێ کوردی یێ ئیسی داتنن و عەلی تەرموکی ب سەرکێشێ هەمیانۆ ددنە قەلەمی ؛ بەلێ دیســا گێنگەشــە و پێ ئاخفتــن و کەشــمەکەش هێژ د ناڤبــەرا ئیسەڤانادا گەرمە ئــو مایە دەربــاری نیشــانا « عەلی تەرمــوکی » • گــەلــو « تەرمــوکی »یە یان « تەرمــاخی »یە ؟ ! هنــدی زانا ســــوڤیێ‌یە « مارگرێــت رودینکو » د کتێبا دەســت ئیسارێت کوردی‌دا [٢٨] یاکو سالا (١٩٦١)ێ ل لینینگرادێ هاتیــە چاپکرن دبێژیت : عەلی تەرموکی و تەرەماخی هەر دوئێکە بێ جودایی ، ئانکو تەرماخی و ( تەرموکی ) هەر مرۆڤەکە ، هەر وەسا د چاخێ ژینا وی دایە • ژ ڤێ نمایشتا ژۆری دیار و خویا دبیت کو چو نیشانە و گرۆڤ نینن گومان بۆ یان ژی تێکست(نص) نینن هەتا ڤێ گاڤێ ژی کانێ کیژ کەس و د کیژ دویــرۆکێ‌دا تۆری کوردی ئیسی‌یە • هەر ژبەر وێ یەکێ گەرەك و پێتڤی‌یە ڤەگەرین بو تێکستێت

(٢٧)
Thomas Bois, Connaissance des Kurdes Beyrouth Khayats 1965 P. 61 — 62.

(٢٨) م. ب. رودینکو دەستنڤیسێت کوردی موسکو ١٩٦١ .

د دەستدا کو ب رێکا وان دویرۆکا تۆرێ کوردی یێ ڤیسی پێ ساز بکەین.

دویروکا پەییڤتنا فەقێ تەیران و مەلایێ‌جزیری د سالا (١٠٣١)ێ مشەختی هەڤبەری (١٦٢١ ـ ١٦٢٢) زاینی هەر وەکی د مالکا دووێ ژ گۆتنا فەقێ تەیران دیار دبیت کو ئەڤا ژێرییە :

برینداری عشقێ مە
دۆرم ژ سها بهان
دزانن ( مداحێ ) کێ مە
« د هزار و یەك و سهان »
ئەمنا خوانی « مەلێ » مە
ل هەمی عەرد و جهان

ئەڤ : « د هزار و یەك سهان » یا د مالکا ناڤێدا رێ ددەت کو د نیڤا یەکێ ژ سەدێ یازدێ مشەختی ئەڤ هەر دو هۆزاڤانە هەبوینە و هەر دو ژی هوزاڤان بوینە ئەڤ بەرێکانا هۆزاڤانیێ ل ناڤبەرا هەر دووان‌دا بویە ب نیشانەکا د ژی کو مەلایێ جزیری بەرسڤا فەقێ تەیران دایە گۆتییە:

هندی کو گوژهم ( دگەژهم )
دکێشم صەبر و خێرێ
شوبهەتی چونگ و ژهم
هلاکم ژ دەربا تیرێ
ئەمنا خوانی فەقهم
ئیرۆکە د جزیرێ (٢٩)

هەر وەسا ژی بێ گومانە کو ئەڤ بەرێکانە ل باژێرێ جزیرێ پایتەختێ میرگەها بۆتا بویە ، کو چاخێ ژینا هەر دووان ژی پێ تێتە

(٢٩) دیوانا مەلایێ جزیری تویژاندنا صادق بهاءالدین ئامێدی (١٩٧٧) بەرپەرێ (٥٩٤)ێ .

چەسپاندن . ئەڤ هەر دو هۆزانڤانە دگەل عەلی حەریری یێ هەکاری پێشی سەیدایێ ئەحمەدێ خانی ژینە ل دوی گۆتنا خانی د مەم و زینێدا[٣٠] :

گـەردێ هەبویـــا مـــە ژی خودانــەك
عـالی کەرەمــەك لەطیفـە دانــەك
مـن دێ عەلەمـــا کەلامـــێ مـــەوزون
عـــالی بـــکرا ل بـــانێ گـــەردون
بینـــاڤە رحـــا مـــەلێ جزیـــری
پـــێ حـــەی بـــکرا عـــەلی حەریـری
کەیفـــەك وە بـــدا فەقیهێ تەیـــران
حەتتـــا ب ئەبـــەد بمـــایە حەیـران

کو دیار و خویایە سەیدایێ خانی پاشی وان ژیە هەر وەکی وی ب خو دوپرۆکا ژ دایێ بوینییا خو ب ڤێ مالکا ژێری روهنکرییە :

لـەورا کو دەمـــا ژ غەیبێ فـەك بـو
تـــاریخ هزار و ســـێشت و یـەك بـــو

پاشی ڤێ نماییشتێ هەکە هات و مە چەرخێ ژینا جزیزی کو نیڤا دووێ ژ سەدێ دەهێ و نیڤا یەکێ ژ سەدێ یا زدێ مشەختی ب سەری ژ ریڤـە یێ تۆرێ کوردی یێ تقیسی دانا کو ئەڤ دوپرۆکە هەر وەکی هاتیە روهنکرن دگەل بیرو باوەرێت گەلەك زانا و روشـەنبیرێت کورد و بیـانی ، وەکی دکتور بلەچ شێرکو ، د. ك. بەدرخان ، پروفیسور قەناتێ کوردو و تومـا بووایی ئێك دگرێت ئانکو رێك د کەڤت .

دڤی چاخی و دەمیدا کوردستـان دبن خونـدکارییا مـیرگەهێت

(٣٠) احمدێ خانی ، مەم و زین م. امین بوزارسـلان (١٩٦٨) استـامبول بەرپەرێ (٦٢)ێ .

توركمانڤه بەرخ رەش (قرەقوينلو) و بەرخ سپى ( آق قوينلو)ڤــه بو • هەروەسا دڤێ دەمێ هەنێدا ، پێلەكا مەزن یا موگولێت دژنــدە و خــونژێژ ب سەروكاتىیا تەیمــورێ لەنــگ وەلاتێت رۆژئاڤــا باكورى ئاســیایى ســەرێك و بنێك كرن و د دویرا پاشــى دەولەتا صــەفەوى ل ئیرانێ ب ســەرێكڤه هاتى بەر رۆژئاڤاڤه بزاڤ‌كر كو دەولەتا خو فرەهـكەت ، دەولەتا (آق قوينلو) وێرانـكر و عوثمانى پاشڤه برن هەتا نێزیكى هەمى كوردستانێ كەتە دبن دەستىڤه • بەلێ پاشى دەمەكى نەیێ درێژ عوثمانى ب سەركێشىیا سولتان سەلیمێ یەكێ یێ لە شكرێ خو دكوردستانێرا برى پاشى دگەل میرگەهێت كورد پێك هاتى ، لەشكرێ اسماعیل صەفەوى ل «چالدیران» سالا (١٥١٧)ێ شكاند • پاشى چەند سالان شەرى دەســت پێ كرەڤه ل ناڤبەرا صەفەوى و عوثمانیان د خوندكارىیا تەهمســابىدا ، و عوثمانیا لەشــكرێ صەفەویان شكاندەڤه • ئەڤ شەر و جەنگ و هنگامەنە ل سەر ئاخا كوردا دبون ؛ ژبەر هندێ ، كوردستان هەر یا كاڤــل وێران بــوّیە ؛ ئەگەرچى خوندكارێت راست میرێت كورد بوینە شیاینە ب دەڤ نەرمى و سیاسەتێ دگەل خوندكارێت خوییێت مەزن ببەنە سەر • بەلێ بارێ ئەبورى و توڤچینى و بازرگانى ییت پێتڤێ تەنایى و ئاشتیێ ، ژبو پێشــدا چوّنێ ، چەند بێژى د ئالوّز و پاشكەڤتى بوینە وكى وەلاتێت چاركنار • بەلێ ل سەر وێ تێك چوّن و شەڕ و لێك دانا ژى ، ل وان وارگەهێت وێران و ئالوّز ژىدا بێ گومانە بارێ روشەنبیرى ژى دێ پاكەڤــتى بیت ، لێ بــەلێ د باژێر و پایتەختێت میرگەهاندا ، وەكى جولەمێرگێ ، بایەزیدێ ، بدلیسێ ، جزیرێ ، ئامێدیێ و رەواندزێ ••• هتد ، بنگەهـ و شەرگەهێت روشەنبیرێ بوینە ، هەر تم ( هەمى گاڤا ) ژ زانا ئو خویندەڤانێت كورد رێژى بوینە ، ژبەركو خوندكارێت كورد بلایێ گشكىڤه ب چاڤەكێ بلند بەرێ خو دایە

زانا و روشەنبیرا و دراڤەکێ بێ ڤەگر ل خویندنگەهـ و زانان مەزخاندیـیە • نیشانەیا ڤی راستیێ ئەڤ چەند مالکێت هۆزاڤانێ کوردپەروەر حاجی قادرێ کویێـنە :

**حــــاکم و مـــیرەکانی کوردستـــــان**
**هــەر لــە بۆتـــانەوە هەتـــا بـابـان**
**یـەك بـە یـەك حـافظ شریعـەت بـۆن**
**سەییـد و شـێخی قـەوم مللەت بـۆن**
**ســەیید و شێخـەکان لــە ترسی ئەوان**
**مونــزەوی بــۆن و ذاکـری رەحمـــان**
**ئەو کە فەوتـــان ریـــایی ئەوان دەرکـــەوت**
**سەیری چۆن بۆنە پۆش و ئاگر و نەوت(٣١)**

هــەر ژبــەر هندێ ژی بۆیـــە زانـــا و روشـــەنبیرێت کورد هند سەر تێ دکر و لێ جهوار دبون • ئەو چـاڤێ خو لێ کرن و خــەم ژ روشەنبیر و زانا خارن ژی ب هزرا من ژ خودێ ترسین ، ب خوخوزیـن بویە کو ب ناڤ ب کەڤن ل نك خو جهیان و روشەنبیرخواز بوینە •

ئەڤە تۆرێ ئیسی ژ هۆزان و پروسان (پەخشان) ، ئەگەرچی پشکا مەزن ژێ هۆزانن ؛ بەلێ تۆرێ کوردی یێ کو سەرێ مللەتێ کورد پـێ بلندە و یێ ب ناڤ و دەنگە تۆرێ مللی کوردیـیە ئانکو تۆرێ فولکلوریـیە• ئەڤ جۆر و رەنـگێ تـۆری نەچـو قۆناغ نەژی گڤاندە و سنۆر بـۆ ناهێنە دانان و ب ناڤێ کەسیڤە بەند نینە ، ئەگەرچی ژ ریڤە ب کریارەکێ، رویدانەکێ و تشتەکی ؛ ئێکی گۆتیـیە ، بەلێ کەنگی ئەو چەند روهن نینە• کەڤنترین فولکلورێ کوردی یێ هـاتیە ڤیسیــن و چاپکرن ل دوی زانینا

(٣١) عبدالرحمن سعید ، کۆملە شعری حاجی قادری کویی (١٩٢٥) بەرپەرێ (٨) .

من هەتا نهو چەند چيروكێت كوردى‌نە هژمارا وان (٤٠) چيرۆكن كو نسولێ روسى ل ئەرزەرومێ ئەسكەندەر ژابا سالا (١٨٦٠)ێ چاپكرينە [٣٢] •

بير و باوەرێت من دەربارى گوتارێ ناڤبرى : ب هزرا من پێ ئاخفتن يان ژى ل دوى چۆن ئان هەلشكاڤتن (لێكولينەوە) دەربارى تۆرێ كوردى يێ ڤيسى و نەڤيسى (فولكلورى) و هەڤبەركرن دگەل ئەدەبێ فارسى ژبو دياركرن و خوياكرنا هاڤلى ، شەنگستە ئو پێوەنديێت هەر دووان دگـەل ئێك و ديار كرنا كارێ ( تاثير ) يا ئەدەبێ فارســى د ئەدەبێ كوردى‌دا كرى پاشى د سەدێ (١٧ــ١٨)ێ مشەختى ئسلام ل هەر دو وەلاتا بەلاڤبوێ و پشت گوهڤە هاڤێتنا شەهرستانيا ئسلامێ يـاكو ب ئـەدەب و ب زمـانێ عەرەبى‌ڤە بەند و گرێدايى ، بۆ چۆنەك و كارەكێ ئێكجار بێ وج و نـە دجهێ خودايە ؛ ژبەركو بەلاڤبوينا ئسلامێ يا بوسولمانەتيێ ل هەر درەك و وەلاتەكى ، بير و باوەرێت بەرێ (پێشى) ب جارەكێ هەلدكەندن و بێت ئۆلێ نوى ل شوينا وان دچەسـپاندن • هەر وەسـا بار و لايێت ژين و ژيارێ ، ژ بارێ ئەبۆرێ ، جڤاكێ (كومەلايەتێ) ، روشەنبيرێ و هنەرى ژى دهاتنە گوهورين • بۆ نمونە پاشى ئسلام ل وەلاتێ ئيرانێ بەلاڤ بويێ ، زمانێ فارسى يان فەهلەوى كو زمانێ ئمبراتورى‌يا ساسانێ بۆ ياكو هەمى رۆژهەلاتا ناڤين و ناڤەراست و باكورێ ئەفريكاى هەتاكو تونسێ د بـن دەستێ‌ڤە ، بجارەكا پشت گوهڤە هاتە هاڤێتن و زمانێ عـەرەبى زمـانێ خوندكارێت نوى بۆ زمانێ رەسمى ، زمانێ ئەدەبى و زانستى • زمـانێ فارسى يێ كو خو جهى پێ تاخڤتن كەتە د بن كار تێ كرنا زمانێ عەرەبى ب جۆر و ئاوايەكێ وەسا ب هێز كو چو زمانێـت دى بێت جهانى كارەكـێ

(٣٢) ئەسكەندەر ژابا ، جامعى رساليا و حكايتان ب زمانێ كورمانجى باژيرێ بتربورگێ‌دا هاتە چاپكرن سالا (١٨٦٠)ێ .

( تاثیرەکا ) وەسا تیٚدا نەهاتیە کرن ، نە کاریٚ زمانیٚ یونانی د زمانیٚ لاتینیدا کری ؛ نەژی زمانیٚ فرەنسی د زمانیٚ ئنگلیزی پاشی نورمەندیا ئنگلستان ڤەگرتی ، هەتا رادەکیٚ وەسا کو کار تیٚ کرنا عەرەبی د فارسیدا د چو دەم و چەرخادا نەبویە .[٣٣] زمانیٚ فارسی ل وەلاتیٚ فارسی ل نك ئاخفتنکەریٚت فارس ب خو بیٚ وج بو گەهشتنە رادەکا وەسا کو تاهریان بیٚت کو دەولەتەکا خومالی یا جودا ژ دەولەتا عەباسی ب سەریٚكڤە ئینایی زمانیٚ عەرەبی ب سەر زمانیٚ فارسی ئیٚخست ؛ ژبەرکو هەمی ژ خودیٚ ترس بوینە ل نك وان چو زمان ب سەر زمانیٚ قورئانیٚ نەکەڤتینە . دبیٚژن : خونکاریٚ ژ ریٚڤە یٚ دەولەتا تاهریان فەرماندا کو چیرۆکا ڤەهاندی ب پەهلەوی یاکو ب ئەڤینا «وامق و عذرا» هاتیە گۆتن بسوژن پاشی فەرمان دایی گۆت : ئەم مللەتەکیٚ قورئان و حەدیث خوینین ئەڤ کتیٚبا هە ژی کتیٚبا ئاگر پەرستانە ، ژبەر هندیٚ کتیٚبەکا لەعنەتدارە ئانکو (ملعونه)[٣٤] .

بەلیٚ ژ لاییٚ هۆزانیٚ (شعریٚ)ڤە ، شعرا فارسی ب شعرا عەرەبیڤە بەند بو ، نەکو ژلاییٚ فورمیٚڤە لیٚ بەلیٚ ژ لاییٚ بابەتی ژیڤە کو چیٚترین نمونە «منوجهری»یە کو هۆزانا عەرەبی یا دەمیٚ «جاهلی» و دەمیٚ «ئسلامی» ژی کارتیٚدا کرییە[٣٥]. هەر وەکی وی ژی «عنصری»، «فخرالدین گرگانی»، «نوری» ، «جمال‌الدین اصفهانی» ، «ظهیرالدین فاریابی» ، «ادیب صابر» ، دبن کارتیٚ کرنا ڤان هۆزانڤانیٚت عەرەب «ابی‌تمام» و «متنبی»ڤە بوینە ،

(٣٣) دکتۆر محمد غنیمی هلال ، مختارات من الشعر الفارسی القاهره (١٩٦٥) ص (٥) من المقدمة .

(٣٤)
Dar mester, les Origines de la poesie persone P. 8. Paris 1887 .

(٣٥) دکتۆر علی الشابی ، الادب الفارسی في العهد الفزنوی ص (٢٢٠ــ٢٤٠).

ئو كارێ «متنبي» د «سعدي شــيرازي»دا كرى بەرچــاف و ناڤــدارە • «بحتري» كار د «عنصري» و «فرخي»و «خاقاني»و «أزرقي»دا كرىيە[٣٦]•

تۆرێ كوردى ، تۆرێ مللەتەكێ بندەست و سەر ب خونە و پرت پرت د بن خوندكارى يێت جوداڤە ؛ بێ گومان دێ دبن كار تێ كرنا شەهرستانىيا ئسلامێ و زمانێ عەرەبى و زمان و شەهرستانىيا خوندكارێت خو يێت دىڤە وەكى فارس سەلاجقێت تورك و عوثمانيان بيت ژبەر هندێ كار تێ كرن تێڤەل و جودا بويە لناڤبەرا پرتێت ژێك جودا يێت كوردستانێ ، هەر وەكى هاتيە روهنكرن كو كارێ فارسى د لايێت روژهەلاتێ و ژێرى روهەلاتــێ پێتر بۆيە ژ لايێت باكور و رۆژئاڤايێت كوردستانێ كو كارێ تێدا بويى ژبەر وێ چەندێ بويە كو فارسى زمانێ تۆر و زانستى سەلاجقە و عوثمانيان بويە هەتا خونكارى يا سولتان مورادێ يەكێ هەر وەكى هاتيە روهنكرن • ژبەر هندێ كارێ زمان و تۆرێ فارسى پێتر د زارێ سۆرانى ، ئەردەلانى موكرى و لورىدا كرىيە ژ زارێ كرمانجى • ئەڤ پێتر كار تێ كرنــە د رێزمانێدا ديار دبيت كو رێزمانا زارێ كرمانجى پێتر ب لاتينى كو زمــانێ دەولەتا بيزەنتى بويە بەند بويە • ئەڤە ژبلى خەم ژ زمانێ كوردى و تۆرێ كوردى خارنە ژ لايێ هژمارەكا نەيــا كێم ژ هوزاڤــاتێت كلاســيكى • بەروڤاژى لايێ ژوهەلاتێ و لايێ ژێرى يێ كوردستانێ كو درەنكتر هۆزان ب زمانێ كوردى ڤەهاندىنە و پێتر ب فارسى •

بەلێ بێ گومانە كو كارێ (تأثير) زمان و روشەنبيرىيا عەرەبى د زمانێ كوردى دا گەلەك ژ كارێ فارسى پێتر و بەرچاڤ ترە • كارێ عەرەبى نەكو د تۆرێ ڤيسى يێ كوردىدا روهن و ديارە هەر وەكى د تۆرێ كلاسيكىدا،

(٣٦) دكتۆر حسين مجيب المصرى . صلات بين العرب والفرس والترك ص (١٩٧-٢١٨) المصدر السابق .

هەر کەسیٰ بگری دبن کار تیٰ کرنەکا ئیٚکجـارا مەزن یـا شەهرستـانییا ئیسـلامیٰ و زمانیٰ عەرەبیٚڤە بویە ، وەکی مـەلاییٰ جزیری کو هەلبەستا ژ هەمیا مەزتر و رەنگینتر ب ناڤیٰ خودیٚیە و ل سەر زانستیٰ عەرەبیٚیە ، و هەمی جورێت هەلبەستیٰ د دیوانا ویٚدا هەنە • هەر وەسا فەقیٰ تەیران دۆ داستانێت ئیٚکجار ناڤدار ، داستانا شیٚخی سەنعانی ، و داستا هەسپیٰ رەش ، هەر دۆ دینیٚنە ، مەلاییٰ باتەیی هژمارەکا هەلبەستا ب خوشتڤییٰ خودیٰ محمد پیٚغەمبەری (س) گوتیٚنە و ب ژ دای بوینا پیروزا وی یـا ب نـاڤیٰ مەولیدیٰ ب سەنگ و کیٚش ڤەهاندیٚیە • سەیداییٰ خانی،عەقیدە ب ناڤیٰ عەقیدا خانی ، ناڤیٰ خودیٰ و پیٚغەمبەریٰ خودیٰ (س) و هەمی هەڤال و هەڤکارا ژ خولەفا ، ژ بلی روکنیٚت ئیسلامیٰ و سەریٰ مەم وزینا خو ژی ب ناڤیٰ خودیٰ و پیٚـغەمبەری دەست پیٰ دکەت ، هەتا خو نوبیهارا خانی ژ ئۆلی وئاییـنی و سوفیاتییٰ زۆر بەهرە نینە • ئەڤە ژبلی فولکـلوریٰ کوردی ژ چـیرۆك و چیڤانۆك ، ژ داستان (بەیت) و ستران و لاڤژان و سەرهاتیان (پەندان) کو ب بوسلمانەتییٚڤە بەند و بەستیٚیە ، هەر وەکی ژ ڤان نمونێت ژێری دیار دبیـت :

١ــ سەریٰ چیرۆك وچیڤانۆکا ب ڤی جوری دەس پی دکر : « هەبو هەبو کەس ژ خودیٰ مەستر نەبۆ ، کەس بەنبا درەونیتر نەبو • دویماهـی ب ڤی جۆرەیی بۆ : هزار رحمەت ل دایبابێت گوهدارا ؛ یان رەحمەتێـت خودیٰ ل دایبابا •

٢ ــ داستانێت کوردی وەکی « پەیتا سیسەبانیٰ » ب شەریٰبوسلمان و کافرا خالد ئاغاییٰ زیباری ڤەهاندیٚیە • ژبلی ویٰ ژی « نهج الانام فی علم الکلام » یاشیٚخ خەلیلیٰ سیٚرتی •

٣ـ د ستران و لاڤژیت کوردیدا ژی کارێ ئسلامێ دیاره وەکێ ڤێ لاڤژا گوڤەندێ •

**مەمیـــانە مەمیـــانە مەمۆ ، مەمیـــانە مەمیـــانە گیـــانـــۆ**
**شـــەکرا ل عەلبـــانە مەمـــۆ چ بـــکەم رەمەزانـــە گیـــانـــۆ**

یـــان ڤێ :

**هـــای هـــۆلێ هۆلـــێ هۆلـــێ**
**لـــێ لـــم « Lim » هـــۆلـــێ**
**بـــابێ هۆلـــێ فەلەیـــە**
**هۆلـــێ نـــادەتە مەیـــە**
**بـــابێ هۆلـــێ جوهیـــە**
**جویـــکەکێ خەیبەریـــە**
**هۆلـــێ نـــادەتە شویـــە**
**زالـــم زەریـــێ •**

٤ـ ژ سەرهاتیان :

١ـ دو دل ئێك بن یێ سێ خودێیە ؛ یان دو دل ببنە ئێك یێ سێ خودێیە •

٢ـ ژ تە حەرەکەت ، ژ خودێ بەرەکەت •

٣ـ ب گۆتنا خودێ بەرێ دارێ ژ دارێ دکەڤت • ژ بلی هندێ ژی ئسلامێ کارەکێ مەزن د رێز و رەوشتێت مللەتێ کورددا کرییە • ژ وێ چەندێ دیارە کو کارێ بوسولمانەتیێ د زمان و تۆر و رەشەنبیریا کوردان و وەلاتێت بوسلماندا کری دڤێ پشت گوهڤە نەهێتە هاڤێتن چاخ و دەمێ ب هاقلیا تۆرێ کوردی و شەنگستە و پێوەندێت وی ب روشەنبیریا وەلاتێت چارکنارڤە تێ هەلشکاڤتن •



## ملخص المقال

# علاقة الشعر الكردى بالشعر العربى والفارسى

العضو المؤازر : صادق بهاءالدين ئامێدی

لقد خطر ببالي منذ أمد بعيد اعداد مقالة عن الشعر الكردى وعلاقته بالشعر العربي والفارسي لانه لا يمكن بأي حال التغاضي عن ذلك خاصة لمحبي الادب الكردي . وبعدما وقع بصري على مقالة د. أمين علي متابچي المنشورة في مجلة كلية الاداب القسم الكردي تحت عنوان « شعراء الكرد والآداب الفارسية » لاحظت بأن المومى اليه حاول جاهدا حصر الصلة بين الادبين الفارسي والكردي بمعزل عن الثقافة الاسلامية واللغة العربية وآدابها وهو أمر لا يمت الى الحقيقة بصلة . ولكني وجدت من المفيد استعراض آراء كتّاب الكرد حول الموضوع وبضمنهم آراء د. متابچى اولا ثم الخوض في الموضوع .

يقول الاستاذ علاءالدين سجادي في كتابه : تاريخ الادب الكردي (ص ٥٧٢ـ٥٨٠) باننا لا نجد اي فرق بين الادبين الكردي والفارسي وخاصة في عهد ما قبل الاسلام الى سقوط الدولة الساسانية وبالاخص بعد انتشار الزردشتية بين الفرس والكرد معا فقد كان ادبا دينيا موحدا . ويستند في رأيه هذا الى عادات موروثة الشعبين أقرتها الديانة الاسلامية . غير ان الاستاذ السجادي لا يثبت رأيه بأدلة وأسانيد باستثناء بعض العادات الموروثة في غالبية الشعوب .

ويقول المرحوم الاستاذ انور مائي في مقدمة ديوان الشيخ احمد الجزيري المطبوع في أربيل سنة (١٩٦٤) ، حين يستعرض احداثا في حياة الجزيري : ان كل من يقارن بين الشعر الكردى والفارسي يبدو له ولاول نظرة بأن لا فرق يذكر بينهما لا من حيث التركيب ولا المضمون • ولكن بعد امعان النظر والتفكير تظهر الفروق جلية لا لبس فيها ولا غموض • ولكن هذا الرأي تعوزه الادلة والاسانيد في التشابه التام بين الشعرين وكذلك في الاختلاف بعد امعان النظر فيها • هذا بالاضافة الى قصيدتين نشره المرحوم للشاعر « بابه راخ » « الهمزاني » في مجلة « روناهي » العدد الثالث لسنة (١٩٦٠م) ص (٥ــ١٢) يقول عند التقديم بأن الشاعر المذكور عاش في النصف الاول من القرن الثالث الهجري (٢٢٦) الموافق (٨٨٦) الميلادي دون ذكر المصدر الذي نقل منه ولا تأريخ التدوين أو اسم الكاتب • وباعتقادي ان القصيدتين من نظم شاعر في القرن التاسع عشر او بعده •

كما أن د• عزالدين رسول يقول في كتابه : الواقعية في الادب الكردي: (ص٥٦ــ٥٧) أن الفتح الاسلامي بجانب نشر الاسلام دينا بين شعوب غير عربية فأنه قد جعل من اللغة العربية لغة الثقافة عندها • وكان الشعب الكردي من الشعوب التي تركت لغتها كلغة علم وأدب وظل ابناؤها الى قرون عديدة بعد بعث لغتهم يساهمون في اغناء التراث الاسلامي • وان الحاجة النضالية قد ولدت ضرورة العودة الى لغة الام ، فاول قطعة شعرية واضحة المعالم ينظمها شاعر يحث قومه ضد الاوتقراطية العباسية ويجعل من الشعر سلاحا في النضال هي قصيدة بابه راخ الهمزاني • يذكر د• رسول تلك المعلومات دون دليل او سند من شعر او نثر او من الادب المكتوب او حتى من الادب الشعبي ( الفولكلور ) يثبت بأن الكرد كتبوها بلغتهم وبعد الفتح الاسلامي اخذوا يكتبون باللغة العربية لغه الدين كما ان عودة الشعب الكردي

الى الكتابة بلغة الام لحاجته الى النضال يحتاج الى اسانيد وأدلة اخرى اضافة الى القصيدتين •

أما د• أمين علي متابچي ، فيقول في مقالته المنشورة في مجلة كلية الآداب جامعة بغداد القسم الكردي عدد (١٧) سنة ١٩٧٣م (ص ٥-٢٨) : بأن الاداب الفارسية التي كانت تدرس في المدارس الدينية الكردية أثرت تأثيرا كبيرا في الادب الكردي وخاصة الشعر الصوفي منه ، حيث بلغ التأثير حدا بأن أصبحت قصائد بعض شعراء الفرس امثال سعدي الشيرازي وحافظ الشيرازي وعبدالرحمن جامي نماذج مثالية لشعراء الكرد من المتصوفين • فمنهم من نهجوا نهجهم في نظم قصائد لهم على وزن وقافية قصائدهم مستخدمين تعابيرهم ومصطلحاتهم اللغوية • وهناك من تأثروا بقصائد لشعراء الفرس وبدا التأثير واضحا في قصائدهم ، وعزا د• متابچى ذلك الى تشابه البيئة والمجتمع لشعراء الفرس والكرد • ثم يقارن بين شعراء الشعبين مع نماذج من شعرهم مؤكدا بأن القصد من التأثير الادب وليست اللغة لانتماء اللغتين الفارسية والكردية الى مجموعة اللغات الايرانية •

اني اخالف رأي د• متابچي بجعل تأثير الادب الفارسي في الادب الكردي شاملا ومتساويا لكافة اجزاء كردستان في حين كان التأثير بالفعل مختلفا ، حيث كانت الاجزاء المتصلة ببلاد فارس مباشرة وخضعت لحكم الفرس ، والثقافة الفارسية أكثر وابلغ تأثرا من الجهات البعيدة عنها كالجهات الغربية والشمالية الغربية والوسطى منها والتي خضعت في فترات زمنية بحيث اقتصر التأثير بصورة أخص في عهد السلاجقة وبداية قيام الدولة العثمانية،لاناللغة الفارسية كانت اللغة الرسمية لدولة السلاجقة والدولة العثمانية حتى عهد السلطان مراد الاول سنة (١٣٥٩) م ؛ والدليل على ذلك

نظم الشعر باللغة الكردية «الكرمانجيـــة» في الجهات الشمالية والغــربية وبعض الرسائل اللغوية والكتب الدينية قبل الجهات الشرقية والجنوبيــة الشرقية باستثناء منطقة (هەورەمان) •

باعتقادي ان النماذج التى هي عبــارة عن ابيات من احــدى قصائد الشيخ احمد الجزيري مع أبيات من قصائد لحافظ الشيرازي التي اســتند عليها د• متابچي كدليل لصحة ما ذهب اليه يفنده البيت الاتي من ديــوان الجزيري نفسه :

« گــەر لــؤلــؤى (منثــور) ژ نەظمــێ تو دخــوازى
وەر شــعرێ مەلێ بينە تە ب شـــيرازێ چ حاجەت »

ان كنت هاوي الدرر واللآليء المنثورة من النظم فاشف غليلك من نظم الملا بحيث يغنيك ما هو موجود في شيراز منها •

وقول د• متابچي بأن الكرد نظموا الشعر بالفارسية والكردية معــا كدليل على تأثرهم وتذوقهم للادب الفارسي ، أقول بأن شعراء الكرد قرضوا الشعر باللغات الاسلامية في الشرق الادنى والاوسط كافة وخير مثل على ذلك رباعية الخالد احمدي خاني باللغات : العربيــة والفارسية والتركيــة والكردية بحيث أن نصف البيت الاول باللغة العربية والنصف الثاني منــه بالفارسية ، والبيت الثاني بالتركية والكردية مناصفة •

وكتب د• محمد نوري مقالة في مجلة كلية الاداب القســم الكــردي العدد (١٨) لسنة (١٩٧٤) تحت عنوان : « تأثير اللغة والادب الفارسي على الادب الكردي » يقول فيها ان الادب الكردي منذ نشأته حتى ســـقوط الدولة العثمانية وتأسيس الدولة العراقية ذو صلة وثقى بالادب الفارسي

وما زال التأثير باقيا حتى الان . وقد نجم من هذه الصلة الوثيقة تأثر الادب الكردي بالادب الفارسي . ويستند في قوله بالسير على غرار د. متابچى في عرض نماذج من الشعر كدليل على صحة قوله بأن شعراء الكرد ساروا على نهج شعراء الفرس في قرض الشعر واستعملوا تعابيرهم ومصطلحاتهم مع عقد مقارنات بين شعراء الفرس والكرد الكلاسيكيين . ان د. نوري باعتقادي لم يضف شيئا أكثر مما قاله د. متابچي حول الموضوع باستثناء قوله بأن پريشانى الشاعر الكردي يعتبر أول شاعر كتب باللغة الكردية ناسيا بأنه اخفق في اثبات الفترة التي عاش فيها بدقة في مقاله المذكور .

وبعد استعراض آراء كتاب الكرد حول الموضوع وابداء ملاحظاتي ، اقول كان من المستحسن استعراض احوال المنطقة التي عاش فيها الشعب الكردي وعلاقته بالشعوب المجاورة له موضحا الحالة السياسية ، والظروف الاقتصادية مع الحالة الاجتماعية والثقافية وبالاخص التأثير الديني ، لما في ذلك من أثر كبير في التعرف على الشعب الكردي ومبلغ تأثره بالثقافة العربية الاسلامية تلك الثقافة التي كانت الطابع المميز لثقافة الشعوب الاسلامية كافة . ولذلك أرى بأنه ليس من الصحيح البحث في الصلة بين الادبين الكردي والفارسي فقط واستبعاد أو اهمال تأثير الثقافة الاسلامية واللغة العربية اللتين أثرتا تأثيرا كبيرا على ثقافة الشعوب التي انتشرت فيها الاسلام . فقد كان تأثير الادب العربي في الادب الفارسي والتركي والكردي حتى القرن العشرين كبيرا ولا يزال باقيا في الادب الكردي .

وبالنسبة للادب الكردي فبما ان الشعب الكردي كان خاضعا لسيطرة العرب والفرس والترك السياسية فكانت الثقافة الكردية وما زالت متأثرة بثقافة تلك الشعوب وخاصة بالحضارة الاسلامية واللغة العربية والامثلة على ذلك ما نراه في دواوين شعراء الكرد الكلاسيكيين امثال الشيخ احمد الجزيري ، حيث يبدأ ديوانه بقصيدته الكبرى التي هي بمثابة مناجاة

وقصائد عدة باللغتين الكردية والعربية ، قصيدة بالعربية واخرى بالفارسية ونظم القصائد على علم العروض بالابحر المختلفة ومن ثم الرباعية والتخميس والتسديس والمستزاد وترجيع البند .. الخ . اضافة الى الملاحم الدينية لفقى تهيران ، «شيخ صنعان»و«الحصانالاسود». وقصائد في مدح الرسول الاعظم (ص) والمولد النبوي لملا حسين البانهيى . ديباجة مهموزين وعقيدة خاني للشاعر العظيم احمد خاني . وملحمة سيسبان لخالد الزيباري .

ولم يقتصر التأثير على الادب المكتوب وانما تعداه الى الادب الشعبي (الفولكلوري) في القصص والملاحم والامثلة والكنايات والشعر الغنائي ، اضافة الى تأثير الدين الاسلامي في العادات والتقاليد الكردية .



# شینی کوردە یەزیدیەکانی پشت قەفقاز


د. مارگریت ڕۆدینکۆ
نوسیویەتی
د. شوکرییە ڕەسوڵ
بە دەسکاری‌یەوە
لە ڕۆسی‌یەوە کردویە بە کوردی


هێشتا توژینەوەی تەواو و پێویست لە بارەی شین و لاواندنـــەوە و مردوبەڕێ‌کردنی میللەتانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ئەودیوی قەفقازەوە نەکراوە، ئەوە نەبێ کە کومەڵە تێکستێکی لێ لەچاپ‌دراوە و لەگەڵ جۆرەکانی تری فولکلوردا بەراوردکراوە ، کە ئەو بەراوردەش نرخێکی ئەوتۆی نەبوە [1]. ئەمەش ئەوەمان بو ڕوون‌ئەکاتەوە کە بەیتی شین و لاواندنەوەی مردو لە نـــاو زوربەی گەلانی ڕۆژهەڵات و ئەودیوی قەفقازەدا هێشتا لە نهێنی‌یەکی ئێجگار زوردا پارێزراوە [2]. گرنگیی بەیتی شین و لاواندنەوە لەوەدایە کە جۆرێکی

---

(۱) بروانە : ترانەهای سمرقند ، دوشنبە ، ۱۹٦٦ ، ل ۹۹ـ۱۰۷ ، ئا . ئی. روزینفیلد ، نمونەهای فولکلور درفوز ، دوشنبە ، ۱۹٦۲ ، ل ۱٤٥ ـ۱٤۷ ؛ رباعیات و سرودهای خلق بدخشـان ، دوشنبە ، ۱۹٦٥ ، ل ۱۰۱ـ۱۰٥ .

(۲) بروانە : د. چێرڤێناکوف ، نەریتی لاواندنەوە لە سڤانێتی ســەرو ، س م ۆ م پ ك ۳٦ ، بەشی دوهەم ، ل ۱٥۲ ( بە ڕوسی ) .

هۆنراوەی کۆنە (٣) و لە هەمان کاتیشدا بەرهەمێکی داهێنراوی زوربەی خەڵکە و یەکێکە لە شاکارە نموونەیی‌یەکانی فۆلکلۆر • نە داستانێکی کۆنە و نە پەیکەرە و نە ئاسەوارە ، بەڵکو ڕۆداوێکی زیندوی هۆنراوەیە(٤) •

شین و لاواندنەوە دەربڕینێکی قوڵ و ناخۆشی خەمباریێ و دڵتەنگی‌یە بە شێوەیەکی شاکارانە • ئەمەش ڕێگا خۆش ئەکا بۆ ئاوڕدانەوە لەو نهینی‌یانەی لە گیانی کۆمەڵانی خەڵکدا شارراونەتەوە ، کە ساماتێکی دەوڵەمەندی ڕاز و نیازی دەروونیانی تیا ئەبینرێ •

فۆلکلۆری کوردە یەزیدی‌یەکان لە ڕۆی دەوڵەمەندیێ و فراوانی‌یەوە لەگەڵ فۆلکلۆری کوردە موسوڵمانەکان بەراوردناکرێ • ئەمەش شتێکی ئاشکرا و دیارە • جیاوازیی کوردە یەزیدی‌یەکان لە کوردە موسوڵمانەکان لەوەدایە یەزیدی‌یەکان نوسینیان نەبوە•نەخوێندەواریێ وای‌لە یەزیدی‌یەکان کردبو لە دەوری ئایینەکەیان کۆببنەوە و خزمەتی پیرەکانیان بکەن • هەر بۆیەشە ئەو سامانە فۆلکلۆری‌یە شیعری‌یە لەڕادەبەدەر زۆرەیان لە شێوەی بەرهەمی سەرزارەکیدا دەرئەبڕن •

لە ناو جۆرە جیاوازەکانی بابەتەکانی فۆلکلۆری کورددا ، چیرۆك ، داستانی سەرزارەکیێ ، ڕازی قارەمانەتیێ ، بەستە و مەقام ، گۆرانیێ ، پەندی پێشینان و قسەی نەستەق ، بەیتی شین و لاواندنەوە ( کلامێ‌شینێ ) ، تائێستا نەخراونەتە سەر کاغەز و نەکەوتونەتە بەرچاو •

---

(٣) ك . ف چیستۆف : لاواندنەوە ، لێنینگراد ، ١٩٦٠ « نوسەری سۆڤیەتیێ » ، ل ١٠ ، ( بە ڕوسیێ ) .

(٤) م. ك. ئازادۆڤسکیێ ، لاواندنەوەی لێنسکیێ ( گوندێکە لە هەرێمی سڤێردلۆف ) ، چیتا ، ١٩٢٢ ، ل ١٠ .

زوربەی توێژەرە ئەتنۆگرافیایی‌یەکان تەنها داب و ڕێ و شوێنی بەڕێ‌کردنی مردوویان نووسیوەتەوە ، موسوڵمان بێ یا یەزیدیێ وەهەر ئەوەیان خستووەتە ڕوو کە یەکسەر دوای مردنی مردووەکە ، خزم و نزیکەکانی دەست ئەکەن بە شین و لاواندنەوەی[٥] • بەلاّم هیچ تێکستێکی شین و لاواندنەوەیان لە کارەکەیاندا نەکردووە بە بەڵگە بۆ قسەکانیان •

من ماوەیەکی زۆر هەمو هەوڵ و کۆششێکی خۆمم تەرخان کردبو بۆ کۆکردنەوەی تێکستی لاواندنەوە لە دەمی کوردە یەزیدی‌یەکان ، بەلاّم خەڵکەکە بەردەوام دەستیان بە ڕومەوە ئەنا تا ئەوەبو لە کۆتاییدا هەلم بۆ هەڵکەوت و لە چەند کەسێکی جیاوازەوە ئەم تێکستانەی بەردەستمانم نوسی‌یەوە و بلاّوم کردنەوە •

من بە بیری خۆم وای بۆ ئەچم کوردە یەزیدی‌یەکان لە ترسی سەرۆك و پێشەوا ئایینی‌یەکانیان ئەم تێکستانە بۆ کەس دەرناخەن و ئەیانشارنەوە و لەکاتی تایبەتیدا نەبێ و بەپێی ڕێ و شوێنی تایبەتی نەبێ، وەکو ئەوە کەسێکیان لێ‌بمرێ ، نایڵێن • هەر بۆیەش من لە تۆمارکردنی ئەم تێکستانەدا تەنها بە نوسینەوەی ئەو بەشانەوە خەریك بووم کە

(٥) س. یەگیزاروْف ، مێژویەکی ئەتنۆگرافیایی کورتی کوردی شارستانی یەریڤان ، ڕاپۆرتەکانی بەشی قەفقازی کۆمەڵی جیۆگرافیایی ئیمپراتۆریەتی ڕوس ، تیفلیس ، ١٨٩١ ، بەرگی ١٣ ل ٥٣ (بە ڕوسی) ؛ گ. ف. چورسین ، کوردەکانی ئازەربایجان ، تیفلیس ١٩٢٥ ، ل ١٠ (بە ڕوسی) ؛ ئۆ. ل. فیلچیڤسکی، کوردەکانی موکریان، مۆسکو ١٩٥٨، ل ٢١٦ (بە ڕوسی) ؛ مەلا مەحمودی بایەزیدی ، عادات و رسوماتنامە اکرادیە ، وەرگێڕان و پێشەکی بۆ نوسینی م. ب. ڕودینکو ، مۆسکو ، ١٩٦٣ ، ل ١٧ ، ٥٠ ؛ ت. ف. ئەریستۆڤا ، کوردەکانی پشت قەفقاز ، مۆسکو ، ١٩٦٦ ، ل ١٦٤ ؛
Hansen Henny Harald' The Kurdish Woman's Life. Kobenhavn' 1967, P. 140 — 141.

پەیوەندیان بەلایەنی ئاوازەوە نی‌یە[٦] .

شینی کوردە یەزیدی‌یەکان پەیوەندی بە دابی ناشتنەوە هەیە ، بەو شـوێن و کاتەوە کـە مردووەکەی تیا ئەمرێ . هەر لەو کاتەوە کە هێشتا مردووەکە لە ناو جێگاکەیدایەتی ، دەست ئەکەن بە لاواندنەوەی . یەکسەر پاش گیان دەرچوونیشی کفنی ئەکەن و لە سـەر تەختەیەك یان مێزێـك دائەنێن . تا سێ ڕۆژ لە ماڵەوە ئەیهێڵنەوە . پاشان ئەیبەنە سەر قەبران و بە ڕێگاوە هەر ئەیلاوێننـەوە و بەستەی بۆ ئەڵێن . ئەنجا ئەیخـەنە ناو گۆڕەکەی . لاواندنەوە هەر بە ڕۆژ ئەبێ . لە ناو کوردە یەزیدی‌یەکانـدا باوەڕێکی وا هەیە ئەڵێن ئەگەر بە شەو شین بۆ مردوو بکەن ، شوێنەکەی لە ناو گۆڕەکەیدا تەڕ ئەبێ . شین و لاواندنەوە لای کوردەکان بە پێویست ئەزانرێ . ئەوان وایان لا باوە ئەگەر بۆ مردوویان نەگرین و نەیلاوێننەوە ، ئەوە بە نەنگ و شووره‌یی‌یەکی گەورە دائەنێن بۆ ئەو ماڵە[٧] .

هەر لە پاش مردووەکە ، یەکسەر ژنان دەست ئەکەن بە لاواندنەوە و شین بۆکردنی ، بە تایبەتی کەسانی نزیکی وەك ژنی ، خوشکی ، دایکی ، کچی . پاش کفن‌کردنیشی ژنان و خزمەکانی لای سەریەوە دائەنیشن و دەست ئەکەن بە شـین‌بۆکردنی . بەمانە ئەڵێن (دڵشەوەت) واتە (دڵ گەرم). لەپاش ئەوانیشەوە خزمە دوورەکانی و ئەوانەی لەگەڵیانا بەشداریی پرسـە

(٦) بابەتی لاواندنەوە بە ماتەمینی ئەوترێ . سەرەتا بە نۆتـەیەکی بـەرز و پاشان ئاوازەکە نزم ئەبێتەوە . هەروەك دانانی ئاوازێك وایە کە سەرەتای دەست پێ‌کردنی نۆتەکان بەرز بێ و پاشان هێواش و نزم بکرێتەوە .

(٧) کوردە موسوڵمانەکان کە کەسێکیان بمرێ ، کوردی یەزیدی بانگ ئەکەن شینیان بۆ بکا ، چونکە یەزیدی‌یەکان شارەزایی‌یـەکی تەواویـان لـە هەڵبەستنی شیندا هەیە و لەگەڵ کوردە موسوڵمانەکان بەراورد ناکرێن .

ئەکەن و ئەلاوێننەوە • ئەمانەی دواییش کە بەشداریێ ئەکەن و مردووەکە ئەلاوێننەوە ، زوڕ جار ڕێ ئەکەوێ خزمێکی نزیــکی مردووەکە ئەبــن • بەمانە کە کۆڕی شــین گەرم ئەکەن ، ئەگوترێ ( دڵشــکەستی ) واتــە (دڵشکاو) • ئەمانە ئەوەندەی بۆ مردووەکە ئەگرین ئەوەندەش بۆ مردوی خۆیان ئەگرین و ئەلاوێننــەوە • بەڵــکو جار جار لــە شــینەکەدا ناوی مردووەکەی خۆیشیان ئەبەن •

لەپاش ژنان پیاوان دەست ئەکەن بە شین و لاواندنەوە • پیاوان هەر بۆ پیاو ئەگرین ، بەڵام واش ڕێ‌ئەکەوێ کە بۆ مردنی ئافرەتیش بگرین و بلاوێننەوە ، ئەوەش لە کاتێکا کە ئافرەتە مردووەکە هــەندێ خــاسیەتی تایبەتیی تیابێ وەکو ئازایێ و نەبەردیێ و زیرەکی‌یەکی لــە ڕادەبەدەر ، یا ئەگەر سەرکردەییی هۆزەکەی گرتبێتەدەست • ئەوە لەم حاڵەدا پیاوان بۆی ئەگرین و ئەیلاوێننەوە •

لاواندنەوە لە ناو کوردە یەزیدی‌یەکاندا پیشەیەکی تایبەتێ نی‌یەتاقمێکی تایبەتێ پێ‌یەوە خەریك بن • بەڵام هەندێ کەس هەن شارەزایی‌یەکی چاکیان لە لاواندنەوەدا هەیە • ئەمانە زۆر جار وا ڕێ ئەکەوێ لــە مردنی یەکێکا وەك‌پیاوێکی گەورە و ناودار یاخود ســەرەك هۆزێك ئامادە ئەبن و لە ماڵی مردووەکەوە بە تایبەتێ بانگ ئەکرێن بۆ لاواندنەوەی •

بەیتی شین و لاواندنەوە لە ناو کوردا هەرگیز بە کۆمەڵ نەبوە ، بەڵکو هەمیشە لە لایەن یەکێکەوە بە تەنها وتراوە • ئەمەش بووە بە مایەی ئەوە کە تێکستی لاواندنەوەکە بمێنێتەوە • ئەوانەی لاواندنەوەکە ئەڵێن ، بە نۆرە ئەیڵێن بێ‌ئــەوەی یەکێکیان بەســرابێتەوە بەویانــەوە یاخود هۆنینەوەی لاواندنەوەکەی لە هیی ئەوی‌تر بکات • تەنها ئەوە نەبێ کە ڕیشەی ئاوازی

گریان و هاوارەکەیان بە تەواوێ جێی گرتووە و لە یەك ئەکەن • سەرەڕای ئەم ڕوخسارە کەمەش ، بەیتی لاواندنەوە بریتی‌یە لە (سێ ، چوار ، پێنج بەیت) • نابێ بە تێکستی بەیتی لاواندنەوەی کوردێ بووترێ نەگۆڕاو • تەنها ئەوەندە هەیە ئەتوانرێ بووترێ سەربەیتەکانیان لە ڕۆی ڕوخسارەوە دۆبارە نابنەوە[8] • هەر شین بێژێك بە پێی سەردەم و سەدەی خۆی ، بە هەر جۆر بۆبێ ، لاواندنەوەی هۆنیوەتەوە[9] • بۆ ئەمەش چەند جۆرە ئاوازێکی گریان و لاواندنەوەی ئامادە کردووە و هەمۆ هێز و توانای خۆی لە هۆنینەوەی شینەکەدا خستووەتە کار •

ئەتوانین شینی کوردێ دابەش‌بکەین بە دۆ زنجیرە : شینی پیاوان و شینی ژنان • خاسیەتی شینی پیاوان (کە پیاو شین ئەکا) لەوەدایە کە پڕە لە ڕەگەزەکانی داستانی قارەمانەتێ و لیریك و لە ناو شینەکەدا دەربارەی ئازایەتێ و بڕیاری سەرکەوتن لە شەڕدا و لە ڕمبازیدا دەدوێن و خۆشەویستیی باوك و کوڕ دیارە•لە شینی ژنانیشدا (واتە کە ژن شین ئەکا) زیاتر ڕەگەزی لیریك و دڵدارێ زاڵە لەگەڵ دەربڕینی بێزارێ لە تەنهایێ و خەم و ئازار بۆ مردووە لەکیس‌چووەکە • لەم شینەدا داوا لە مردووەکە ئەکرێ کە ئەمانیش لەگەڵ خۆی بەرێ •

بە عادەت ، شینی کوردێ زۆر بەش بەشە • تێکستی لاواندنەوەی ژنان تەنها ژن ئەیڵێ • هیی پیاوانیش هەر پیاوان ئەیڵێن تەنها لە یەك حاڵەتدا نەبێ کە ئەویش ئەوەتە تێکستی شینەکە بێ لایەن بێ واتە بە تایبەتێ بۆ پیاو یا بۆ ژن نەبێ ، ئەوە لەو کاتەدا ژنیش و پیاویش ئەتوانن شینەکە

(٨) ك. ف. چیستۆف ، سەرچاوەی پێشو ، ل ١٠ .

(٩) بڕوانە : ئۆ. ل. ڤێلچێڤسکی ، سەرچاوەی پیشو ، ل ٢١٦ .

بکەن و بەیتی لاواندنەوەکە بڵێن • بۆ ئەمەش ئــەو پیاوانە یا ئــەو ژنانە ئاواز و تێکستی شینەکە بە پێی پێویستی شوێنەکە ئەگۆڕن[10] ( تەماشای ژمارەکانی خوارەوە بکە ) •

لە بەشی لاواندنەوەی پیاواندا خاسیەتێکی تایبەتی هەیە بۆ هۆنینەوەی شینەکە ئەویش دابی ( کۆتەڵ )ە کە هەر پیاوان بەشداریی تیا ئەکەن•کۆتەڵ بریتی‌یە لەوە ئەو ئەســپەی مردووەکە خۆی لە ژیانیا سواری ئەبوو ، زین ئەکەن و جل و بەرگی کابرا ئەخەنە سەر زینی ئەسپەکە و دەمانچەکەشی پیا هەڵئەواسن و کڵاوەکەی لە سەر دائەنێن • قوماشێکی ڕەشیش ئەدروون بە ملی ئەسپەکەدا ئەگەر مرودوەکە پیر بووبێ • خۆ ئەگەر گەنج بووبێ ئەوە قوماشێکی ڕەنگاوڕەنگی پێوە ئەدروون و ئەسپەکە بەو جۆرە بەناو ئاواییدا ئەگێڕن[11] • لە کاتی کۆتەڵ ئامادە کردندا کلکی ئەســپەکە ناهۆننەوە • ئەگەر مردووەکە گەنج بووبێ و ڕەنگی ئەسپەکەی سپی یاخود کوێت بێ ، ئەوە کلکی ئەسپەکە ئەگرنە خەنە • یەکێکیش لە پیاوەکانی هۆزەکە ئاڵای هۆزەکە هەڵئەگرێ و لە پێشی ئەسپەکەوە ئەڕوا و ئەسپەکەش لە سەرخۆ بە دوایدا و ماڵ بە ماڵ بە ناو دێکەدا ئەیگێڕن و مردووە کە ئەلاوێننەوە و باسی ئازایەتیی ئەکەن لە شەڕدا لەگەڵ دوژمن •• باسی ئەو ڕۆژانەی ئەکەن کە بە نەبەردیی لە جەنگدا سەرکەوتووە •• باسی برسی کەوتنی هــاوڕێکانی ئەکەن پاش خۆی •• باسی ڕووداوی ناخۆشی مردنەکەی ئەکەن •• تاد •

---

(١٠) بۆم لوا بە دەنگی پیاوانیش و ژنانیش گوێ لە بەشێك لە لاواندنەوەی ژمارە ١٣ بگرم و بینووسمەوە •

(١١) بڕوانە : گ. ف. چۆرسین ، سەرچاوەی پێشوو ، ١٠ ؛ نەریتی «کۆتەڵ» لەلایەن نووسەری کوردی سۆڤیەتیی هــاوچەرخ « ئەحمــەد مــیرزا » وە نــووسراوە : « بیرەوەرەی‌یەکانــم ، یەرێڤــان ، ١٩٦٦ ، ل ٨٩ ـ ٩١ (بە کوردی) » •

ئەگەر مردووەکە کوڕی لەپاش بەجێ مابێ ، ئەوە کوڕەکەی کۆتەڵی بۆ ئەگێڕێ • ئەگینـا هۆزەکەی بە تێکڕایێ کۆتەڵی بۆ ئەگێڕن • سامانی سـەرەك هۆزی مردۆ کـە کوڕی لە پاش بەجێنەمابێ ، بۆ هـۆزەکەی ئەگەڕێتەوە(١٢) •

وتمان کە کۆتەڵ بـە ناو دێدا ئەگێڕن ، ڕۆبـەڕۆی ئـەم کۆتەڵە ، کۆمەڵێکی‌تر بە سوارێ لە دێیەکی‌تری نزیك یا دراوسێی دێی مردووەکەوە دێن بە پیر ئەم کۆتەڵە و خەڵکی ئەم دێیەوە کە مردووەکەیان لێ مردووە • ئەوانیش کۆتەڵی بۆ ئەگێڕن • ئەمانیش بەشداریی شینەکە ئەکەن • ئەمانـە بە سوارێ یا خود بە پیادە دێن بە ڕۆی ئەمانەوە • ئەمـانیش بە بانگەواز و هاواری ئەوانەوە دێن و هەست و ناڕەحەتیی خۆیان بە بۆنەی مردنی ئـەم کەسەوە دەرئەبڕن • بەمانە ئەوترێ (هاواری‌یێ) • ئەمانە بەیداخی هۆزەکەی خۆیانیان هەڵگرتووە • کاتێ کە هەردۆ لا بە یەك ئەگەن ، ئەوانەی لە گوندە دراوسێ یا نزیکەکەوە هاتوون بەیداخی هۆزەکەی خۆیان لە ئەسپەکەیـان ئەکەنەوە و ئەیخەنە سەر ئەسپی مردووەکە و دەسـت ئەکەن بە شـین و لاواندنەوە • یەك لە دوای یەك بە نۆرە ئەیلاوێننەوە • لە کاتی ناشتنی تەرمی مردووەکەشدا ئەسپەکە بە دەوریدا ئەگێڕن •

ئەمڕۆ کۆتەڵ وردە وردە بەرەو نەمان ئەچێ • کۆتەڵ تەنها لە هەندێ لە دێهاتەکاندا ماوە • لە شـارەکاندا لاواندنەوە بەستراوە بە کۆتەڵەوە ،

---

(١٢) ناخۆشترین شت لای کوردە یەزیدی‌یەکان دوعای شەڕە ، وەك ئەوە کـە ئەڵێن « بلا کۆتەڵی ڕەش بەردەرێ تە بگەڕێ » . بەم شێوەیە هەسـتی دەرۆنیان دەرئەبڕن و ئەپاڕێنەوە کە دوعا لێکراوەکە پـاش مردنیـش پاشماوە و وەچەی لە دوا نەمێنێ .

بەتایبەتی لە کاتی ناشتنی مردووەکەدا و ئەمەیش لە سەر گۆڕی مردووەکە ئەکرێ[13] •

جۆرە لاواندنەوەیەکی‌تر هەیە ، پیاوان و ژنان پێکەوە تیا بەشدار ئەبن • ئەم جۆرە لاواندنەوەیە تەرخانە بۆ ئەوکەسانەی لە غەریبیدا ئەمرن• دەردی ئەم جۆرە مەرگە زۆر گرانە ، بۆیە لاوێنەرەوەکان لە لاواندنەوەکەیاندا ناگرین چونکە مردووەکە لە وڵاتی خۆیدا نەسپێرراوە بەخاك تا داب و نەریتی باوی خۆیانی بۆ جێبەجێ بکەن•لەمەش ناخۆشتر و قورستر مەرگی ئەو کەسانەیە زۆردار بە ناهەق ئەیانکوژێ و تۆڵەیان ناسەنرێتەوە ( بڕوانە ژمارە ١٨ ، ١٩ ، ٢٧ ، ٢٩ ) •

یەکێك لە گرنگترین بابەتەکانی لاواندنەوەی مردو لە کوردیدا لۆمەو سەرزەنشت‌کردنی مردووەکەیە لەسەر مردنی • ئەم بابەتە هەر وەك چون م• ئازادۆفسکی ڕۆنی ئەکاتەوە بریتی‌یە لە کۆنترین بەشی ئاواز[14] ( بڕوانە ژمارە ٢ ، ٥ ) • بابەتێکی‌تریش بەم بابەتەوە پەیوەندە، ئەویش بابەتی تەنهایی‌و بەجێ‌هێشتنە • ئەم بابەتەش ئەخەینە پاڵ بابەتی خەیاڵی کە ڕوی دەم ئەکاتە سروشت و داوای لێ ئەکا جوانیی ڕەنگی مردووەکە نەشێوێنێ و تێکی‌نەدا ( بڕوانە ژمارە ٢١ ) •

لە شینی کوردیدا وێنەی دڵ پەسەند ئەو وێنەیەیە کە وەسفی هەتیوێ ئەکا لە چوار چێوەی دیمەنی جوانی سروشتدا ( بڕوانە ژمارە ١١ ، ١٢ )•

---

(١٣) زوربەی دابی لاواندنەوەم لە زمانی (عەلی‌بێ جەنگۆ)وە وەرگرتووە کە ساڵی ١٩٢٤ لە گوندی (جەرجەریس) لە ناوچەی (ئەپاران) هاتووەتە دنیاوە و خوێندەوارە و ئێستا لە (تیبیلیسی) ئەژێ . سوپاسێکی قوڵی بێ پایانی ئەکەم .

(١٤) م. ك. ئازادۆفسکی ، سەرچاوەی پێشو ، ل ٤٣ .

لە لاواندنەوەی کوردیدا شــوێنێکی تایبەتی تــەرخان کراوە بۆ ئاوڕدانەوە لە هەستی دەرونی خزم و کەس و کــار بەرابــەر مردووەکە ( بڕوانە ژمارە ٢٣ ، ٢٥ ) •

شینی کوردی هەمیشــە ئەم نیشانانەی پێوە دیارە : تکاکــردن ، ناڕەحەتی و بێزاری ، سەرزەنشت و سەر کۆنەکردن • بەمە داوا لە حەکیم ئەکەن کە چاری مردووەکە بــکا ( بڕوانە ژمارە ١٦ ، ١٧ ، ٤٠ ) • لەم وێنانــەدا گلەیی‌کردن پەیوەندە بەوەوە کــە هیچ ڕێگایەکی‌تر نی‌یە تەنها گۆڕی مردووەکە نەبێ ، چارەسەریش لە لەکیس‌چونی مردووەکە بەولاوە نی‌یە • ( بڕوانە ژمارە ١٧ ، ٣١ ) •

لە شــینی کوردیدا مردووەکە بە ناوی خۆیــەوە یاخــود بە ناوی هۆزەکەیەوە بانگ ئەکەن ، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی مردو بــە نــاوی ( سوارە )وە بانگ ئەکەن ، واتە ئەوەی سواری ئەسپ یاخود ماین بووە• بۆنمونە : « سیارێ وێ جەنیێ ، محینێ » « سوارە پاشا » ، « پاتشایی سیارا » ، « سوارە گوڵە » « گوڵە سیارا » ، « جوانترین لاو » ، « خورتێ تورە » ، « باشترین سوارە » ، « شەنگەسیار » تاد •

لە شینی کوردیدا ناوی ( عیزرائیل ) بە ( گیانکیش ) یــاخود ( ڕۆح کشتێن ) ئەبەن •

ناوهێنانی مردن لە لاواندنەوەدا وەنەبێ هەمیشــە بە ( خوازە = استعارە )بێ ، هەندێ جار ئەوترێ ( فلان کەس مرد )واتە یەکســەر ناوی مردنەکە ئەبەن • هەنــدێ جاریش مردن لە وێنەی ( کوشــتن )دا دێتــە سەر زار ( بڕوانە ژمارە ٣٢ ) •

گیان‌دەرچون زۆر جار لە وێنەیەکی شیعریدا ئەچێتە دیمەنی ئاسکێکی هەڵاتووەوە • لێرەدا ناتوانرێ بە ئاسانێ لە جۆرە کوردی‌یەکانی ئـەدەب بکۆڵرێتەوە ، بە تایبەتی لە گۆرانێ ، لیریك ، چیرۆکدا وێنەی ئاسك بە گران دەسگیر ئەبێ •

کارتێ‌کردنی ئەفسانەی فۆلکلۆری کوردێ ئەتوانرێ لە وێنەی تریشدا بەدێ بـکرێ • بۆ نمونە : شـوان • شوانە چەند سـاڵ ڕەنجی داوەو بابیی ڕەنجەکەی هیچیان نەداوەتێ • لێرەدا ئـەم وێنەیە ئەشـوبهێنرێ بە باوك و کوڕێ کە باوکەکە لە پیریدا کوڕەکەی لێ ونبوبێ و ئەم کارەساتی کوڕ ونبونەی لێ ڕوداب‌ێ ( بڕوانە ژمارە ٧ ) •

لە فۆلکلۆردا ، بە تایبەتێ لە فۆلکلۆری لاواندنەوەدا ، بابەتی دوعای شەڕ کردن هەیە کە دوعاکەرەکە واز لە هەمو خۆشێ و شادی‌یەك ئەهێنێ لەدوای مردوە نزیکەکەی و ئەیەوێ خوا لە هەموی بێ‌بەشی‌بکا ( بڕوانـە ژمارە ٣٠ ) •

لە ناو لاواندنەوەدا چەند وێنـەیەك هەیە یەکسەر بـاسی ڕوداوەکە ناکەن ، بەڵـکو کەمێـکی لێ دەرئەبڕن • لـەم حاڵەدا مرۆڤ ئەتوانێ بەئاسانێ لەناو تێکستەکەدا باسی ڕوداوەکە بدۆزێتەوە و ئەو ڕەگەزانەی دەست‌نیشان بکا کە باسی ڕوداوە ڕاستی‌یەکە ئەکەن ( بڕوانە ژمارە ٤٤ ) • ئەم ڕاستی‌یە هەروەها لە بابەتی شاییشدا بەدێ ئەکرێ •

پێویستە ئەو گرنگی‌یە تێ‌بگەین کەوا لە شـینی کوردیدا ، وەك لـە هەمو هۆزراوەیەکی تری میللیدا ، بار ( ظروف ) هەیە • بێ تێگەیشـتنی ئەم بارە ناتوانین لە ناوەڕۆك و بیری تێکستی شـینەکە بگەین • لەمەوە دەرئەکەوێ کەوا هەمو بابەتەکانی گۆرانیی میللی ، بەتایبەتێ لاواندنەوە ،

چەند بەشێك ئەگرێتەوە • لە شین و لاواندنەوەدا ، لە جـۆری لیریکی میللیدا بە ئاسانێ ئەتوانرێ (بار ) بدۆزرێتەوە •

سروشت لە شینی کوردیدا جێگایەکی گەورە داگیر ئەکا • لوتکەی شاخاویی بە بەفر داپۆشراو ، درەختی ڕوتی گەڵا وەریو ، کانیاوی سارد، پارچە زەویێ توزێ بەفری لێتوابێتەوە ، بەهاری ڕەنگین و ئاوی بارانی بەخوڕ ، گیای بۆنداری بە با بڵاوەبو ••• هەمو ئەم جۆرە درێژە پێدانانە بە شێوەیەکی ئەندامێ لەگەڵ هۆ سەرەکیێەکەی شینەکەدا ئەچن بە یەکدا و دەوروبەرو ( خلفیه )یەکی تایبەتیی بۆ دروسـت ئەکەن • سروشت هەمیشە بە ئاسانێ خزمەتی دەوروبەری ناکا بەڵام خۆی لە خەمی قارەمانـەکانی ڕوداوەکەدا بەشـداری ئەکا • واتە سـروشـت ـ ئەناڵێنێ بۆ ونبونی بارانی پاییز ، لە ناخیدا بەستۆیەتی و بە بێدەنگێ ئەلاوێنێتەوە •

باشترین خاسیەتی لاواندنەوەی کوردیی کورت بڕێتیێە لەوە کـە بە بەرزترین دەربڕینی هەست ئەژمێررێ و لەگەڵ ئەم هەست دەبڕینـەدا بەو شـێوە کورتە ، زیاتر کار لە گوێگران ئـەکا و زوتر تێیئـەگەن • زمانی لاواندنەوە پڕە لە خوازە ( استعارە )ی شیعر و لە هەمانکاتدا زۆریش ساکارە • لە لاواندنەوەدا چەند ڕستەیەکی کورتمان بەرچاو ئـەکەوێ ، بێ خۆ پێوە خەریككردن دەرکی پێ ئەکەین کە شینە ، وەك : « سیـاری هەسپێ دێل بەردای » و « گرتیێ میرێ ئۆلمە » ، « خراپ کرییە ماڵا خۆە بتەنێ » ، « هێ ژ دەرێ ماڵا تە تێ دەنگێ گرێ و سەوتا شینێ » ، « چعقێ خۆە دگەڕینم ، سیارێ خۆە نابینم » •• هتد

ئەم نمونانەی کە لە شێوەی جوانکاریدا بەدیئەکرێن و لە دەورێکی پڕ خەمدا دەرئەبڕرێن ، پاش دەنگ و ناڵە و گریان و پرسیـاری ئـاشکرا ئەوترێن •

زنجیرەی شینی نۆرەی پیاوان هەمیشە بە « لۆ ــ لۆ ــ سیارۆ یاخود « هەی ــ لۆ ــ سیارۆ » دەست پێئەکات • زۆرجاریش بە « لۆ ــ لۆ باڤۆ ، هەی ــ لۆ برایۆ » دەست بە لاواندنەوە ئەکەن • لە شینی ژنانا و لە زوربەی ژێکەوتا بە : « لێ ــ وایێ ، لێ وایێ » ئەلاوێننەوە (١٥)•

ڕوخساری شینی کوردێ بریتییە لە سێ یاخود چوار دێڕ لەگەڵ جوت بونی قافیەکان « ئا ئا ئا ئا ب ب aaa , aa bb » زۆر جاریش پێنج یاخود شەش بەیت ئەبێ لەگەڵ یەکێتیی قافیەکاندا • ئەبینین سەرەتای دێرەکە لەم هۆنراوانەدا دەنگێکی ساکاریان هەیە • جاریوا ئەبێ ئەوە ڕوئەدا ئەوانەی کە شینەکە هەڵئەبەستن شێوەی بەیتەکان ئەشێوێنن ، لە کاتی خەم و ناخۆشێ و هەستی بە جۆشی دەرونیاندا قافیەی دێڕەکان لەنگ ئەبێ • بۆ نمونە :

باڤۆ ، من بەلەنگازی ، من سەفیلی ، من سەرگەردان
باڤێ من مرییە ، ئەز بومە سەفیل •
باڤۆ ، بافتی تشتەکی چێیە
زەینەتە ڕۆ عەردێیە

لە شینی کوردیدا کێشی پەنجەش زۆر بەرچاو ئەکەوێ ، بەڵام لەم نمونانەدا زیاتر ئاوازی کێشی شیعرێ ئەبینرێ • واتە لە دێڕێکدا کۆمەڵی بڕگە وەتەبێ هەمو وەك یەك بن ، بەڵام لە زوربەی دێڕەکاندا دەنگەکان وەکو یەکن ، کەچێ لەگەڵ ئەوەشدا تەرتیبی ئەم بڕگانەش دامەزراو نییە :

عەور ئەزمانا نایێ دەنگە

(١٥) لۆ ــ لۆ : ئامرازی بانگ هێشتنە بۆ پیاو و (لێ ــ لێ)یش بۆ ژنە.

ئەمێ تابۆتەکە مالخۆیێ مالێڕا چێکن دارا چامێ
تەختی ڕەنــگە
برا مالخۆیێ مالێ تێدا نەکرە خۆبار و زەنگە •

لەم پەیوەندی‌یەوە بەجوانێ سەرنجی ئەوە ئەدرێ کە شێن یەکێکە لــە جۆرە کۆنەکان و ڕەنگدانەوەی شیعری میللیی زیاتر تیا بەدێ ئەکرێ • لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە هۆنراوەی میللیی کوردێ بە پەنجە بووە • ئــەم کێشە کاری لە شیعری کلاسیکییش کردووە • سەرەتای کێش لە هۆنراوەی میللیی کوردیدا بناغەکەی لەسەر دەنگەکان دامــەزراوە • لــە دێڕێکا دوو یاخود چوار دەنگ ڕوو ئــەدات و دێڕی دوایــێ هەمیشــە لــە دێڕەکانی پێشوو درێژتر ئەبێت •

ئەم تێکستانەی کە لێرەدا بلاوکراونەتەوە هەموویان لە دەمی کوردە یەزیدی‌یەکانی پشت قەفقاز ( تیبیلیسێ )م نووسیونەتەوە• زۆرترینیان لــەو کەســانەم کۆکردوونەتەوە کە شارەزایی‌یەکی چــاکیان لــە هەلبــەستنی لاواندنەوە هەبوو •

ئەم لیستەیەی خوارەوەش ناوی ئەوانەیە کە تێکستەکانم لــە دەم وەرگرتوون :

(١) عەلی‌یە جەفۆ ــ ١٨٩٢ ، خەلکی گوندی ( کۆریخ بوگاز )ە لــە ناوچەی (ئەپــاران) لە ئەرمینیا • لە ( تیبلیسێ ) ئەژێ • خوێندەوار نی‌یە (ژمارە ١ ، ٢ ، ٤ ، ٥ ، ٢٢ ، ٢٤ ، ٣٢ ، ٣٤ ) •

(٢) بێ دل تەفور ــ ١٩٢٨ ، خەلکی گوندی ( کورەکاند )ە لە ناوچەی (ئێرڤان) • لە (تیبیلیسێ) ئەژێ • خوێندەوارە (ژمارە ٣ ، ٧ ، ١١ ، ١٨ ، ٢١ ) •

(٣) سەچۆ حاجێ ــ ١٩١٠ ، لە تورکیاوە هاتووە • خەڵکی گوندی (مۆچ)ە لە ناوچەی (وان) • لە (تیبیلیسێ) ئەژێ• خوێندەوارە ( ژمارە ٢٨ ، ٣١ ، ٣٥ ، ٤١ ، ٤٤ ) •

(٤) سەبری شاڤیش ــ ١٩١٠ ، خەڵکی گوندی ( جەرجەریس )ە لە ناوچەی (ئەپاران) • لە (تیبیلیسێ) ئەژێ • خوێندەوار نی‌یە ( ژمارە ١٢ ، ٢٧ ) •

(٥) ئەکۆبیێ سلێمان ، ١٨٩١ ، لە شاری ( قارس )ی تورکیاوە هاتووە • لە گوندی ( کۆریخ بوگاز ) ئەژێ • خوێندەوار نی‌یە • ( ژمارە ٣٦ ، ٣٨ ) •

(٦) حەمۆیێ حەسەن ــ ١٩٣٣ ، خەڵکی گوندی ( چەمۆ شڤان )ە لە ناوچەی (ئەپاران) • لە (تیبیلیسێ) ئەژێ • خوێندەوارە • لە کارگا کار ئەکا ؛ یەکێکە لە باشترین شایەرو حیکایەت خوانەکان ( ژمارە ٢٥ ، ٢٦ ، ٤٠ ) •

(٧) کەریم باباسێ ــ ١٨٨٢ ــ ١٩٦٧ • لە گوندی ( قەرە جۆگە )ی تورکیاوە هاتووە • لە (تیبیلیسێ) ژیاوە • خوێندەوار نەبۆ • ( ژمارە ٢٧ــ٣٩ ) •

(٨) جەلیلێ ڕیشۆ ، ١٨٨٤ • لە تورکیاوە هاتووە ، لە (تیبیلیسێ) ئەژێ • خوێندەوار نی‌یە (ژمارە ١٦) •

ئێستا ئیتر کاتی ئەوە هاتووە هەستی خۆم بەرابەر ئەم شین بێژانە دەرببڕم کە ڕێگایان دام تێکستەکانی شینی کوردێ بنوسمەوە • جا جوانترین و قوڵترین ڕێز و سوپاسگوزارێ دەرئەبڕم بەرابەر بەم یارمەتی‌یە

بەرخە • هەروەها سوپاسێکی زۆر و پڕ وەفایش دەرئەبڕم بۆ دۆستی ئازیز و بەڕێزم (ک• ف• چیستۆڤۆ) کە دەستی یارمەتیی بۆ درێژ کردم و چەند تێبینێ و ئامۆژگاریی دامێ لەم کارەمدا •

**کۆمەڵە لاواندنەوەی ژنان** (١٦–١٧)

١ ــ لۆریکا من دارینە
دایێ مەعرۆمە ، لۆریکێ هلدە ناڤا هەڤالاً بگەڕینە
لۆریکا من زارەکە چێیە
دەلالا دلێ دێیە
لۆریکێ بڕەڤینە ، بڤنە مالا خالێیە
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

٢ ــ کوڕێ من کوڕەکی باشە
ئەزێ کوڕێ خۆە برێڤێنم ، بڤمە مالا کالکێیە
دایێ ڕەبەنێ ، کوڕێ من کوڕەکی چێیە
ئەزێ بەلەنگاز کرم ، ئەز مامە تەنێ !
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

٣ ــ هەفت خوازلاً (١٨) ڤی زەمانی

(١٦) و (١٧) لەم بەشی لاواندنەوەیەدا کە هەر ژنان ئەیلێن ژمارە ١ــ ٢ بۆ مردنی کوڕێکی کەم تەمەنە . ژمارە ٣ بۆ باوکە . ژمارە ٤ــ٦ بۆ برایە. ژمارە ٧ ــ ١٣ بۆ پیاوانە کە خزم نەبن . ژمارە ١٨ ــ ١٩ بۆ ئەوانەیە لە غەریبیدا ئەمرن . ژمارە ٢٠ بۆ دەزگیرانە . ژمارە ٢١ بۆ تازە بوکە یاخود بۆ دایکێکی گەنج .

(١٨) لە تێکستەکەدا : « هەڤت خوازلاً » واتە : حەوت جار بێ .

وەکی باڤێ من مالخوێ بۆ ئەز کەڤانی
ئەزێ پاشێ مالخوێ مالێ بۆمە عەرد و خوەلی !
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

٤ ــ چیایۆ ، چیایێ جوودێ (١٩)
پسمام ــ لێزما (٢٠) لێ‌کرییە هەڤسوودێ
خۆشکێ مەعرۆمێ چعڤی خوە دگەڕینە
برانگێ خوە ناڤا پسماما ناڤینە
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

٥ ــ بەرفێ چیایێ بلند شەپەکر
کارا خەزالێ سەرڕا چەلاپێ‌کر
برانگێ من‌مرییە ئەز بێخۆیی (٢١) کرم !
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

٦ ــ ئەزێ ناسەکنێم هێلانا بلند جێیا
تۆزە ــ خۆبارە ئاڤیتیە سەرێ دێلێ بژییێ مەعنەگیپا !
ئاخر ئۆڵمە (٢٢) ، میرێ ئۆڵمە ، برا دەستێ خوە بەر سەرێ هلینە
برا خەم و خەیال دلێ خۆشکا مەعرۆمدا (٢٣) نەمینە !

---

(١٩) ناوی ئەو شاخەیە کە کەشتی‌یەکەی نوحی بە سەرەوە گیرسایەوە (داستانێکی موسوڵمانەکانە) .

(٢٠) لە تێکستەکەدا پسمام ــ لێزما « بە واتای خزم و خۆ هاتووە » .

(٢١) لە تێکستەکەدا : بێ خوەیێ « واتە : بێ خاوەن و بێ کەس » .

(٢٢) لە تێکستەدا «ئۆڵم». میرێ ئۆڵم : مرۆڤی خراپ ، مرۆڤی تۆڕە . لێرەدا مەبەست لە عیزرائیلی فریشتەیە کە گیان‌کێشانی پێ سپێرراوە.

(٢٣) ناوی مردووەکە .

لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ

٧ ــ ته مالەکه خوەڕا کرییه ڕٚعاتێ

دل ــ هێناڤێ خوە ته پێدا پاعتێ
چاوا تێ ، دەردکەڤێ نۆلا شڤانەکی حەق ــ هلاتێ !
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

٨ ــ چیایێ ڕۆ لێ مـــایه

قامچییێ زێڕ بادایـــه !
حەیفا من تێ مالخوێ مالێ چاوا واڕەش ، وارندایه (٢٤) !
لێ ــ وایێ ، لێ وایێ !

٩ ــ کاڤلا تڤلیسێ نیڤەکا دنێ (٢٥)

کۆچێ تەنگه ڕێ ناچنێ
حەیفا من تێ خورتێ تۆره مالخوێ مالێ کەتیبه بەر مرنێ !
لێ ــ وایێ ، لێ وایێ !

(٢٤) له تێکستەکەدا : « وار ڕەش وارندا » واته : تیرەی ڕەشپۆش ، تیرەی شەهید . واتای ئەم ڕستەیه ئەوەیه که مرۆڤێ کەسی بۆ نەمابێتەوه لـــه پیاواندا ، هەر هۆزەکەی مابێتەوه . «تۆ وارندا (وار ڕەش) بی » واتـــه : با هۆزەکەشت هەمو شەهید کرێ . ئەمه لای کورده یەزیدی‌یەکان لـــه ناخۆشترین دوعاکانه .

(٢٥) مەبەستی ئەوەیه به بۆچۆنی لاواندنەوه بێژەکه : « ڕۆناکیت نەمێنێ » . ئەمه ڕەنگدانەوەی ئەوەیه که کورده یەزیدی‌یەکان له سەرەتای سەدەی بیســـتەوه له تورکیاوه هەڵاتن و زوربەی زۆریان له تیفلیس ( تیبیلـسی ) نیشتەجێ بۆن .

١٠ــ عەردێ ئەنتۆنۆڤسکێ ــ عەردەکی دێمە (٢٦)
تەڤرکۆلۆ ، تەڤرەکی لێخە ، عەرد ئەرزێمە
حەیفا من تێ مالخوێ مالێ ، کەڤانیا مالێ چاوا تێدا بنخێمە ؟
لێ ــ وایێ ، لێ وایێ !

١١ــ چ ئێستیمە بەر دیوارا
لێ دکە شلی ــ شلۆپێ دەر بهارا
وەکی باڤێ ئێتیما دمرە ، کەسەك تونە دەستێ وانا بگرە بڤە بەر ستارا
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

١٢ــ چیایێ بلند بەرڤێ لێکر
لەقلەڤێ تێدا هێلۆن چێکر
.... (٢٧) کەتە بەر مرنێ ، تەموا هێسیرێ هۆر نزام کێ کر ؟
خەزال ڕەڤی ، خەزال ڕەڤی
ئۆرتا من و خەزال چیبا ، بانی ، مێرك و زەڤی !
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

١٣ــ عەور ــ عەزمانا نایێ دەنگە
ئەمێ تابۆتەکە مالخوێ مالێڕا چێکن دارا چامە تەختێ ڕەنگە
برا مالخوێ مالێ تێدا نەگرە خۆبار و زەنگە !
لێ ــ وایێ ، لێ ــوایێ !

(٢٦) لە تێکستەکەدا : «عەردێ ئەنتۆنۆڤسکێ عەردەکی دێمە». ئەنتۆنۆڤسکێ ناوی شاخێکی بەرزە لە تیفلیس . گەڕەکێکی زۆر کۆنیشە . یەکێك لــە گۆڕستانەکانی شار بەم شاخەوەیە . بەشێکی زۆری کوردە یەزیدییەکان لەم گۆڕستانەدا نێژراون .

(٢٧) ناوی مردووەکە .

١٤ــ سیارۆ ، سیارێ نەنێ
خالەکە ڕەشە ل بەر گەردەنێ
ڤالا کرییە پشتا قەوم ــ پسماما ، خراڤ کرییە مالا خوە ب تەنێ !
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

١٥ــ دۆمانە خوە ئاڤێتە سەرێ چییـــا
خۆبارەکە خوە ئاڤێتە دەڤێ مەعنەگییا
وێ قەتاندییە دەستێ هەر دو برا !
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

١٦ــ حەکیمۆ ، ڕابە ، کار ب کار کە
برینێ برینداڕا دەرمان کە !
حەکیم گۆ : « مالا تە خراڤبە ، برینا وان کوڕ ، خەدەرە ! فەیدا ناکە ! »
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

١٧ــ حەکیمۆ ژ هەمایێ !
مەلحەمەکە چێکە مۆمێ ڤێ شمایێ
پێشترێ ئاخێ گۆڕا کەو برینا من نایێ
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

١٨ــ شەڕە ل مە شەڕە !
شەڕە وی کافری کەتیە سەرێ سایيمانا ، لەڤ دگەڕە !
حەیفا باڤێ هۆرکا مالخوێ مالا

وەلاتێ خەریبا تێنە کوشتن بێ حەیفا !
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

١٩ــ کوشتنێ مە دکوشتن
تەیرو تییا پەرێ خوە داهشتن
خۆرتێ تورە وەلاتێ خەریبا تێنە کوشتن ، جێدا هشتن !
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

٢٠ــ سیارۆ ، سیارێ ڤێ جەعنیێ !
دە تو قاسەکی بازۆ سەر کانیێ !
حەیفا من تێ خورتێ تورە مالدا مایە گوستیل ــ تەمەزیا نیشانیێ(٢٨)
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

٢١ــ عەورێ ڕەش ، دیلەکە :
برا کەوکییا بەرفێ ، تاڤییا بارانێ مەزەلێ تەزە نەکە !
حەیفا دایکێ دەرگوشا ، بوکێ ڕو ب خێلی ، چەعقی ــ بڕێ
بەلەك خراڤ نەکە !
لێ ــ وایێ ، لێ ــ وایێ !

**زنجیرەی شـــینی پیاوان (٢٩)**

٢٢ــ لۆ ــ باڤۆ ، لۆ ــ باڤۆ ، لۆ ــ باڤۆ !

---

(٢٨) بە پێی نەریتی کوردەوارێ کاتێ کە دەزگیران ئەچێ بۆ نیشانەکردنی بوك ئەموستیلە و ئەلقە و لەچکێکی شالی گوڵدار لەگەڵ خۆی ئەبا بۆی وەك دیارێ . تەمەزی : واتە دیارێ بۆ دەزگیرانەکەی .

(٢٩) لە بەشی لاواندنەوەی پیاواندا کە هەر پیاو ئەیلێ ، ژمارە ٢٢ ــ ٢٣ بـۆ مردنی باوکە . ژمارە ٢٤ ــ ٢٦ بۆ برایە . ژمـارە ٢٧ ــ ٢٩ بۆ مردنـی مردوێەکە لە ئاوارەییدا . ژمارە ٣٠ ــ ٤٠ بۆ خزمە ، بەڵام خزمی دوور . ژمارە ٤١ ــ ٤٢ بۆ سەرۆك هۆزە . ژمارە ٤٣ ــ ٤٤ بۆ دەزگیرانە .

باڤۆ ، چما فەلەکێ ها کر ؟

فەلەکێ سەرێ خوە ل من باکر

باڤێ من مرییە ، مالا من خراڤ کر !

٢٣ـ باڤۆ ، من بەلەنگازی ، من سەفیلی ، من سەرگەردان !

باڤێ من مرییە ، ئەز بۆمە سەفیل !

باڤۆ ، باڤتی تشتەکی چێییە

کوڕتی ــ باڤتی زەینەتە ڕۆ عەردێیە

باڤۆ ، جنەت ــ جەهنمە دەستی خوە دێیە !

باڤۆ ، تە یەکێ نە چێ کر ،

تە مالا خوە ژ مالا من جهێ کر !

٢٤ـ لۆ ــ وەرە ، لۆ ــ وەرە ، لۆ ــ وەرە

هەی ــ لۆ برایۆ ، براتی چڤا چێییە

زەینەتە ل ڕۆ عەردێیە

شین و گری دەستێ خوەدێیە

٢٥ـ هەی ــ لۆ برایۆ ، براتی چڤا خوەشە

تۆنانی حمایلەکە ، دۆر ب نەخشە

هەی ــ لۆ ، برایۆ ، ڤێ سبێ زێیی ــ کنێزە تێنە ، گولیێ وانە

بڕینە [٣٠] ، سەرێ وانا ڕەشە [٣١] !

٢٦ــ هەی ــ لۆ ، برایۆ ، برامە نەهاتا بینا بایێ دەنگێ شینێ ،
دەرێ مالا ٠٠٠٠[٣٢] برا تێ دەنگێ شینێ و ڤی گرینێ ،
چاوا بدنێ پۆڕ کوڕا قیزێ ، برا خوە بگهینە ،
دەستێ خوە بدە سەر دەڤێ ڤێ برینێ !

٢٧ــ لۆ ــ لۆ ، سیارۆ ، سەییارێ بۆزا دێل ب حسنێ !
وەلاتێ خەریبا نیڤەکا دنێ
گەلی برا و پسمامنۆ ، وەرن ئەم بەرێ خوە دن وەلاتێ
خەریبا بنێرن ، خەریبێ مە چاوا کەتنە بەر مرنێ !

٢٨ــ هەی ــ لۆ ، سیارۆ ، چییا مقابلێ چییا
ئەزێ دێنا خوە ددمە قیزان بۆکا ، خێلێ خەملێ خوە
دانینە ، کەتنە قلخێ ژنێ بیـــا
حەیفا من نایێ کوشتن عەفات و عەگیتا ، حەیفا من تێ
یەکی خۆرتی تۆرە وەلاتێ خەریبا سەر برینێد خوە دنالیا !

---

(٣٠) بە پێی نەریتی کوردەکان (لای موسوڵمانەکانیش وەك لای یەزیدی‌یەکان) ئەگەر خزمی نزیك ژن ، دایك ، خوشك ، کچ مرد ، ئەمـــانە پرچیـــان ئەبڕنەوە و لە سەر گۆڕەکەیی دائەنێن . هەندێ جاریش ئەوقژەی کە لەسەر گۆڕەکە ئەیبڕنەوە ، ئەیکەن بە دارێـــکەوە ، ڕستەی « پۆر کوری بە » کەواتە : « پرچـــت ببڕێتـــەوە » نـــاخۆشترین دوعایە لای کوردەکان ، بەتایبەتێ لای ژنـــان .

(٣١) لای ژنانی کورد باوە ئەگەر کەسێکی نزیکی وەك مێرد ، باوك ، برا کوڕیان بمرێ بۆ ماوەی سالێك لەچکی ڕەش ئەپۆشن .

(٣٢) ناوی مردووەکە .

٢٩ــ هەی ــ لۆ ، سیارۆ ، برا مە نەهاتا سەڕا سبێ بینا بایێ ڤێ هاڤینێ
برا دەلالێ دلێ مرا تێکرا بایێ باوەشینێ
چاوا کەسەکی وی تونە ، دەستێ خوە بدە سەر دەڤێ ڤی برینێ !

٣٠ــ هەی ــ لۆ سیارۆ ، من سۆند خوارییێ ئەزێ توجار ناچمە چییا
ئەزێ ناخۆم ئاڤا کانێ و بەلەکییا
ئەزێ چەعڤی خوە دگەرینم،سیارێ خوە ناڤینم ناڤا قۆما ڤان ئێزدییا !

٣١ــ هەی ــ لۆ سییارۆ ، چییایێ بلند بەرفێ دلیلاندن
خەزال دادگەڕیان بەریان ژێرین ، بەر تومێ هەوشەنێ کارێ خـــوە دمژاندن ،
بڕینێ خەلفێ یێ شتورا و قەمانێ
بڕینێ سیارێ من ژ مێرێ کولێنە (٣٣) ، ئاخێ گۆڕا خوەدا دکەواندن !

٣٢ــ هەی ــ لۆ ، سییارۆ ، سیارێ ڤێ محینێ
وێ ژ مالا تە تێ دەنگێ گرێ و سەوتا شینێ ،
هە ژ خەما دلێ مڕا سەردا نەیارا داکەتە سەرڤێ کەمینێ !

٣٣ــ لۆ ــ وەرە ، لۆ ــ وەرە ، لۆ ــ وەرە ،
هەی ــ لۆ سیارۆ ، سیارێ مەعنەگێ دێلبەردای (٣٤)
قاپۆتا سەر ملا زێر کلدای
ڕۆژێد ئۆغرمە ــ گران دبە چەرخی چێ و مێرێ هەسپ وەستیای •

---

(٣٣) لە تێکستەکەدا : «مێرێ کولێ» واتە : مرۆڤێ کە خەمی وشك نەبۆبێتەوە. مەبەست لە عیزرائیلی فریشتەی مەرگە .

(٣٤) کوردە یەزیدییەکان لە کاتی کوتەڵدا کلکی ئەسپەکانیان ناهۆننەوە .

٣٤ـ لۆ ــ وەرە ، لۆ ــ وەرە ، لۆ ــ وەرە ،
هەی ــ لۆ ، سیارۆ ، سیارێ وێ محینێ
وی ژ دەرێ مالا تە تێ دەنگێ گرین و سەوتا شینێ
خراب کرییە مالا پسمام ــ لێزما ، خراب کرییە مالا خوە ب تەنێ !

٣٥ـ هەی ــ لۆ ، سییارۆ ، تربێ ڤان جندییا ،
ئەمێ بکۆلن بلند جییا ،
برا سەر تربێ دەلالا دا نەیێ ئاڤێ بەلەکییا ،
ناڤێژە چەعڤێ ڤان دەلالا تۆز و خۆبارێ ڤان گەلییا !

٣٦ـ لۆ ــ وەرە ، لۆ ــ وەرە ، لۆ ــ وەرە ،
فەلەکێ ها ل من هاکر ،
ملێ خوە ل مە هەژاند ، چەپلێ خوە ل مە باکر ،
شەعدێ ــ شوعدێ شەنگە سیارم گەلەك هەنە ، تەقالێد ئێلێد
گرانە کرنە قۆتیکێ پۆلا ، دەری لێ شما کر .

٣٧ـ کەکۆ ، براتۆ ، پاتشایێ سیارا لاوێنە ،
تۆخ و فەرمانێ خوە هلدانە دگەڕینە ،
شەعدێ ــ شوعدێ شەنگە سیارم گەلەك هەنە ، گرتییێ مێرێ
ئۆلمە ، کەس نزانە کێ ئالی بشینە !

٣٨ـ کەکۆ ، براتۆ ، بەرفێ چییایێ بلند دلیلاندن ،
کارێ غەزالێد بەر ڕێی ژێریندا تەرقاندن ،
شەعدێ ــ شوعدە شەنگە سیارم گەلەك هەنە گرتبیێ مێرێ
ئۆلمە ، گرتن ، شانــدن !

٣٩ـ هەی ـ لۆ ، سیارۆ ، ترسا من ، مەعرێ ڤان بەیارا
وێ بکشە بەرێ ڤان زنارا ،
وێ بقۆسینە سمێلێ مێرێ مێرخاس ، وێ بخوە
گوشتێ بریندارا .

٤٠ـ هەی ـ لۆ ، سیارۆ ، حەکیما کەتنە کێشێ ،
ئەمێ ڤێ سبێ ڕابن ، هەڕنە پێشێ ،
دەستەکە باڤێنە دزگینێ ، دەستەکە باڤێنە پێشێ ،
ئەمێ بێژن : « کا دەرمانا ڤێ سەرێشێ ؟ »

٤١ـ هەی ـ لۆ ، سیارۆ ، برا مە نەهاتا سرا سبێ بینا بایێ
ڤێ هاڤینێ ، برا لێنەختا بەژن و بالا سیارێ من ،
نەهەژاندا ڤۆتکێ حەمایلێ ڕیشێ ،
تەیێ ڤێ بهارێ مە شکێناندییە پشتا کۆمێ ، قودۆمێ
چۆکێ ڤێ قەبیلێ .

٤٢ـ هەی ـ لۆ سیارۆ ، ئەزێ چۆمە ئەلەگەزێ ، سەر کانییێ
کەوکییا بەرفێ ئاڤێنە قاپێ حەمدانییێ ،
چاوا کەسەکی تونە پاشی دەلالێ مالێ ڤۆما خوەڕا تێکە سەروێرییێ

٤٣ـ هەی ـ لۆ ، پایزە ل مە کرە گازی
گۆ : « دارا بەلگێ خوە داوەشاندن ، گەردەنێ وانا مـانە ڕۆت و تازی ،
گەلۆ نفرا کێ بۆ ، کۆ : « برا نەگێژی تو بەختا ، تو مرازی » !

٤٤ــ هەی ــ لۆ ، سیارۆ ،سۆکا هەتا سۆکا

ئەمێ هەرنە بازارێ بازار بکن کنجێ زاعفاتییێ ، خێلیێ بوویکا ،

گەلۆ ، نفرا کێ بۆ، گۆ :«حنا زاعفاتییێ برا بمینە سەر نەینۆکا [٣٥]» !



(٣٥) لای کوردە یەزیدی‌یەکان و کوردە موسولمانەکان باوە لە ڕۆژی زەماوەنددا خۆیان ئەڕازێننەوە . بوک دەست و پێی لە خەنە ئەگرێ . مەبەستی ئەم ڕستەیە کە ئەڵێ « حنا زاعفاتییێ برا بمینە سەر نەینۆکا » ئەوەیە زاوا بمرێ لە کاتێکا کە هێشتا خەنەی سەر نینۆکی دەست و پێی بوك کاڵ نەبۆبێتەوە .

**ملخص البحث**

# ندب الموتى لدى الاكراد اليزيديين في ما وراء القفقاس

**بقلم : الدكتورة : مارگريت رودينكو**
**ترجمة : الدكتورة شكرية رسول ابراهيم**

يستعرض هذا المقال الذي كتبته باللغة الروسية المستشرقة السوفيتية الدكتورة مارگريت رودينــكو الباحثة المتخصصة في الادب والفولكلــور الكردي في قسم الدراسات الكردية بمعهد الاستشراق لدى اكاديمية علوم الاتحاد السوفياتي في لينينغراد[1] ، ونشرته مجلة ( پالستينسكى سبورنيك ) في عددها المرقم ٢١ (٨٤) لعام ١٩٧٠ وترجمته الى اللغة الكردية الدكتورة شــكريه رسول ابراهيم المدرسة في كليه الآداب بجامعه السليمانية ، يستعرض التراث الفولكلوري للاكراد اليزيديين القــاطنين في ما وراء القفقــاس ، في رسوم التكفين والتشييع والدفن والندب والنواح وما الى ذلك ، مع بعض نصوص الندب التي يغنيها النادبون على الموتى ، وخاتمة بنبذة من سير الاشخاص الذين استقت منهم النصوص وثبت بالمراجع التي استندت اليها٠

تذكر كاتبة المقال في بحثها ان دراسة جادة لم تجر بعد للاغاني التي تندب الموتى ولكيفية تشييعهم لدى شعوب الشرق الادنى وما وراء القفقاس

---

(١) توفيت في ســنة ١٩٧٦ ٠

باستثناء بعض النصوص التي وجدت طريقها الى النشر مع المقارنة بالانواع الفولكلورية الاخرى، ممايدل على ان السرية ماتزال تحيط بهذا الضرب من الفولكلور بالنسبة لعالم الدراسات العلمية •

وفي رأي صاحبة المقال ان أهمية نصوص الندبة تكمن في كونهـا من الانواع الفولكلورية القديمة ؛ وهي في الوقت ذاته من ابداع غالبية الناس وهي أحد الانواع النموذجية من الفولكلور • انها حدث منظوم حي كما تذكر صاحبة المقال • ان كلمات الندبة توفر المجال لادراك الخفايا المكنونة في أعماق جمهور الشعب ، ويمكن استكناه دخائل النفوس من خلالها •

وتذكر كذلك ان فولكلور الاكراد اليزيديين من الغنى بحيث لا يقاس بفولكلور الاكراد المسلمين • وتعلل الكاتبة ذلك بأن الاكراد اليزيديـين كانوا دوما أميين ، مما خلق الاسباب للاعتناء الكثير بالنصوص الشـفهية لديهم •

وتقول الباحثة ان بـين مختلف أنـواع الفولكلور الكردي ، يعتبر فولكلور الندبة النوع الوحيـد الذي ظـل غـير مدون حتى الان ، وان الاثنوگرافيين الذين عنوا بتدوين التقاليد المتبعة من لحظة الموت حتى ما بعد الدفن ، لم يشفعوا عملهم بنشر بعض نصوص كلمات الندبة •

وتشير الدكتورة رودينكو الى الصعوبات التي عانتها في اقناع بعض اليزيديين بأن يرددوا على مسامعها النصوص التي دونتها ، وتفسر امتناعهم عن ذلك بأنه نتيجة لبعض الطقوس الدينية التي تحصر الادلاء بأي شيء متعلق بالدين في رجاله وفي أوقات خاصة أيضا •

ثم تتحدث صاحبة البحث بالتفصيل عن الرسوم المتبعة في تشييع ودفن الموتى وندبهم ، كما تتحدث عن مضامين نصوص الندبة فيما اذا كان الميت رجلا او امرأة ، رئيسا او مواطنا بسيطا ، شابا او طاعنا في السن ، وفيما

اذا مات بين أهله أو في ديار الغربة او قتل مظلوما •• الخ • كما تتحدث كذلك عن الخصائص البلاغية لهذه النصوص ، وتشير الى كونها حافلة بالاستعارات ، وتخصص جانبا من البحث لدراسة التكنيك الفني في نصوص الندبة ، مع مقارنة اولية لها بانواع الكلام الكردي الموزون ، الاخرى •

ويلي هذه الدراسة الشاملة ، كما ذكرنا ، نبذة عن سيرة ٨ أشخاص استقت منهم الباحثة المعلومات والنصوص الغنائية ، و (٤٤) قطعة من غنائيات الندبة ، وهوامش اقتصرت المترجمة على تثبيت (٣٥) منها فقط رأتها ضرورية لا يمكن الاستغناء عنها •



# ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی

## بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی «زمان و زانستەکانی»

**١٢ـ پێشگری (بەر) :(*)**

لیژنە لە ئاکامی بە دوا گەڕان لەو وشانەی کە بە مۆرفێمی (بەر) دەست پێ دەکەن بە تایبەتی لە فەرهەنگەکانی ( مەهاباد ، خاڵ ، تۆفیق وەهبی ، قەناتی کوردۆ ) ئەو لیستەیەی پێك هێنا . وەك دیارە بەشی هەرەزۆری ئەو مۆرفێمانە دەوری پێشگریان نەدیوە بەڵکو بە زۆری وەك (ناو) یان ( ئاوەڵکار ) لە پێك هێنانی وشەکان بەشدار بوون. لەبەر ئەمە لیژنە بە پێویستی زانی وشەکان بە پێی سروشتی مۆرفێمەکان لە یەکتریان جودا بکاتەوە تاکو بتوانێت لەو بەشەیان بکۆڵێتەوە کە مۆرفێمی (بەر) تێیاندا پێشگرە : لە بەشی (ناوە) ، وەك :

**بەشی یەکەم : ئەو وشانەی کەمۆرفێمی (بەر) تێیاندا لە بەشی (ناوە) ، وەك :**

١ ــ بەر : بە واتای ( ثمر ، عانة ، جسد ، وجه ، بداية ، عرض ) دێ، بە نمونە :

أ ــ بەری دار .

ب ــ بەرتاشین .

ج ــ دە بزانە چ شیرینە کە روح بێتەوە بەر . [ بەر ــ واتا لەش ــ].

---

(*) ئەم بەشەی ئەمجارەی کاری لیژنەی زمان و زانستەکانی بەرهەمی ئەم زاتانەی خوارەوەیە :

١ـ مەسعود محەمەد : دەمڕاست .

٢ـ دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف : ئەندام .

٣ـ صادق بهاءالدین ئامێدی : ئەندام .

٤ـ نوری عەلی ئەمین : سکرتێر .

د ــ بەروپشتی قوماش •
هـ ــ بەرپان ، بەرتەسك ، بەردرێژ •
و ــ بەرودوای چیرۆك •

٢ ــ بەرانین ( اثمار ) •
٣ ــ بەراوینە ، بەرهاویشتن •
٤ ــ بەرەباب •
٥ ــ بەرە (بەرەی زین ــ بەرەی نیشتمانی ، بەرەباب ) •
٦ ــ بەرەبین •
٧ ــ بەرجۆت •
٨ ــ بەرەوان •
٩ ــ بەرەمەشکە •
١٠ــ بەروانکە •
١١ــ بەردار •
١٢ــ بەرەکەوا •
١٣ــ بەروبۆ ، بەرقۆبۆم •
١٤ــ بەری دەست •
١٥ــ بەرفڕێدان •
١٦ــ بەرخۆردار •
١٧ــ بەری پێ •
١٨ــ بەردڕکانە ( کورتکراوەی بەرگی دڕکانەیە ) •
١٩ــ بەرەتەشی •
٢٠ــ بەرەدۆشەك •
٢١ــ بەرەلێفە •

**بەشی دوەم : ئەو وشانەی کە مۆرفێمی ( بەر ) تێیاندا لـە بەشـــی ( ئـاوەڵکارە ) :**

١ ــ بەر : بە واتای ( أمام ــ واجهة ــ تحت ــ أســفل ــ طرف ــ قبل ) ، وەك : مۆرفێم یفید الطواعیة ، مثل : بەردەست ، بەرپرس ــ

أ ــ بەردەرگای ماڵ •

ب ــ بەڕۆژ ( بە واتای ــ بەرڕۆژ ) کە دەکاتە عەکسی نزار [ (نسار) ــ صادق بهاءالدین ] •

ج ــ بەربار •

د ــ بەرمۆسەلان •

هـ ــ ئەمبەر و ئەوبەر •

و ــ بەردەست ، بەرچاو ، بەرپێ •

ز ــ بەر لە تۆ هاتم • د بەرێدا ئەز هەڤاڵی تە بۆم • بـەرکوڵ • بەرماڵ ( لەکاری ــ ماڵین ــ ەوە )هاتوە •

ح ــ بەرپرس ، بەرتەك ، بەرێژ •

٢ ــ بەرانبەر ( بەرابەر ) •

٣ ــ بەراژۆ ( بەراوەژۆ ، بەرەواژ ، بەرەوڤاژی ) •

٤ ــ بەراشۆ •

٥ ــ بەراو ( بەراڤ ) •

٦ ــ بەرئاگر ( کۆڵۆوژ ) •

٧ ــ بەرانپێڵ ( صدریة طویلة ــ مەهاباد ) •

٨ ــ بەرئاوەڵە ( بەرئاوەڵ ) •

٩ ــ بەراهك ( بدایة ، مقدمة ) •

١٠ــ بەرایی •

١١ــ بەرپەرچ •
١٢ــ بەرتەك •
١٣ــ بەرەبەرە •
١٤ــ بەربین •
١٥ــ بەرەنــگار •
١٦ــ بەرەنیا ( اصلاح ) •
١٧ــ بەرەبەیان •
١٨ــ أ ــ بەرەوپیر •
ب ــ بەرەودوا •
ج ــ بەرەوڕۆ •
د ــ بەرەوپاش •
هـ ــ بەرەوپێش •
و ــ بەرەوژۆر •
ز ــ بەرەوژێر •
ح ــ بەرەوخوار •
ط ــ بەرەوسەر •
ی ــ بەرەوناو •
ك ــ بەرەودەر •
١٩ــ بەركار •
٢٠ــ بەربا •
٢١ــ بەرباخ •
٢٢ــ بەربانگ •
٢٣ــ بەربــان •

٢٤ ـ أ ـ بەربەرۆچکە •

ب ـ بەربەسێڵ •

٢٥ـ بەربەند •

٢٦ـ بەربچەڤ •

٢٧ـ بەربژاری •

٢٨ـ بەرهەڤ •

٢٩ـ بەربورە •

٣٠ـ بەربوك •

٣١ـ بەربوری •

٣٢ـ بەرکوڵ •

٣٣ـ بەرپرسیار •

٣٤ـ بەرپۆز •

٣٥ـ بەرگر •

٣٦ـ بەرتاشت •

٣٧ـ بەرچا ( بەرچایی ) •

٣٨ـ بەرچەپ •

٣٩ـ بەرچنە •

٤٠ـ بەرچەنە •

٤١ـ بەرچیچکە •

٤٢ـ بەرچێلە •

٤٣ـ بەرچێلك •

٤٤ـ بەرخۆر •

٤٥ـ بەردەم •

٤٦ــ بەرسنگ •

٤٧ــ بەردەفك •

٤٨ــ بەردڵ •

٤٩ــ بەردۆك •

٥٠ــ بەرشێو ( بەرشێو ) •

٥١ــ بەرنامە •

٥٢ــ بەرقلیان •

٥٣ــ بەرکانێ •

٥٤ــ بەرماڵ •

٥٥ــ بەرکەڵ •

٥٦ــ بەرکۆڵ •

٥٧ــ بەرهەڵبێنك •

٥٨ــ بەرگاز •

٥٩ــ بەرگوتن •

٦٠ــ بەرگیر •

٦١ــ بەرگین •

٦٢ــ بەرماوە ( بەرماك ــ بەرما ) •

٦٣ــ بەرمەمکانە •

٦٤ــ بەرمۆر •

٦٥ــ بەرناف •

٦٦ــ بەرەنــگار •

٦٧ــ بەرنوێژ •

٦٨ــ بەروەست •

٦٩ــ بەرۆ ، بەرین ، بەرێ ، بەری •

٧٠ــ بەرهەتاو ( بەرخۆر ) •

٧١ــ بەرهەست •

٧٢ــ بەرۆك •

٧٣ــ بەرانپێچ •

٧٤ــ بەراو •

٧٥ــ بەرچاوگە •

٧٦ــ بەرچیغ •

٧٧ــ بەردەرك •

٧٨ــ بەردۆخ •

٧٩ــ بەرەجەژنان •

٨٠ــ بەرەژان •

٨١ــ بەرهەنگڵ •

٨٢ــ بەرەڕەت •

٨٣ــ بەرەواژ •

٨٤ــ بەرگاگەل •

٨٥ــ بەرهەڵست •

٨٦ــ بەرهەتاو

٨٧ــ بەرکۆش •

٨٨ــ بەرکۆ •

٨٩ــ بەرنامچە •

٩٠ــ بەرسێڵ •

٩١ــ بەرسمێڵ •

٩٢ــ بەربۆرە •

٩٣ــ بەروار ( پێچدانەوە ) •

٩٤ــ بەرزین •

٩٥ــ بەرژێر •

٩٦ــ بەرپاش •

٩٧ــ بەرپێش •

٩٨ــ بەرپـــاییز •

٩٩ــ بەرپیریێ •

١٠٠ــ بەرزۆ •

١٠١ــ بەرگر ، بەرگری •

١٠٢ــ بەرگەڵ •

١٠٣ــ بەرپا •

١٠٤ــ بەراش ( بەرئاش )•

١٠٥ــ بەرایێ •

١٠٦ــ بەربا •

١٠٧ــ بەربار •

١٠٨ــ بەربازن •

١٠٩ــ بەربڕ •

١١٠ــ بەربن •

١١١ــ بەرپێڵ •

١١٢ــ بەرتل •

١١٣ــ بەردەستە •

١١٤ــ بەروەستا •

١١٥ــ بەرمەشکە •

۱۱٦ــ بەرابەر ( هێرش ) •
۱۱۷ــ بەرادە ( بەرەڵلا ) •
۱۱۸ــ بەربێژن •
۱۱۹ــ بەرپاڵ •
۱۲۰ــ بەرڤانی ( دفاع ) •
۱۲۱ــ بەرکەتی ( بەڕێز ــ بە واتای پێشکەوتو ) •
۱۲۲ــ بەرستو ( یەخە ) •

**بەشی سێیەم : ئەو وشانەی کە مۆرفێمی ( بەر ) تێیاندا ( پێشگر )ە :**

۱ ــ بەردان ( بەردانەوە ) •
۲ ــ بەرکەوتن •
۳ ــ بەربون ( بەربونەوە ) •
٤ ــ بەرەوە بون ( بەربونەوە ) •
٥ ــ بەرخستن •

دوای دەست بژارکردن لە لیستەی وشەکان تەنها ئــەم چەند کارانەی سەرەوە مانەوە کە لەگەڵ مۆرفێمی ( بەر )دا بە جۆری ( پێشگر ) هاتبن، وەك دەریش دەکەوێــت لە ڕاستیــدا لەو کارانە ( ۱ ــ دان ۲ ــ بــون ۳ ــ کەوتن ــ ٤ ــ خستن ) لەگەڵ پێشگری (بەر)دا دێن ، چونکە دیــارە ( بەردانەوە ) جۆرێکی کاری ( بەردان )ە ، هەروەهاش ( بەربونــەوە ) و ( بەرەوەبون ) لە کاری ( بەربون )ەوە هاتون •

بە سرنج ڕاگرتن ئەم ڕاستییانەی خوارەوە لە بارەی کارەکانــەوە بەدی دەکرێت :

١ ـــ ئاشکرایه لەم کارانەدا مۆرفێمی ( بەر ) پێشگرە نەك ئاوەڵکار ، بەڵگەش بۆ ئەمە :

أ ـــ لەم کارانەدا مۆرفێمی ( بەر ) هەمیشە لە گەردانـدا دەردەکەوێتەوە ، بە نموونە دەگوترێت : بەرم دا ، بەرم دەدەن ، بەرمان بدە ، بەریانخستم ، بەریان دەخەم ، بەربوێنەوە ، بەردەبینەوە ، بەربوبوێنەوە ، بەر ... کەچی لە وشەی وەك ( بەرکوڵ ، بەرهەڵست ، بەرکار ، بەرپرس ... ) مۆرفێمی ( بەر ) لە گەردانندا دەرناکەوێت،واتە ناگوترێت بەرمهەڵست ، بەریانپرسیم، بەریانکرد ...

ب ـــ وشەیێکی وەك ( بەربەست ) کە مۆرفێمی ( بەر )ی لە پێشەوە دێت ، لە گەردانیشدا مۆرفێمەکە دەرەکەوێتەوە، بە چشتێك مەعلوم دەکرێت کە ( پێشگر ) نییە و ( ئاوەڵکار )ە ، کە دەبینین مۆرفێمی ( بەر ) تێیدا دەگۆڕینەوە بە ( پێش ) • هەر وەك دەڵێین ( بەربەستن ) دەشتوانین بڵێین ( پێشبەستن) بەڵام لە کاری (بەرکەوتن)دا ناتوانین مۆرفێمی ( بەر ) بە ئاوەڵکار بگۆڕینەوە ،کەچی دەشێت بە پێشگری ( پێ ) بگۆڕینەوە و بڵێین : بەرکەوتن پێکەوتن •

٢ ـــ ئەم کارانە بە پێی سروشت و واتایان هەڵدەگرن لەگەڵ پێشگری تردا بێن ، وەك :

أ ـــ بەردان : تێبەردان ـــ تێك بەردان •

پێبەردان •

لێبەردان ــ لێکبەردان ( پێ‌لێـــکبەردان :
دەستم پێ لێک بەردان ) •

ب ــ بەربوون : تێبەربوون ــ تێکبەربوون •

پێبەربوون ــ پێوەبەربوون •

لێبەربوون ــ لێکبەربوون •

**تێبینی : دوو کاری ( بەرکەوتن ، بەرخستن ) پێشگری تر بە خۆیانەوە نـــاگرن •**

٣ ــ دووکاری ( بەربوون،بەردان ) پاشگری ( ەوە )یان پێوە دەلکێت و واتایان دەگۆڕێت ، وەک :

بەردان ( اطلاق ) بەردانەوە ( اسقاط ) •

بەربوون ( انطلاق ) بەربوونەوە ( سقوط ) •

هەروەها دەشێت پاشگری ( ەوە ) بۆ دوو بارەکردنەوەی ڕووت بـــە دوایاندا بێتەوە ، وەک :

بەردانەوە ( الاطلاق مرة أخرى ) •

بەربوونەوە ( الانطلاق مرة أخرى ) •

بەڵام پاشگری ( ەوە ) بە دوا کاری ( بەرکەوتن ، بەرخستن ) تەنها واتای دووبارەکردنەوە دەبەخشێت •

٤ ــ وەک دیارە ئەم کارانە بریتین لە دوو جووت هەر جووتەیان تێپەڕ و تێنەپەڕی یەکواتان ، وەک :

کاری ( بەردان ) تێپەڕی کاری ( بەربوون )ە •

کاری ( خستن ) تێپەڕی کاری ( کەوتن )ە •

**بەشی چوارەم : ئەو وشانەن کە بەر هیچ یەکێ لە سێ بەشەکەی تـر نەکەوتوە ، وشەکانیش ئەمانەن :**

١ ــ بەرامە ( بۆن و بەرامە ) •

٢ ــ بەرانگە ( کسول ) •

٣ ــ بەراورد •

٤ ــ بەرەڵڵا ( بەربەرەڵڵا ) •

٥ ــ بەرەم •

٦ ــ بەرەوە •

٧ ــ بەرتیل ( بەرتیر ) •

٨ ــبەرك ( گوللە ) •

٩ ــ بەرگە ( مقاومة ) •

١٠ــ بەرهەم •

١١ــ بەرهەنگ •

١٢ ــ بەرژەوەند ( بەرج ) •

١٣ ــ بەربەرە ( بە واتای بەفرماڵ ــ فەرهەنگی خاڵ ) •

١٤ــ بەربەش ( شتێکە لە مەعدەن دروستکراوە ــ فەرهەنگیخاڵ )•

١٥ــ بەردیل ( بەلەندیر ) •

١٦ــ بەرسف ( جواب ــ ف• خ )•

١٧ــ بەرگەش ( سینێ زۆر گەورە ــف• خ ) •

١٨ــ بەرڤانێ ( دفاع ــ ك ) •

١٩ــ بەرەوان ( ناوبژیکە ــ حەکەم ) •

لیژنە بە سرنج گرتن گەیشتە ئەم بیروڕایانەی خوارەوە :

١ ــ وشەی ( بەر ) لە :

أ ــ بەراورد •

ب ــ بەرەللا •

ج ــ بەرەوە •

دەوری ئاوەڵکاری بینیوە ،چونکە :

لە بارەی ( بەراورد )ەوە : ئاشکرایە ئەم وشەیە بریتیە لە ( بەر + اوردن )ی فارسی کە بە واتای ( هێنان ) دێت • لە بارەی ( بەرەڵلاوە ) : لە زۆر شوێنی کوردستاندا هەتا ئێستاش لەگەڵ ( بەرەللا )دا ، ( بەرهەڵدراو )یش بە کاردەهێنن ، لەمەوە دەردەکەوێت ( بەرەللا ) لە ( بەرهەڵدراو )ەوە هاتوە •

لە بارەی ( بەرەوە )وە : ئەم وشەیە بە واتای ( ژێرەوە ) بەکاردێت • بەم پێیە ئاشکرایە وشەی ( بەر ) لە ( بەراورد ) و ( بەرەللا )دا ئاوەڵکارە چونکە پێش ( کار ) کەوتوە • وشەی ( بەرەوە )ش وەکو ( سەرەوە ــ ژێرەوە ــ خوارەوە ) بریتیە لە ئاوەڵکاری ( بەر ) و زیادی ( ەوە ) کە تێکڕایان دەبن بە ( ئاوەڵکاری جێگا ) •

دەمێنێتەوە وشەی ( بەربەرەللا )وا دیارە ئەمیشیان بە واتای ( پێشبەرەللا ) دێت ، دیارە لەم حاڵەتەدا ( بەر ) ئاوەڵکارە •

ماموستا مسعود دەڵێت : وا دەزانم وشەی ( بەرامە ) لە ( بۆن و بەرامە )دا ، لە بنەڕەتدا لە (بەرآمد)ی فارسی بێتو دالەکەی سوابێت ، لەبەر ئەمە دەبێت بڵێین (بەر) لە وشەکەدا ئاوەڵکارە •

٢ ــ وشەی ( بەربەرە ) بە واتای ( بەفرماڵ ) لە ( بەفربەر )ەوە هاتوە و دەنگی ( ف ) سواوە • بەو پێیە وشەی یەکەمیان ( بەفر )ە ، لە بەشی ( ناو )ە ، وە ( بەر )ی دەوەمیشیان ڕەگی کاری ( بردن )ە •

٣ ــ دوو وشــەی ( بەربەش ) و ( بەرگەش ) هەرچەند پێكهاتنیان بــە لای لیژنەوە ڕوون نییە بەڵام وا پێدەچێت لە هیچیاندا وشەی ( بەر ) ئەوە نەبێت کە لێرەدا خەریکی باس لێکردنین ، چونکە واتای وشەکان لە هیچ ڕوویەکەوە ناکێشنەوە ســەر واتای ( کار ) و ئەو واتایانەی کــە لە وشــەی ( بەر )ی ئاوەڵکار و پێشگر ڕادەگەیەنن •

٤ ــوشەی ( بەرەم ) کە لە فەرهەنگی مەهابادا بە واتای ( مخزن ) هاتوە ، نە ڕواڵەتەکەی ئەوە هەڵدەگرێت بگوترێت لە دوو کەرت پێــك هاتوە ، نە واتاکەشی بە هیچ جۆرێ بەرەو واتای وشەی ( بەر )ی پێشگر و ئاوەڵکار دەڕوات ، لەبەر ئەوە کەرتی (بەر) لە وشــەی (بــەرەم)دا بــە بەشێکی بنجیێ وشەکە دەچێت ( دەکات ) •

٥ ــ وشەی ( بەرك ) • ئەم وشەیەش دەست نادات بۆ ئەوەی (بەر) تێیدا پێشگر یا ئاوەڵکار بێت ، وەیا بەو واتایانە هاتبێت کە لیژنە پێیانەوە خەریــکە • بە پێی واتاکــەی ( گوللە ) وا پێدەچێــت لە ( بەردك )ەوە هاتبێت و دالەکەی سوابێت ، ئەمەش دەستوورێکی بەرچــاوی ئاخاوتنــی کرمانجیێ سەرووە ، کەوا بە زۆریێ ( د )ی دوا ( ر )ی لاواز دەفرتێنن •

٦ ــ بەرانگە : ئەم وشەیە بەم شێوەیە (بەرانگە) نــەك ( بەرانگە ) وەك لە فەرهەنگی مەهابادا هــاتوە • لیژنە لە زمــانی کوردیدا هیــچ وشــەیێکی تری لە کێشی ئەم وشەیە بە بیردا نەهات کە لە کۆتاییێدا دەنگی ( هـ )ی وەستاو بە دوا دەنگێکی وەستاوەدا بێت تەنها لە هەندێ شێوەی کرمانجیێ سەرووەدا پاشگری ( گە ) دەبێتە ( گهـ ) وەك ( ســەیرانگهـ ) جا ئەگەر ئەمە وەك دەستوور بە سەر وشەی (بەرانگە)دا بێنــین دەیکــاتەوە ( بەرانگە ) کە واتاکەی ( ئاغەڵ ، پەچە )ی مەڕ و بزن دەبەخشــێت ، ئەو

ساش وشەکە پێوەندیی بە ( بەر )ەوە نامێنێت • لیژنە لە باری ئێستاکەی‌دا بیری بۆ ئەوە دەڕوا کە لە چاپ‌کردنی ئەم وشەیەدا هەڵەکرابێت •

٧ ــ بەرتیل : لەم وشەیەدا دوو تێبینیی دەکرێت :

أ ــ لە نێوان کورد و عەرەب وتورك وشەیەکی پەرەسەندوە•

ب ــ لە فەرهەنگی (المنجد) لاپەڕە ( ٣٤) بە وشەییێکی عەرەبیی دانراوە ، لەو ڕووەوە کە بە گەردان پیشانی داوە ( برطل ، تبرطل ، البرطیل ) ئیشارەتیشی تێدا نییە ، کە بێگانە بێت •

لیژنە لەو باوەڕەدایە کە ( بەر ) ئەم وشەیە پێوەندیی بەو ( بەر )ەوە نییە کە لیژنە خەریکی لێکۆڵینەوەیەتی •

٨ ــ بەرگە ( بەرگەگرتن ) :ئەم وشەیە لە کرمانجیی سەروو لە بەشی هەرەزۆری سۆران و بەشێکی کوردستانی ئێرانیش لە شێوەی ( بەر ) بەکاردێت و دەگوترێت (بەرناگرێت) واتا (بەرگەناگرێت)، لە کوردیی‌دا چەند وشەییێکی تریش هەیە کە لە شێوەی سادە و ناسادەی بە زیادکردنی پاشگری ( گە ) هەمان واتا دەبەخشێت ، وەك :

جێ    جێگە •
ڕێ    ڕێگە •
جۆ    جۆگە •

لەبەر ئەمە وا پێدەچێت وشەی ( بەر ) لە ( بەرگە )دا ئاوەڵکار بێت •

٩ ــ بەرهەم : ئەم وشەیە کە بە واتای ( انتاج )ی عەرەبیی دێت ، وا پێدەچێت کەرتی پێشەوەی ( بەر ) بە واتای ( ثمر ) بێت ، هەر چەند لە کوردیی‌دا وشەی تر نایەتە بەرچاو وەك ئەم وشەیە بە ( هەم )

هاتبێت ، دیسانەوە بیر بۆ ئەوە دەچێت لێرەدا ( بەر ) بە واتای ( ثمر ) بێت کە دەچێتە سەر بەشی ناو ٠

تێبینی : لە فارسیدا وشەی هەن بە ( هەم ) کۆتاییان دێت ، وەك : ( فەراهەم ) ٠

١٠ ــ بەرهەنگ : هەرچەند لەم وشەیەدا سروشتی ( بەر ) ڕوون نییە سەرهەنگ ، ئاهەنگ ، نەهەنگ ، سەهەنگ ٠٠٠) ٠ دیارە وشەی ئاخۆ ئاوەڵکارە یا ناوە یا بەشێکی بنجی وشەیە ٠ بەڵام لە ڕوی بنجی بوون و نەبوونەوە دەتوانرێت بگوترێت لەلاوە پێوەی نکاوە چونکە زۆر وشەی تر هەن وەك ئەمە کۆتاییان بە (هەنگ) دێت ، وەك ( فەرهەنگ ، سەرهەنگ ، ئاهەنگ ، نەهەنگ ، سەهەنگ ٠٠٠) ٠ دیارە وشەی ( بەرهەنگ )یش وەك ئەوان لە وشەی ( بەر + هەنگ ) پێك هاتوە ، دەمێنێتەوە ساغکردنەوەی واتای ( بەر )لە وشەی ( بەرهەنگ ) دا ، ئایا لە بەشی ناوە یا ئاوەڵکارە ، بۆ ئەم لایەنە لە پێشەوە لیژنە هەوڵی دا واتای ( هەنگ ) لێك بداتەوە تا بەو پێیە سروشتی ( بەر )یش ڕوون بکاتەوە ٠ فەرهەنگەکانی کوردی باسی وشەی ( هەنگ ) وەك پاشگری وشەکانی ( سەرهەنگ ، ئاهەنگ ، نەهەنگ ٠٠٠) یان نەکردوە ٠ لەبەر ئەمە لیژنە گەڕایەوە سەر فەرهەنگی فارسی ، لە برهانی قاطع لاپەڕە ١٢١٧ یازدە واتای جودا بۆ ئەم وشەیە دادەنێت ، واتایەکی موناسبی ( بەرهەنگ )ی کوردی بێت کە نەخۆشی سنگە ، واتای دەیەمە کە دەنوسێت ( ضرب و صدمە ، ئاسیب و ئازار باشد ) بەم جۆرە وشەی ( بەرهەنگ ) بە واتای ( بەرئێش )دێت لەمەوە زیهن بۆ ئەوە دەڕوات کە وا لێرەدا وشەی ( بەر ) ئەو واتایە ببەخشێت کە لە وشەی وەك ( بەرۆك ، بەروپشت ) دەفامرێتەوە،

کــه واته دەبێت بڵێین لە بەشی ( ناو )ە وەك ئەوەی کە مەبەست لە وشەکە ( سنگ و ئێش ) بێت •

١١ ــ بەرژەوەند : لە بەشێك لە ناوچەکانی سۆراندا وشەی ( بەرج ) بە واتای ( مناسب ، مقبول ) دێت ، وەك کــه بڵێیت ( ئــەگــەر نیوەی پارەکەشم بدەیتێ هەر بەرجە ) • لەوەوە وا پێدەچێت وشەی (بەرژەوەند) لە ( بەرجەوەند )ەوە هاتبێت ، جا ئەگەر ئەم لێکدانەوەیە دروست بێت وا ڕادەگەیەنێت کە لێرەدا وشەی ( بەرج )ە و پەیوەندیی بــە ( بەر )ەوە نییە کە لیژنە لێی دەکۆڵێتــەوە• گۆڕینی دەنگی (ج) بــە (ژ) لە زۆر وشــەی کوردییدا بەدیی دەکرێت ، وەك :

ئەلوجە ئەڵوژە

لاوجە لاوژە

١٢ ــ بەردیل : ئەم وشەیە لە کرمانجیی سەروودا ( بەلەندیر )ە ، وا پێدەچێت ئەم وشــەیە لە ئاکامی گۆڕان و سوانێکی بــە سەریدا هاتوە ، ئەم شێوەیەی وەرگرتبێت کە لە کرمانجیی خواروودا ئێستا بــە کاردێت • لەبەر ئەمە کەرتی ( بەر ) لە وشەی ( بەردیل )دا پەیوەندیی بەو ( بەر )ەوە نییە کە لیژنە لێی دەکۆڵێتەوە •

١٣ ــ بەرسف : لە بارەی ئەم وشــەیەوە یەك دوو تێبینیی هەن :

أ ــ لە ڕووی ئەوەوە کە ( بەرسف ) بە واتای ( وەرام ) بەرامبەر ( پرسیار ) ڕادەوەستێت ، وەك کە ( بەرپەرچ ) و ( بەرتەك ) بەرامبــەر ( پەڕچ ) و ( تەك ) ڕادەوەستن ، لە ڕواڵەتدا وشەی ( بەر ) وا پێدەچێت دەوری ئاوەڵکاری بینیبێت ، هەرچەند لە لیژنەش ڕوون نینە ئایا لــەم حاڵەدا وشەی ( سف ) لە کوێوە هاتوە و واتاکــەی چییە ؟ •

ب ـ لە فارسیدا ( بەرسف ) بە واتای ( پاسخ ) دێت کە دەکاتەوە ( وەرام ) وەك دیارە جۆری لەیەك چوَن لە نێوان هەردوَ وشەدا پەیدایە بەلاَم لیژنە ناتوانێت بڕیار بدات کە لە بنەڕەتدا ئەم دوَ وشەیە لە یەك وشەوە کەوتبێتنەوە •

لە کرمانجی سەروَدا وشەی ( سفی ) بە واتای (کەپەك ) دێت ، هەروەها وشەی ( سفك )یش بە واتای جۆرە ژوَرێکی بەرکراوەیە کە دەکەوێتە بەرامبەر ژوَرێکی عادەتییەوە •

لیژنە لە باری ئێستاکەیدا بەو لای ئەم تێبینیانەوە ناتوانێت بڕیاری بدات لە بارەی سروشت و واتای کەرتی ( بەر ) لە وشەی ( بەرسف )دا •

١٥ ـ بەرڤانی ( بەرەوانی ) : ئەم وشەیە بە پێی پێكهاتنی دەردەکەوێت کە بریتیە لە کەرتی ( بەر + وانی ) لە کرمانجی خوارووَدا ( بەرەوان ) کە ناوە مەعنەویەکەی دەبێتە ( بەرەوانی ) ، وشەکە بریتیە لە ( بەر + ە + وان ) • کەواتە ئاشکرایە ئەم وشەیە لە وشەی ( بەر ـ بە واتای پێش ) و پاشگری ( وان ، ڤان ، وانی ، ڤانی )پێك هاتوە • لەمەوە دەردەکەوێت وشەی ( بەر ) لێرەدا ناوی ئاوەڵکارە •

تێبینیەکی گرنگ :

لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەرکەوت کە وشەی ( بەر ) وەکو پێشگری کار تەنها لەگەڵ ئەم کارانەدا دێن :

١ ـ کاری ( دان ـ بەردان ) •

٢ ـ کاری ( کەوتن ـ بەرکەوتن ) •

٣ ـ کاری ( بوَن ـ بەربوَن ) •

٤ ـ کاری ( خستن ـ بەرخستن ) •

وەك سرنج دەری دەخات تەنها دوو کاری ( بەردان ) و ( بەربوون ) هەڵدەگرن پێشگری ( تێ ، پێ ، لێ ) قبوڵ بکەن ، وەك :

بەردان ( تێبەردان ، لێبەردان ، پێبەردان )
بەربوون ( تێبەربوون ، لێبەربوون ، پێبەربوون )

دوو کارەکەی تر ( بەرکەوتن ) و ( بەرخستن ) هیچ کامێ لەم پێشگرانە بە خۆیانەوە ناگرن •

لیژنە لەو باوەڕەدایە بەکارهێنانی ئەم دوو کارە ( بەرکەوتن ) و ( بەرخستن ) لە بەشی هەرە زۆری کوردستاندا لە شێوەی ( بەبەرکەوتن ) و ( بەبەرخستن ) دێن •

وا دیارە شێوە ئاخاوتنی سلێمانی (بە)ی پرێپۆزیشنی سواندوە و ماوەتەوە ( بەرکەوتن ) و ( بەرخستن ) ، لەمەوە دەشێت بگوترێت هەبوونی پرێپۆزیشن لە بەرایی پێشگرەکەدا بۆتە هۆی نەهاتنی پێشگری تر لەم دوو کارەدا •

سەرەڕای ئەمە سەرنج دەری‌دەخات پێشگری (پێ ، تێ ، لێ ) ناشێت بکەوێتە بەرایی هیچ وشەیێکی تر کە ( بەر )ی لە پێشەوە هاتبێت ، کە ئەمەش ڕاستییەکە ئەوە ئیسپات دەکات کەوا (بەر) هەر لەگەڵ ئەم کارانەدا بە پێشگر حیساب دەکرێت ، چونکە زوتر لیژنە باسی کردبوو • ئەم سێ پێشگرە ( پێ ، لێ ، تێ ) دەشێت بکەونە پێش پێشگری ترەوە •

**١٤ ــ پێشگری ( وە ــ ڤە )**

أ ــ پێشگری ( وە ) : لیژنە ئەم لیستەیەی پێك‌هێنا لەو وشانەی

که به کەرتی (وە)دەست پێ دەکەن،وشەکانیش له فەرهەنگە کوردییەکانەوە وەرگیراون :

١ ــ وەتۆزبۆنەوە ( خل‌بۆنەوە ــ فەرهەنگی خاڵ )

٢ ــ وەستاندن ( ســتاندنەوە ــ فەرهەنــگی خاڵ ، مەهاباد ، کوردۆ ) •

٣ ــ وەشاردن ( شاردنەوە ــ فەرهەنگی مەهاباد )

٤ ــوەگرتــن ( خمل ، خمــن ، تقدیــر ظن ، مقایســة ، فەرهەنگی‌مەهاباد ) •

جگە لەو چوار وشــەیەی فەرهەنگە کوردییەکان ، وشەی تریش دەبیسترێت لەوانەی بە پێشگری ( وە ) دەستپێ دەکەن ، لەمانەی بەبیری لیژنەدا دێت :

وەخواردن ( بەواتای ــ خواردنەوە )

وەکردن ( بەواتای ــ کردنەوە )

وەگرتن ( بەواتای ــ گرتنــەوە ) • ئەو واتایــەی لە فەرهەنگی مەهاباددا بۆ وشەی ( وەگرتن ) دیاری کرابۆ بە لای لیژنەوە نائاشــنا و نەبیستراوە • واتای ئەم وشەیە وەك لە نێوان خێڵەکانی سەر بە بڵباسەتیدا بەکار دێت بە واتای ( گرتنەوە ) دێت ، وەك بڵێیت ( تۆیەکەت بۆ هەڵدەم بیگرەوە ــ وەی گرە ) •

وەگەڕان ( بە واتای ــ گەڕانەوە )

وەگەڕێ ئاوێزانت بم

ژیکەڵێ دەست لە ملانت بم

وەکوژاندن ( بەواتای ــ کوژاندنەوە )

وەگوێزان ( بە واتای ــ گوێزانەوە )

تێبینی :

١ ــ له بارەی ( وەتوزبونەوە )وە ، وشەی ( وەتوز ) بــه روالەت ( وە )ی به ســەرەوەیە ، بەلام پێویستی بــه لێکولینەوە هەیە لــه روی پێشگربون و پێشگرنەبونیەوە •

وەك دەزانین کاتێك ( وە ) دەبێتە پێشــگر که له بەرایی کــارەوە بێت • ئایا لێرەدا ( توز ) پێوەندی بەکارەوە هەیە یان نەء ؟

له لاپەڕە (٢٩٠)ی بەرگی یەکەمی فەرهەنگی خال وشەی ( توزان ) به واتای ( خلیســکان ) هاتوە • که بێنین و نیشــانەی چاوگی لێ فڕێ بدەین دەمێنێتەوە رەگی کارەکه ئەویش ( توز )ە • لەمەوە دەردەکەوێت ( وەتوز ) بریتییه له پێشگری ( وە ) و رەگی ( توز ) • لــه واتاشــدا خلیســکان و خلبونەوە لە یەکتر نزیکن •

٢ ــ له بارەی ( وەســتاندن )ەوە : ئەم کــارە بریتییه له ( وە + ستاندن ) له روالەتدا پێکەلێکی کاری ( وەستاندن ) به واتای ( راگرتن )ە• بەلام له راستیدا دو کاری لەیەکتر جودان ، یەکەمیان له ــ کاری (ستاندن) و پێشگری ( وە ) [ به واتای ستاندنەوە ] پێك‌هاتوە • دوەمیشیان کاری ( وەستاندن )ە که لەوێدا ( وە ) بەشێکی بنجی وشەکەیە •

٣ ــ کارەکانی ( وەشاردن ــ شاردنەوە ، وەگوێزان ــ گوێزانەوە ، وەحەسان ــ حەسانەوە ، وەکوژاندن ــ کوژاندنەوە ) لەوانەن کارەکان بەبێ ( وە ــ ەوە ) پێشگر بێت یا پاشگر به تەنیا بەکار نایەت ، نەبیستراوە بگوترێت ( شاردن ، گوێزان ، حەسان ، کوژاندن ) • بــەو پێیە پێشــگر ــ پاشگرەکه دەوری کەرتێکی بنجی ئەو دو کاری بینیوە •

کارەکانی‌تر ( وەرگرتن ، وەخواردن ، وەکردن ، وەگەڕان ) بــه سادەییش واتایان هەیە ( خواردن ، کردن ، گرتن ، گەڕان ) •

٤ ــ ئەو کارانەی کە لە شێوەکانی کرمانجی خوارودا پێشگری (وە) وەردەگرن لە ڕێژەی ڕانەبوردو ( ئایندە )دا دەبێتەوە پاشگر ، وەك :

ئاوەکەم وەخوارد •

ئاوەکە وەخۆ •

ئاوەکەی دەخۆمەوە •

ب ــ پێشگری ( ڤە )

مامۆستا صادق بەهائەدین هەندێ لەو کارانەی کە بە پێشگری ( ڤە ) دەست پێ دەکەن کۆکردەوە ، لەگەڵ ئەو کارانەدا کە لە فەرهەنگی خاڵ و مەهاباد و قەناتی کوردۆدا هەبون ، کران بە لیستەیەك • ئەوا یەکە یەکە لێیان دەدوێین :

١ ــ ئەو کارانەی بە بێ پێشگری ( ڤە ) بەکارنایەن :

| | |
|---|---|
| ڤەهسان | ( دەمکێشان ، حەسانەوە ) • |
| ڤەپان | ( پێلەقەلێدان ) • |
| ڤەچڕین ( ڤەچیڕاندن ) | چەنەدان • |
| ڤەستوبون | تۆڕەبون • |
| ڤەپزلاندن | معارضة ، نزاع • |
| ڤەخومین ( ڤەخوماندن ) | ارتباك ، تشویش • |
| ڤەرملین | الاعیاء • |
| ڤەڤیران | لەتەنیشت یەکتر بەستنەوە • |
| ڤەرەوجکاندن | ڕوتاندنەوە • |
| ڤەلوڤرین ( ڤەلوڤراندن ) | کزوزانەوە |

| | |
|---|---|
| ڤەبڕین | بڕینەوەی سەوداو مامەڵە • |
| ڤەهینان | هۆنانەوە ، هۆنینەوە • |
| ڤەترسین | چاك بونەوە لە نەخۆشی • |
| ڤەتوسیان ( ڤەتوساندن ) | خۆشاردنەوە • |

٢ ـ ئەم کارانەی خوارەوە پێشگری ( ڤە )یان دەچێتە سەر و واتا بنجیەکەیان دەگۆڕێت ، وەك :

| | |
|---|---|
| بون ( کون ) | ڤەبون ( کرانەوە = انفتاح ) • |
| دان ( عطاء ) | ڤەدان (تەڵەنانەوە = نصب الکمین) |
| بریان ( قطع ) | ڤەبریان (لەناوچون = انقراض) • |
| جنقین ( خوف ) | ڤەجنقین ( راچڵەکین = ارتعاد ) • |
| چنین ( نسج ) | ڤەچنین ( چنینەوە = روف ، قطف ، التقاط ) • |
| دزین ( سرقة ) | ڤەدزین ( بە دزییەوە رۆیشت = سار خفیة ، تملص ) • |
| گەڕیان ( تجوال ) | ڤەگەڕیان ( گەڕایەوە = عودة ) • |
| گرتن ( قبض ) | ڤەگرتن ( عدوی ) • |
| گڤاشتن ( عصر ) | ڤەگڤاشتن ( عصر شدید ) • |
| هژیان ( اهتزاز ) | ڤەهژیان ( تأرجح ) • |
| هڕمتن ( توسیخ ) | ڤەهڕمتن ( خەوزڕاندن = ارق ، سهاد ) • |
| گوهاستن ( نقل ) | ڤەگوهاستن ( تزحزح ، انتقال قصیر ••• ) • |
| هەرفتن ( رۆخاندن=هدم ) | ڤەهەرفتن (هەڵوەشان = تفلش) • |

| | |
|---|---|
| هێلان ( ابقاء ) | ڤەهێلان ( استبقاء ) |
| ژەنین ( مخض ) | ڤەژەنین ( ژان و پتدانی برین ) ٠ |
| ژین ( حیاة ) | ڤەژین ( انبعاث ) ٠ |
| کوژتن ( قتل ) | ڤەکوژتن ( ذبح ) ٠ |
| کوتان ــ قوتان ( ضرب ) | ڤەکوتان ــ ڤەقوتان ( دق السطح لسد خرومه ) ٠ |
| کولان ــ کولین (حفر الارض) | ڤەکولان ــ ڤەکولین ( اثارة الشیء ، بحث الشیء ) ٠ |
| مان ( بقاء ) | ڤەمان ( التأخیر ) ٠ |
| مالێن ( مسح ) | ڤەمالتین ( شیلان = دلك ) ٠ |
| ڕەڤین ( هروب ) | ڤەڕەڤین ( تفرق ) ٠ |
| روتن ( روتکردنەوە ) | ڤەڕوتن ( روتانەوە ) ٠ |
| خارن ــ خوارن ( خواردن ) | ڤەخارن ــ ڤەخوارن ( خواردنەوە )٠ |
| ئالاندن ( تێئالاندن ) | ڤەئالاندن ( هەڵکردن ) ٠ |
| بەستن ( ربط ) | ڤەبەستن ( بەستنەوە = عقل الدابة ، ربط الجرح ) ٠ |
| چڕین ( دەنگەدەنگ = ضوضاء ) ٠ | ڤەچڕین ( چەنەدان ) ٠ |
| کەتن ( کەوتن ) | ڤەکەتن ( پاڵکەوتن ) ٠ |
| قەتاندن ( قرتاندن ) | ڤەقەتاندن ( جیابونەوە ) ٠ |
| لەزین ( خێراکردن ) | ڤەلەزین ( پاڵکەوتن ، پاڵخستن )٠ |
| مالشتن ( گسكدان = كنس ) | ڤەمالشتن ( پاككردنەوە = تنظیف )٠ |
| نیشتن ( ترسب ) | ڤەنیشتن ( دانیشتن = جلوس ) ٠ |

| | |
|---|---|
| پێچان ( پێچانەوەی شت ) | ڤەپێچان ( پێچانەوە ، کردنەوە ) • |
| رستن ( غزل ) | ڤەڕستن ( حبك ) • |
| ڕەشاندن ( ئاوڕشێن کردن ) | ڤەڕەشاندن ( ڕشاندنەوە ) • |
| ڕێستن ( غَزَل ) | ڤەڕێستن (طیران) «کوردۆیێف» • |
| ڕێتن ( ڕێشتن ، ڕشتن = سـکب ) • | ڤەڕێتن ( تێ کردن ) • |
| وەشاندن ( لێدان ) | ڤەوەشاندن (فڕێدان) «کوردۆیێف» |

٣ ــ ئەو وشانەی ( ڤە )یان تێدا بەرانبەر بە واتای ( ەوە ) دێت لـە کرمانجیێ خوارۆدا :

| | |
|---|---|
| ڤەچنین | چنینەوە ( رَوَفَ ) • |
| ڤەگەڕیان | گەڕانەوە • |
| ڤەگرتن | گرتنەوە • |
| ڤەگۆهاستن | گواستنەوە • |
| ڤەهێنان | هێنانەوە • |
| ڤەژین | ژیانەوە • |
| ڤەکۆڵین | کۆڵینەوە • |
| ڤەمان | مانەوە • |
| ڤەنان | نانەوە • |
| ڤەخوارن | خواردنەوە • |
| ڤەخستن | خستنەوە • |
| ڤەخوێندن | خوێندنەوە • |
| ڤەبەستن | بەستنەوە • |
| ڤەگوهێڕین | گۆڕینەوە • |

ڤەهاتن — هاتنەوە .
ڤەکەتن — کەوتنەوە .
ڤەکشاندن — کشاندنەوە .
ڤەپێچان — پێچانەوە .
ڤەکرن — کردنەوە .

٤ ــ پێشگری (ڤە) لەگەڵ پێشگری ( پێ ، تێ ، ژێ ، لێ )دا :

أ ــ لەگەڵ پێشگری ( پێ ) :

پێڤەبوٙن .
پێڤەکرن .
پێڤەدان .
پێڤەسوٙتن .
پێڤەچوٙن .
پێڤەبرن .
پێڤەخوێندن .
پێڤەهێنان .
پێڤشکاندن .
پێڤەمان .
پێڤەهێلان .
پێڤەهێنان .
پێڤەکوشتن .

ب ــ لەگەڵ پێشگری ( تێ ) :

تێڤەبوٙن .
تێڤەچوٙن .

تێڤەبرن •

تێڤەکرن •

تێڤەدان •

تێڤەژین •

تێڤەمان •

تێڤەگەڕیان •

تێڤەمرن •

ج ـ لەگەڵ پێشگری (ژێ) :

ژێڤەبوَن •

ژێڤەکرن •

ژێڤەخوارن •

ژێڤەدزین •

ژێڤەڕەڤین •

ژێـــڤەکشین •

د ـ لەگەڵ پێشگری (لێ) :

لێڤەبوَن •

لێڤەچوَن •

**١٥ ـ پێشگری ( هاو ـ هاف )**

لیژنە لە فەرهەنگە کوردییەکاندا ئەم وشانەی کە بە پێشگری (هـــاو) دەستی پێ‌کراوە کۆکردەوە • وەك لای خوارەوە :

١ ـ هاواڵ (هاوەڵ) •

٢ ـ هاوئاواز •

٣ ـ هاوئەنجام •
٤ ـ هاوبەزا [ هاوتەمەن ـ فەرهەنگی مەهاباد ] •
٥ ـ هاوتەمەن •
٦ ـ هاوبەش •
٧ ـ هاوبڕگە •
٨ ـ هاوپـا •
٩ ـ هاوپەیمان •
١٠ـ هاوپشت •
١١ـ هاوتا •
١٢ـ هاوتەرازوو •
١٣ـ هاوتەقا (هاوتا) •
١٤ـ هاوتەك (ڕەفیق ـ فەرهەنگی مەهاباد) •
١٥ـ هاوتیرە •
١٦ـ هاوجفت (هاوجووت) •
١٧ـ هاوجۆر •
١٨ـ هاوجێ •
١٩ـ هاوچاخ •
٢٠ـ هاوچاو (ڕەقیب) •
٢١ـ هاوچەشن •
٢٢ـ هاوخوو •
٢٣ـ هاودەرد •
٢٤ـ هاوسەر •
٢٥ـ هاودەم •

٢٦ـ هاوڕێ ( هاوڕا ) •
٢٧ـ هاوڕاز
٢٨ـ هاوڕێك (الموازي) •
٢٩ـ هاوزاوا (عديل) •
٣٠ـ هاوزە (هاوزاوا) : هاوتەمەن •
٣١ـ هاوزەمان•
٣٢ـ هاوزێ ( زميل العمر ) •
٣٣ـ هاوساڵ •
٣٤ـ هاوسەنگ •
٣٥ـ هاوسەرین ( هاوسەنیر ) •
٣٦ـ هاوئەستون ( المتعامد ) •
٣٧ـ هاوسوێند •
٣٨ـ هاوسێ •
٣٩ـ هاوشار •
٤٠ـ هاوشان •
٤١ـ هاوکار •
٤٢ـ هاوکاسە •
٤٣ـ هاوخوێن •
٤٤ـ هاوکێش •
٤٥ـ هاوگەڕ •
٤٦ـ هاوگیـــان •
٤٧ـ هاومەینەت •
٤٨ـ هاوماڵ •
٤٩ـ هاوناو ( سميّ ) •

٥٠ـ هاونشین .
٥١ـ هاونیشتمان .
٥٢ـ هاوتێڵە (هاوسەر).
٥٣ـ هاوواتـا .
٥٤ـ هاوهێز .
٥٥ـ هاوبیر .
٥٦ـ هاوچڕە (ئەوەی گۆرانیی دەسەبێنەوە) .
٥٧ـ هاوخۆراك .
٥٨ـ هاودەنگ .
٥٩ـ هاوشیر .
٦٠ـ هاوکەوشەن (هاوسنوور) .
٦١ـ هاوبەند (بەیەکەوە بەستراو) .
٦٢ـ هاوجڵەو .
٦٣ـ هاوچەك .
٦٤ـ هاوژین .
٦٥ـ هاوخەم .
٦٦ـ هاوچەق (مشارکون في المرکز الواحد) .
٦٧ـ هاوباوەڕ .
٦٨ـ هاودەس .
٦٩ـ هاونۆرە .
٧٠ـ هاوپایە .
٧١ـ هاوپرسەکیی (محادثة) .
٧٢ـ هاوپیشە .

٧٣ـ هاوقەد •

٧٤ـ هاوسەدە (معاصر) •

٧٥ـ هاوسنوور •

٧٦ـ هاوخەف •

٧٧ـ هاوزێد (مواطن) •

٧٨ـ هاڤـاڵ •

٧٩ـ هاڤیژ (حسود ، بخیل) •

٨٠ـ هاڤیشین •

٨١ـ هاڤنیشتمان •

٨٢ـ هاڤسەر •

لیژنە لیستەیەکی لەو وشانە لە فەرهەنگی کوردیی ـ ڕووسیی قەنـاتی کوردۆ (ل ٣١٥ ـ ٣١٨)دا دەرهێنا کە بە پێشگری (هەڤ) دەستپێدەکەن• ئەم پێشگرە لە کرمانجیی سەرووا دەکەوێتە بەرانبەر (هـاو) لە کرمـانجیی خوارووا • ئەوەش لیستەکەیە :

هەڤال •

هەڤالبەند (ئەندام) معاصر ، حلیف •

هەڤالکار (شەریك) •

هەڤالکراس •

هەڤاف : ئنسانێکی لەسەرخۆ •

هەڤبەند (تێك ئالاو) •

هەڤبەر وەکی یەك •

هەڤبەش •

هەڤبۆن ڕێككەوتن •
هەڤچاخ معاصر •
هەڤچۆن (شەڕ) مجادلة •
هەڤدا ئالۆز •
هەڤدەم معاصر •
هەڤدەنگ •
هەڤدەرد •
هەڤدین ١ـ لقاء ، ٢ـ یەكدینێ •
هەڤدوست دۆستی یەكتر •
هەڤدو هاوڕێ •
هەڤدوتی الحب المتبادل •
هەڤدو دو الحب المتبادل •
هەڤگرتن یەكیتێ •
هەڤەدودانی ڕێك ، تەخت •
هەڤگەهاندن یەكگرتن ، نزیكبونەوە •
هەڤهاتن كۆمبونەوە ، لەیەك نزیك بونەوە •
هەڤخستن شەڕكردن ، جەنگان ، تێكەڵبون •
هەڤخوەرن یەكتر خواردن •
هەڤژیژین (هەڤژین) پێكەوە ژیان •
هەڤكار هاوكار •
هەڤكەتن بەرانبەری یەك بون ، لە یەكدان •
هەڤكرن یەكبون ، یەكگرتن •
هەڤكوشتن یەكتر كوشتن •

هەڤناستین        یەکتر ناسێن •

هەڤناڤ        یەکناوی •

هەڤپەیمان        هاوپەیمان •

هەڤپێچان        پێچانەوە ، لولدان •

هەڤپیشە        ( زميل في العمل ) •

هەڤپشتی        پشت گرتن •

هەڤڕا        پێکرا ، پێکەوە •

هەڤڕەنگ        هاوڕەنگ •

هەڤڕێ        هاوڕێ •

هەڤڕو        ڕوو لەیەك •

هەڤسەر        هاوسەر •

هەڤسو        لەیەکدان •

هەڤشین        هاوماتەم •

هەڤتا        هاوتا •

هەو        کۆتایی ، هەڤ ، تەنیا •

مامۆستا تۆفیق وەهبی لە لاپەڕە (٥٩)ی فەرهەنگەکەیدا لە بارەی پێشگری (هاو)ەوە دەڵێت : (پێشگرە بە واتای
Etc, Con, Co Equal, together
دێت ) •

مامۆستا خاڵ لە لاپەڕە (٢٩٤ ــ ٢٩٥)ی فەرهەنگەکەیدا لە بارەی پێشگری (هاو)ەوە دەڵێت : وتەی (هاو) بە واتای (هام) دێت و لە مەعنای

(هام)یشدا دەڵێت وتەیەکە بۆ هاودەمی و هاوکاری دوو گیانداری بەکار دێنرێ •

ماموّستا گیوی موکریانی لە لاپەڕە (٦٦١–٦٦٢)ی فەرهەنگی مەهابادا دەڵێت : وتەی (هاو) بە واتای (هەم) دێت ، (هەم)یش وەها تەعریف دەکات : «مقطع يفيد المشاركة ويتقدم على الاسماء ، مثل : هاوکار ، هاوبەش »•

لە دوای ئەمە لیژنە هاتە سەر لێکۆڵینەوەی خۆی دەربارەی پێشگری (هاو) • وەك بە وردبونەوە لە وشەی لیستەکان دەردەکەوێت :

١– ئەم پێشگرە وشەی سەر بە (ناو) دروست دەکات ، واتا نابێتە کەرتی کار ، وەك (هەڵ ، دا ، ڕۆ ، پێ •••)•

٢– لە وشەی سەر بە ناویش (ئاوەڵناو) دروست دەکات •

٣– ناوناوەیەك بە پێی وشەکانی لیستەی فەرهەنگی قەناتی کوردۆ لەگەڵ چاوگدا هاتوە ، وەك (هەڤگەهاندن ، هەڤخستن ، هەڤهاتن) • بەڵام لە شێوەی کرمانجی خوارودا هەر لەگەڵ (هاوژین)دا هاتوە •

٤– لە شێوەی کرمانجی خوارودا تەنها لەو حاڵەتانەدا چاوگ دروست دەکات کە وا کارەکە بە هۆی (بون) یا (کردن)ەوە پەیدا بوبێت ، وەك :

هاوبەشی‌کردن ، هاوباوەڕبون •

٥– ئەم پێشگرە دەچێتە سەر ناوی گوزارە (مەعنەوی) ، وەك :

هاوواتا •
هاوبیر •
هاودەرد •
هاوپەیمان •

٦ــ ئەم پێشگرە دەچێتە سەر ناوی ماددی ، وەك :

هاوولات •

هاوشیر •

هاوسەر •

هاوڕێ •

٧ــ ئەم پێشگرە دەچێتە سەر ڕەگی کار ، وەك :

هاوکێش •

هاوبەند (لە فارسییەوە هاتوە) •

هاوخەف •

هاوگەڕ •

٨ــ ئەم پێشگرە دەچێتە سەر ناوی چاوگ ، وەك :

هاوخۆراك •

هاوکار •

٩ــ ئەم پێشگرە (هاو) چەند ڕواڵەتێکی تری هەیە :

أ ــهام ، وەك ( هامخەو ، هامدەم ٠٠٠) •

ب ــ هەم ، وەك (هەمتا ، هەمشاری ، هەمڕا ، هەمپا ٠٠٠) •

ج ــ هەو ، وەك (هەوگیان ، هەوشاری ــ فەرهەنگی مەهاباد) •

د ــ هاڤ ، وەك (هاڤسەر ، هاڤنیشتمان ، هاڤنشین ــ کوردۆییڤ)•

١٠ــ ئەم پێشگرە وەك لەو وشانە دەردەکەوێت بۆ یەکچوون کردن و لە یەکتر نزیك خستنەوە و بەشدارکردنی پتر لە لایەنێك لە خصلەتێکــدا بەکار دێت ، واتە لە بنەڕەتدا پێشگرەکە سروشتی (یەکبوون)ی تێدایــە ، بەڵام بە پێی واتای ئەو وشەیەی دەچێتە سەری شێوەی (یەکبوون)ەکە دیــار دەدات ، بە نموونــە :

أ ــ هاوڕێ •
هاوباوەڕ •
هاوتەمەن •

ئەمانە (یەكبوون)ی ڕێگە و باوەڕ و تەمەن لە نێوان دوو کەس یان پتر لە دوو کەس نیشان دەدەن •

ب ــ هاوئاواز •
هاوڕەنگ •
هاوسوێند •
هاوهێز •
هاوچەك •

ئەمانە (یەك چوون)ی ئاواز و ڕەنگ و سوێند و هێز و چەکیان تێدایە•

ج ــ هاوسەر •
هاودەنگ •
هاوسێ •

ئەمانە (لە یەکتر نزیك)ی دوو سەر و دوو دەنگ و دوو سایە وەیا پتــر دەگەیــەنن •

د ــ هاوچڕە •
هاوکاریی •

ئەمانە (هاریکاریی) لە چڕین و لە کاردا دەگەیەنن •

وشەکانی تریش بە دەوری ئەو واتایانەوە واتــای لەوان نزیــکەوە دەخولێنەوە ، مامۆستا وەهبیش لە فەرهەنگەکەیدا هەر بۆ ئەو واتایانە چوە•

١١ــ وشەی (هاوەڵ ، هەواڵ ، هەڤاڵ) لە پێشگری (هاو ــ هەڤ +

اڵ) پێك هاتوه • وشەی (اڵ) لە کرمانجیێ سەرۆدا بە واتای ( لا = طرف) دێت • بەو پێیە واتای دەبێتە هاولا (هاوطرف) •

**١٦ ــ پێشگری ( بە )**

نوسەران بەم شێوەیە باسی پێشگری (بە) دەکەن •

١ــ مامۆستا خاڵ لە فەرهەنگەکەیدا لاپەڕە (١٣٩) لە شێوەی دەیەمینی بەکارهێنانی (بە) گوتویەتی : (اسم دەکات بە صفة) بۆ ئەوەی نـاوی پێشگری لێ بنێ •

٢ــ د• ئەوڕەحمانی حاجیێ مارف لە لاپەڕە (٦٥)ی کتێبی «وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا» دەڵێت : پێشگری (بە) دەچێتە سەر (ناو) و دەیکاتە ئاوەڵناو ، لە لاپەرە (٨٢)شدا دەڵێت ئاوەڵکاریش سازدەکات ، وەك : بەگوڕ ، بەکوڵ ، بەتەنیا •••

٣ــ مامۆستا تۆفیق وەهبیێ لە لاپەڕە (٨ ــ ٩)ی فەرهەنگەکەیدا باسی (بە) بە درێژیێ دەکات و هەمۆ جۆرە بەکارهێنانێکی شەرح دەدات ، ئەنجا ئەوەی پەیوەندیێ بە باسی لیژنەوەیە ، لە لاپەڕە (٩)دا لە شێوەی شەشەمی بەکارهێنانەکاندا ئەم وشەیەی بە (پێشگر) دانـاوە و نـمونەی زۆری بـۆ هێناوەتەوە ، وەك : بەئاگا ، بەجەرگ ، بەکەڵك ، بەڕق ، بەڕێوجێ ••• وە دەشڵێت ئاوەڵناو دروست دەکات •

٤ــ نوری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (١٢)ی ڕێزمانەکەیدا چاپی ١٩٦٠ بە ئامرازی پەیوەندیێ دادەنێت و دەڵێت ئاوەڵناوی پیێ لە ناو دروست دەکرێت، وەك : بەهێز ، بەجەرگ ، بەگوڕ ••• هەروەها لە لاپەڕە (١٩٨)یشدا بـۆ دە مەبەست بەکاری هێناوە •

٥ــ کەریمی ئەیوبیێ و ئی• ئا• سمیرنۆڤـا لە لاپـەڕە (٤١)ی کتێبی

«دیالێکتی کوردیی موکریی»دا دەڵێن :

پێشگری (بە) بە ناوەوە دەلکێ و ئاوەڵناوی لێ پێكدێنێ ، وەك :

بەپێز •
بەدەست •
بەئاکام •

لیژنە هاتە سەر لێکدانەوەی خۆی بەم شێوەیەی خوارەوە :

ئەم پێشگرە (بە) لە بنەڕەتدا هەمان پریپۆزیشنە کە لەمەوبەر لیژنە و نووسەرانی تریش لێی دواون ، بەڵام لە حاڵەتی پریپۆزیشنیشدا وشەکە لە نێو ڕستەدا دەور دەبینێت ، کاتێ کە بۆ بە پێشگر لەگەڵ وشەی تردا دەور دەبینێت و وشەیەکی تازە پێك دێنێت •

بە سەرنج گرتن ئەم ڕاستییانەی خوارەوە دەردەکەوێت :

١ـ بە زۆریی لەگەڵ «ناو»دا دێت و «ئاوەڵناو» دروست دەکات ، وەك :

بەجەرگ •
بەهێز •
بەگوڕ •
بەدڵ •
بەچنگ •

وەك لە وشەکانەوە دەردەکەوێت دەچێتە سەر ناوی ماددیی و مەعنەویی و لە هەردوو بارەکەدا هەر ئاوەڵناو دروست دەکات •

٢ـ لەگەڵ ناوی مەعنەویی بنجی و دروستکراودا لە ڕستەدا دەبێتە ئاوەڵکار ، وەك :

بەخۆشی بردمانە سەر ٠
بەپیاوەتی پارەکەی دامێ ٠
بە برایی پێت دەڵێم ٠
بەگوڕ هاتە ژوورەوە ٠
بەترس و لەرز چوو بۆ سەفەر ٠

تێبینی : ئیستیسنایەك لەم دەستوورەدا هەیە ، ئەویش ئەوەیــە کە وا لەگەڵ ناوی نەتەوە (کە ناوی ماددییە نەك مەعنەوی) دێت و پاشگری (ی) نیسبەتی بەدواوەیە و ئاوەڵکار دروست دەکات ، وەك :

بەکوردی دەژیم ، بەکوردی دەمرم ٠

٣ـ پێشگری (بە) دەچێتە سەر ئەو وشە لێکدراوانەی کە ئەغڵەب بە پاشگری (کێ) کۆتاییان دێت و لە ڕستەدا دەبنە ئاوەڵکار ، وەك :

بارام قسەکەی بە دەمەلاسکێ گێڕایەوە ٠
بەسکەخشکێ پارێزم بردێ ٠
بەهەناسەبڕکێ سەرکەوتم ٠
بەسەرەتاتکێ بێزاری کردن ٠

وەهاش دەبێت تاکە پاشگری (ێ) ئەو جۆرە ئاوەڵــکارە دروســت دەبێت ، وەك :

بەدڵەلەرزێ نانەکەم خوارد ٠
بەلنگەفڕتێ پەرداخەکەی شکاند ٠

هەروەها شێوەی تری ئاوەڵناوی نسادە هەیە بە هــۆی پێشــگری (بە)وە پەیدا دەبێت ، وەك :

بەهەڵەداوان ٠

بەگیزەگیز •
بەنەڕەهۆڕ •

٤ـ لەگەڵ پاشکۆی (ەوە) ئاوەڵکار دروست دەکات ، وەك :
بەخۆشییەوە پێی گوتم •
نانەکەم بەدانیشتنەوە خوارد •
بەسەرپێیانەوە چایەکەی هەڵقوڕاند •

٥ـ وشەی (بەسەرهات) کە بە پێی واتاکەی لە بەشی ناوی مەعنەوییە و لە جۆری ناوی لێکدراویشە ، تاکە وشەیەکە بە بیری ئەندامانی لیژنەدا هاتبێت ، پێشگری (بە)ی بەسەرەوە بێت و کاری تێدا بێت • بەو پێیە لێرەدا پێشگری (بە) جۆرێك ناوی لێکدراوی تایبەتی دروستکردوە کە وا بە زاهیر وێنەی تری نەبێت • ئەنجا ئەگەر وشەی تری وەك ئەمە دۆزرایەوە پتر پاڵپشتی ئەم قابلیەتەی (بە) دەکات •

لیژنە چەند فەرهەنگێکی کوردی بەسەرکردەوە ، لەوانیشدا جگە لە وشەی (بەسەرهات) هی‌تری نەدۆزیەوە •

٦ـ ئەم پێشگرە (بە) لە پێکهێنانی کاری لێکدراودا بەشداری دەکات ، وەك :
بەخێوکردن •
بەسەرگرتنەوە •
بەسەرچوون •
بەڕێوەبردن •
بەڕێ‌کردن •
بەیەك‌گرتن •
بەسەرداچوونەوە •

تێبینیی : لە کرمانجیی سەروودا لە بری پێشگری (بە) پێشگری ( ب ــ Bi ) بەکاردێت ، وەك :

بسەرهاتن (بەسەرهاتن) •
بجەرگ ( بەجەرگ ) •
بناڤ ( بەناو ) •

٧ــ وەك لە واتای ئەو وشانەی (بە)یان پێوەیە ، دەردەکەوێت ، دەوری (بە) لە وشەکاندا پێكهێنانی هەبوون و بەیەکەوە هاتن و زۆڵیی بوون و بە تێکڕایی لایەنی ایجابی وشەکانە ، بە پێچەوانەی دەوری پێشگری (بێ) لە پێكهێنانی وشەدا کە هەر ئێستا لیژنە لێی دەکۆڵێتەوە •

## ١٧ ــ پێشگری ( بێ )

نوسەرانی کورد بەم شێوەیە لە پێشگری (بێ) دەدوێن :

١ ــ مامۆستا تۆفیق وەهبیی لە فەرهەنگەکەیدا ، لاپەڕە (١٤) لە شێوەی سێیەمی وشەی (بێ) بە پێشگر داناوە بە واتای
( um - ' in - ' devoidos )
دەشڵێ لەگەڵ ناودا دێت و ئاوەڵناو دروست دەکات •

٢ ــ د• ئەوڕەحمانی حاجیی مارف لە کتێبی « وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا دەڵێت : پێشگری ( بێ ) دەچێتە سەر ( ناو ) و ( ئاوەڵناو )ی لێ دروست دەبێت ، وەك :

بێهۆش •
بێکار •

٣ ــ كەریمی ئەیوبیی و ئی. ئاه سمــیرنۆڤا لە لاپــەڕە (٤٠)ی كتێبی «دیالێكتی كوردیی موكریی»دا دەڵێن : پێشــگری ( بــێ ) بــە نــاوەوە دەلكێت و ( ئاوەڵناو )ی بە واتای نەفی لێ دروست دەكات ، وەك :

بێشوێن •

بێبن •

بێخەیاڵ •

بێهێز •

بیکەس •

لیژنە هاتە سەر لێكۆڵینەوەی ئەم پێشگرە :

ئەم پێشگرە ( بێ ) لە بنەڕەتدا هەمــان پرپیۆزیشنە كە لەمــەوبەر لیژنە و نوسـەرانی تریش لێی دواون • بەڵام لە حاڵەتی پرپیۆزیشـندا ئەم پێشگرە ( بێ ) لــە بنەڕەتــدا هەمان پرپیۆزیشنە كە لەمەوبــەر وشەكە لە ناو ڕستەدا دەور دەبینێت ، كاتێ كە بۆ بە پێشگر لەگەڵ وشەی تردا دەور دەبینێت و وشەیەكی تازە پێك دێنێت :

بە سەرنج گرتن ئەم ڕاستییانەی خوارەوە دەردەكەوێت :

١ ــ بە زۆریی لەگەڵ ( ناو )دا دێت و ( ئاوەڵناو ) دروست دەكات ، وەك :

بێهێز •

بێپارە •

بێكەڵك •

بێبار •

بێباك •

بێكەس •

٢ ــ لەگەڵ ناوی مەعنەویی بنجیی ( ڕەسەن ) و دروسـت کراودا دەبێتە ئاوەڵکار ، وەك :

أ ــ بێترس و لەرز چوومە ژووریٚ •
ب ــ بێپرس دەستم دایە کتێبەکە •
ج ــ بەبێهێزیی هیچ کاریٚ ناکرێت •
د ــ بە بێقەدریی بە سەریا ڕامەبوورن •••

٣ ــ لە ڕووی واتاوە ( بێ ) پێچەوانەی ( بە )یە ، هـەم لە دروسـت کردنی وشە و هەم لە نێو ڕستەدا ، وەك :

بەیارە بێیارە •
بەهێز بێهێز •
بەکار بێکار •

٤ ــ هەرچەندە ( بە ) و ( بێ ) پێچەوانەی یەکترن ، بەڵام مەرج نییە لە هەموو جارێك ئەو وشەیەی کە یەکێکیان بە خۆیەوە دەگرێت ، ئـەوی تریشیان بە خۆیەوە بگرێت ، وەك :

( بێخێر ) نابێتە ( بەخێر )
( بێباك ) کە بووتە وشەیەکی سەربەخۆ ، شێوەی ( بەباك )ی نییە وەك وشەیەکی سەربەخۆ ( بەڕێکردن ) نابێتە (بێڕێکردن) •
( بەخێوکردن ) نابێتە ( بێخێوکردن ) •

٥ ــ وا دەبێت هەندێك وشە لە کوردیدا بە ( بێ ) دەست پێ دەکات، بەڵام بەشێکی بنجیی وشەکەیە نەك ( بێ )ی پێشگر ، وەیا پریپۆزیشن ، وەك :

بێژنگ •

بێشـــکه .

بێدرخه و بێلَنده [1] .

بێلاّوه ( ناوی گوندێکه له ناوچەی رانیه ) .

بێژان ( بەواتای گوتن )

٦ ـ ئەمەش لیستەیەکە لەو وشانەی کە بـە هۆی پێشگری (بێ)وه پەیدابوون :

بێپەروا .

بێتۆك .

بێلایەن .

بێجگه ( بێجگه ) .

بێچارە .

بێخود .

بێنوێژ .

بێخێر .

بێسامان .

بێشـــەرم .

بێکار .

بێتیشك .

بێنـــەوا .

بێوەی .

بێبـــاك .

بێسەروپێ .

(١) ئەمانە نێوی دوو حەفتەی چلەی زستانن

بێ‌هێز •
بێ‌کەڵك •
بێ‌کەس •
بێ‌بار •
بێ‌پارە •
بێ‌هۆش •
بێ‌شـــوێن •
بێ‌بن •
بێ‌خەیاڵ •
بێ‌گەرد •

**١٨ ـ پێشگری ( لە ) :**

لە لاپەڕە (٣٥٤ )ی بەرگی پێنجەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ساڵی ١٩٧٧ مامۆستا مەسعوود محەمەد تێبینیێ لە بارەی هەبوونی پێشـگری (لە) و (بۆ)وە دەربڕیوە ، ئێستا لیژنە لێیان دەکۆڵێتەوە •••

لە پێشەوە لیژنە لیستەیەکی لەو وشـــانە کۆکردەوە کە بە پێشـگری (لە) دەستیان پێ‌کراوە :

١ ـ لەبار •
٢ ـ لەبارچوون ( لەبەرچوون ) •
٣ ـ لەبەرڕۆیشتن •
٤ ـ لەبەرکردن •
٥ ـ لەپڕ ( لەپڕا ) •
٦ ـ لەناکاو ( لەنکاو ) •

٧ ــ لەپێش ( دارا لەچاو برادەرەکانی قوتابیەکی لەپێشە ) •
٨ ــ لەجیێ ( لەبار ) •
٩ ــ لەجیێ چوون •
١٠ــ لەجیاتیێ •
١١ــ لەڕوو ( قادر پیاوێکی لە رووە ) •
١٢ــ لەسەر ( ئەحمەد کوڕێکی هەڵەشە و لەسەرە ) •
١٣ــ لەسەرخۆ •
١٤ــ لەمێژ •

مامۆستا تۆفیق وەهبیێ لە لاپەڕە (٨٢)ی فەرهەنگەکەیدا دەڵێت : (لە) بە عادەت دەبێتە پێشگری پریپۆزیشنی ( بۆ ) ، هەروەها پێشگری گەلیێ وشە کە بە زۆریێ ناوی جێگەن بۆ دروستکردنی پریپۆزیشنی لێکدراو • وە ئەم نموونانەشی هێناوەتەوە •

١ ــ لەبابەت •
٢ ــ لەبان •
٣ ــ لەباتیێ •
٤ ــ لەبەرامبەر •
٥ ــ لەبن •
٦ ــ لەجیاتیێ •
٧ ــ لەکن •
••• تاد •

مامۆستا تۆفیق وەهبیێ لەبارەی پریپۆزیشنی ( بۆ ، بە )ش هەمان باوەڕی هەیە لە لایەن دروستکردنی پریپۆزیشنی لێکدراو ، کاتیێ کە دەکەونە پێش ناوی جێگاوە •

لیژنە موناقەشەی ئەم ڕایەی مامۆستا وەهبی خستە دوای بەسەر چوونی باسی (لە) •

مامۆستا گیوی موکریانی و مامۆستا خاڵ لە فەرهەنگەکانیاندا بەشێکی ئەو وشانەیان نوسیوە کە بە هۆی پێشگری (لە) پێکهاتون ، بەلام پەنجەیان بۆ پێشگربونی (لە)یەکە ڕانەکێشاوە •

لیژنە دوای ئەم نمایشتە هاتە سەر لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆی •

سەرنج گرتن لە لیستەی ئەو وشانەی (لە)یان تێدا بەشدارە ئەو ڕاستییانە بە دەستەوە دەدات :

١ ـ چونەسەر :

ا ـ ناوی مەعنەوی ( بەزۆری ) ، وەك :

لەبار ، لەپڕ ( پڕ = فجأة ) ، لەمێژ [ هەرچەند وشەی (مێژ) بەتەنیا بەکار نەهاتوە ، بەلام بەپێی واتای ئەو وشانە کە تیایاندا بەشدارە ، مێژو ، لەمێژ ، مێژینە ، دەردەکەوێت ، کە بە واتای « قدم »ی عەرەبی بێت ] •••

ب ـ ناوی مادی ، وەك :

لەجێ ، لەڕۆ •

ج ـ ئاوەڵکاری جێگە (ظرف مکان) ، وەك :

لەپێش ، لەسەر ، لەبەرڕۆیشتن •••

٢ ـ ئەو بەشە ئاخاوتنانە دروست دەکات :

ا ـ ئاوەڵناو ، وەك :

لەبار ، لەپێش ، لەجێ •••

ب ـ کاری ناسادە ، وەك :

لەبەرڕۆیشتن ، لەبارچوون •••

جـ ــ ئاوەڵکار ، وەك :

لە جیاتیی (ئاوەڵکاری شوێنیی) ، لەپڕ ــ لەپڕا (ئاوەڵکاری وەسفیی) ، لەنکاو (ئاوەڵکاری وەسفیی) ــ وشەی (لەنکاو) وەك ئاوڵناویش خـۆی دەنوێنێ •

هەرچەندە وشەی ( لەمەڕ ) نەخرایە لیستەی ئەو وشانەی پێشگری (لە)یـان تێدایە ، بـەڵام ڕواڵەتەکەی وا رادەگەیەنێ کە لـە دوو کەرت پێكهاتبێ : (لە) + (مەڕ) •

لیژنە لەبـەر ڕوونەبوونی ئـەو بنیچەیەی کـە کەرتی (مـەڕ)ی لێ وەرگیراوە ڕێگەی بە خۆی نەداوە وشەی (لەمەڕ) تێکەڵ بە وشەکانی ئەو لیستەیە بکات • لەگەڵ ئەمەشدا وا پێ دەچێ ، ئەویش لە بابەتی وشەی وەك ( لەبرینێ و لەجیاتیی ، لەپڕ ، لەبار ••• ) بێت • ئنجا کە ئەمە وا بێت رەنگە بشێ پێی بوترێ ئاوەڵکاری شوێنیی •

لیژنە هاتە سەر موناقەشەی بیر و راکەی مامۆستا وەهبیی •

لەوەدا کە ئەو وشانەی وەك ( لەبابەت ، لەبان ، لەبەرانبەر ، لەبن ) [ بڕوانە فەرهەنگەکەی ، ل ٨٢ ] بـە پریپۆزیشنی لێکدراو داناوە بەلای لیژنەوە ، وشەی ( لە ) لەم حاڵەتانەدا پریپۆزیشنی عادەتییە کەوتۆتە پێش ئاوەڵکاری شوێنیی ( ظرف مکان ) •

لە تەرکیبی ( اضافی ) ، وەك ( لەبن دارەکە ، لەسەر بەرد ، لە ژوور ئەحمەد ••• ) کە (ی)ی ئیزافـە بەکار نەهاتوە و وا پێدەچێ مامۆسـتا وەهبیی نەهاتنی ئەم (ی)یەی کردبێتە بەڵگەی رایەکەی خۆی ، لە راستیدا پریپۆزیشنی ( لە ) هەبێ و نەبێ ، ئەو (ی)یە هەر بەکار نایەت ، وەك کە دەوترێ ( سەربان ، بندار ، ناوچیا ••• ) • بەلای باوەڕی لیژنەوە نەهاتنی

(ی)ی ئیزافە لەو حاڵەتانەدا دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئەو وشانە کە زەرفی جێگەن و زەرفیش بێهێزترە لە وشەی‌تر ، ئامادەتریشە حاڵەتی مەعمولییەت وەربگرێ •

بە نیسبەت لیژنەوە هۆیەکی دیکەی گرنگیش هەیە ڕێی پێنادا وشەکان بە پریپۆزیشن حیساب بکا ، چونکە ئەو تەعریفەی لیژنە بۆ پریپۆزیشنی دانا ، پریپۆزیشنی بە وشەی بەستراو لە قەڵەم داوە ، کە لەوێدا واتای تەواو پەیدا نییە ؛ کەچی لەم وشانەدا ئەو کەرتانەی ظرفن واتای تەواویان هەیە •

**١٩ ــ پێشگری (بۆ) :**

ئەم پێشگری ( بۆ ) لە بنەڕەتدا هەمان پریپۆزیشنە کە لەمەوبەر لیژنە و نوسەرانی تریش لێی دواون • هەروەك مەعلومە پریپۆزیشن لە ڕستەدا دەور دەبینێت ، بەڵام کە وەك پێشگر بەکار هات لەگەڵ وشەی تردا دەور دەبینێت ، وەك :

بۆناو ( ضمیر ) •
بۆچون ( تصور ) •
بۆزانین ( اعلان ) •
بۆهاتن ( اقبال ) •

لە نمایشتی ئەو وشانەی کە بە پێشگری ( بۆ ) دەست پێ دەکەن دەردەکەوێت ژمارەیان کەم بێت • شتێکی تریش سەرنج ڕادەکێشێت لەوەدا :

١ ــ وشەی ( بۆناو ) لە لایەن مامۆستا وەهبییەوە دروست کراوە •

٢ ــ وشەی ( بۆزانین )یش لەو ٣٠ــ٤٠ ساڵانەی دواییدا لە لایەن دایەرەکانی حوکومەتەوە لە جێی وشەی ( اعلان )ی عەرەبیێ بەکار هێنراوە و ڕۆیشتوە •

٣ ــ وشەی ( بۆچوون ) لە کۆنەوە لــە هەموو کوردســتاندا بەکار هاتوە •

٤ ــ دەتوانرێت وشــەی ( بۆهاتن )یش بە وشــەیەکی فەرهەنگیێ حیساب بکرێ ، چونکە بە ڕاشکاویێ لە واتای ( مساعفة ، الحظ ، الهام ) لە کۆنەوە بەکارهاتوە •

٥ ــ وشەی وەك ( بۆخواردن ) ، بۆفرۆشتن ، بۆ هەڵگرتن ، بــۆ کڕین ، بۆداتاشین ، بۆ بڕین •••) بە ئامرازی ( بۆ ) دەست پێ دەکەن و نەبوونەتە وشەی فەرهەنگیێ ، جاریێ لەو وشانەدا ( بۆ ) هەر پریپۆزیشنە و بە پێشگر حیساب ناکرێت •

٦ ــ وەك لە بەکارهێنــان و واتای وشــەکانەوە دەردەکەوێــت ، پێشگری ( بۆ ) لە حــاڵەتی پێشگریشــدا ڕاگەیاندنی بنجیێ خــۆی بە دەستەوە دەدات ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشــدا وشەیەکی نوێی پێك هێناوە بۆیە بە پێشگر حیساب دەکرێت •

٧ ــ تێبینییەکی هەرە گرنگ لە بارەی ئەو وشــانەوە ئەوەیــە کــە هیچیان ئاوەڵناو ، یا ئاوەڵکار نین ، واتە وەسفیەتیان تێدا نییە ، تەنانەت لە وشــەی ( بۆناو ) بەولاوە ئەوانیتر هەموویان ( چاوگ )ن •

**٢٠ ــ پێشگری ( نا ) :**

ئەم پێشگرە نووســەرانی کورد بەم جۆرە لێیدواون :

١ ــ مامۆســتا توفیق وهبــیێ لەلاپەڕە (٩٤)ی فەرهەنگەکــەیدا

دەڵێت : (نا) پێشگرێکی نەفیە و وشەی ئاوەڵناو دروستدەکات •

تێبینی : مامۆستا وەهبی لە بارەی ئەو (نا)یەی کە دەچێتە سەر کاری ڕانەبوردوو دەڵێت پێشگرێکی نەفیە و دەبێتە جێگری نیشانەی (ئە)ی کاری ڕانەبوردوو • مامۆستا لە بری ( نیشانە ) وشەی Porticole ی بەکارهێناوە •

ئەندامانی لیژنە لە بارەی سروشتی ( نا )ی پێش کاری ڕانەبوردوو بیروڕای تایبەتییان هەیە بە نموونە :

نووری علی امین وشەی ( نا ) بە ئاوەڵکاری نەفی دادەنێت لەکاردا، لە لایەکی تریشەوە تێبینیەکی گرنگ لە بۆچوونەکانی مامۆستا وەهبی دێتە بەرچاو • مامۆستا دەڵێت پێشگری ( نا ) لە نەفیدا دەبێتە پارتیکلی ( ئە )ی پێش کاری ڕانەبوردوو • لێرەدا ئەم پرسیارە هەڵدەستێ ئایا دەشێت بڵێین شتێك کە جێگری پارتیکل بێت دەبێتە پێشگر ؟

لیژنە هەرچەند لە سەرەتاکانی لێکۆڵینەوەیدا زاراوەی ئامرازی بۆ ( نە ، نا ، مە ) بەکارهێنا ، بەڵام ئەوسا لەو بەکارهێنانەدا مەبەستی ئەوە نەبوو کە بڵێت ئەو وشانە لەو بەشەن کە دواتر لە نێوان باسی وشەی سەربەخۆ و بەستراودا ، زاراوەی ئامرازی بۆ دانراوە •

ئەندامانی لیژنە تا ئێستاش بڕیاری دوایەکییان نەداوە لەسەر ئەو زاراوەیەی کە وشەی ( نە ، نا ، ) دەگرێتەوە ، هەرچەند بە شێوەیێکی سەرەتایی پەنجەیان بۆ زاراوەی ( نیشانە ) ڕاکێشاوە • کاتێك باسی ئەو وشانە نۆرەیان گەیشتێ زاراوەیان بۆ دادەنرێت •

٢ ـ کەریمی ئەیوبی و ئی • ئا • سمیرنۆڤا لە لاپەڕە (٤١)ی کتێبی ( دیالێکتی کوردی موکری ) دەڵێن پێشگری ( نا ، نە ) بە ئاوەڵناوەوە دەلکێت و ئاوەڵنا و بە واتای نەفی ساز دەکات ، وەك :

ڕاست ـ ناڕاست •

ساغ ـ ناساغ •

٣ ـ د• عبدالرحمن معـروف لە کتێبـی ( وشـەڕۆنان لە زمانی کوردیێدا ) لاپەڕە ( ٨٩ـ٧٠ )دا نوسیویەتی : پێشگری ( نە ) و ( نا ) دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و ئاوەڵناوی دارێژراوی لێدروست دەکەن ، وەك :

ڕێك ـ نارێك •

پاك ـ ناپاك •

ئەنجا لیژنە هاتە سەر لێکۆڵینەوەی تایبەتی خـۆی • لە پێشـەوە لیسـتەیێکی لەو وشانە پێکهێنا کە ( نا ) یان بە سەرەوەیە :

١ ـ نائومێد •

٢ ـ ناباو •

٣ ـ نابەدڵ •

٤ ـ نابەلەد •

٥ ـ نابینا •

٦ ـ ناپاك •

٧ ـ ناپەسەند •

٨ ـ ناتەبا •

٩ ـ ناتەواو •

١٠ـ ناچیز •

١١ـ ناتۆرە ( تۆرە = ئەدەب = تربیة ) •

١٢ـ ناچار •

١٣ــ ناحەز •

١٤ــ ناخۆش •

١٥ــ نادروست •

١٦ــ نادیار •

١٧ــ نادیتە •

١٨ــ ناڕاست •

١٩ــ ناڕەوا •

٢٠ــ ناڕێك •

٢١ــ ناساغ ( ناساخ ) •

٢٢ــ نسادە •

٢٣ــ ناساز •

٢٤ــ ناشارەزا •

٢٥ــ ناشرین •

٢٦ــ ناقۆڵا •

٢٧ــ ناسەرسەنگ ( غیر موافق ــ غیر مرحب ) •

٢٨ــ ناکام •

٢٩ــ ناکاو •

٣٠ ــناکەس ( ناکەس بەچە ) •

٣١ــ ناکۆك •

٣٢ــ ناتوانا •

٣٣ــ نالەبار •

٣٤ــ نامەرد •

٣٥ــ نامرۆڤ ( نەمرۆڤ ) •

٣٦ــ نابەکار •
٣٧ــ نابەجێ •
٣٨ــ ناگەوار ( مرفوض ) •
٣٩ــ ناهەموار •
٤٠ــ ناحەق ( ناهەق ) •
٤١ــ ناڕەسەن •
٤٢ــ ناپایەدار •
٤٣ــ ناپیاو •
٤٤ــ ناپوختە •
٤٥ــ ناڕەحەت •
٤٦ــ ناڕەزا •
٤٧ــ ناسازگار •
٤٨ــ ناسزا •
٤٩ــ ناسوپاس •
٥٠ــ ناوەجاخ •
٥١ــ ناڕاست •
٥٢ــ ناشایستە •
٥٣ــ نامراد •
٥٤ــ ناشوناس •
٥٥ــ نائاسایی •
٥٦ــ ناڕێك •
٥٧ــ ناوەخت •
٥٨ــ ناجسن •

٥٩ــ نادیده •

٦٠ــ ناشاد •

٦١ــ ناکات •

لێکۆڵینەوەکانی لیژنە دەربارەی ئەم پێشگرە :

١ ــ هەروەك نوسەران بۆی چوون بۆی ئەم پێشگرە بۆ نەفی واتای ئەو شتەی پێوەی دەلکێت بەکاردێت •

٢ ــ دەچێتە سەر ئاوەڵناو و ئاوەڵناوی داڕێژراو دروستدەکات :

| | |
|---|---|
| ڕاست | ناڕاست • |
| بەڵەد | نابەڵەد • |
| پاك | ناپاك • |
| ڕێك | ناڕێك • |
| خۆش | ناخۆش • |

٣ ــ دەچێتە سەر ئاوەڵناوی داڕێژراو و ئاوەڵناوێکی تازەی داڕێژراو دروستدەکات ، وەك :

| | |
|---|---|
| بەجێ | نابەجێ • |
| بەدڵ | نابەدڵ • |
| بەکار | نابەکار • |
| لەبار | نالەبار • |

٤ ــ دەچێتە سەرناوی مەعنەویی و ئاوەڵناوی داڕێژراو دروست دەکات ، وەك :

| | |
|---|---|
| چار | ناچار • |
| ئومێد | نائومێد • |

وەخت ناوەخت •

حەز ناحەز •

٥ ــ دەچێتە سەر هەندێك وشە کە لە بنـەڕەتدا ناون بـەڵام لە بەکارهێناندا لایەنی وەسفیەتیان تێدا ڕەچاوکراوە ، وەك :

پیاو ناپیاو •

مەرد نامەرد •

دوو وشەی ( پیاو ) و ( مەرد ) بە واتای ( رجل )ی عەرەبین ، بەڵام لێرەدا بۆ مەبەستی واتای ( شهم )ی عەرەبی بەکارهاتوە •

وەجاخ ناوەجاخ •

وەجاخیش بە واتای ( ئاگردان ) دێت ، لەمەشدا مەبەست وشەکە ( اصیل )ی عەرەبیە •

٦ ــ وشـەی ( نـا ) بەکارهێنانێکی ئیدییمی لـەگەڵ یەکێ لـە سـوێندەکانی عادەتیدا ، وەك کە دەگوترێت ( نابەخوا زۆر ئازایـە ) • مەبەستیش لە هەڵگێڕانەوەی واتای ئەو سوێندەکەیە ، بەو پێیە وەك ئەوەیە گوترابێت ( بە خوا ئازا نییـە ) • وا پێدەچێـت لـە زاری سلێمـانیدا نەختێك گۆڕانی بەسـەردا هاتوە و بۆتە ( نامەخوا ) چونکە وەك کـە ( نابەدڵ ) هەندێ جار دەبێتە ( ناوەدڵ )لەمەدا دوو تێبینی دەکرێت :

أ ــ نایەکە ( نا )ی نەفی عادەتییە نەك پێشـگر •

ب ــ دەشێت بگوترێت گوتەکە دەچێتە ریزی ئەو بەشە ئاخاوتنەی کە پێمان گوت : ئامرازی تەعەجوب •

٧ ــ بەشێك لەو وشە وەسفیانەی کە پێشـگری ( نا )یان دەچێتە سەر لە (کار) وەرگیراون ، وەك :

توانا ناتوانا •

بینا نابینا •

دیته نادیته •

٨ ــ ئەو وشانەی کە لە کرمانجی خوارودا (نا)ی بۆ بەکاردێت ، لە کرمانجی سەرودا ( نە )ی بۆ بەکاردێت ، وەك :

نامرۆڤ نەمرۆڤ •

ناپیاو نەپیاو •

ناچار نەچار •

ناپاك نەپاك ( نەپاقژ ــ نەپاکژ ) •

**٢١ ــ پێشگری ( نە ) :**

ئەم پێشگرە توسەرانی کورد بەم جۆرە لێی‌دواون :

١ ــ مامۆستا توفیق وهبی لە لاپەڕە (٩٧)ی فەرهەنگەکەی‌دا لە شێوەی چوارەمی وشەی (نە) دەڵێت : پێشگری نەفیە بۆ پێکهێنانی ناو و ئاوەڵناو و ئاوەڵکار بەکاردێت ، وەك :

نەبەز •

نەبین •

نەمان •

٢ ــ کەریمی ئەیوبی و ئی• ئا• سمیرنۆڤا ، لەگەڵ د• عبدالرحمن معروف هەمان بیروڕایان هەیە کە لە باسی پێشگری (نا)دا کراوە •

ئەنجا لیژنە هاتەسەر لێکۆڵینەوەی بیروڕای خۆی دەربارەی ئەم پێشگرە ، لە پێشەوە لیستەیەکی لەو وشانەی کۆکردەوە کە بە پێشگری

(نە) دەستیــان پێکراوە بۆ ئەمە سەیری فەرهەنگە کوردییەکان کراوە • ئەمەش لیستەکەیە :

١ ــ نەباش •

٢ ــ نەبان ( ئەو مــەڕ و مانگا بــەچکە مــردوەی کە بــەچکەی یەکێکی‌تر هەڵناگرێتەوە ، گەردانیشی بەم شێوەیەیە :

| | | |
|---|---|---|
| بانان | بانا | دەباتێت • |
| باندن | باناندی | دەباتێنێت • |

٣ ــ نەبەز ( نەبەزین ــ نەبەزیو ) •

٤ ــ نەبەدکار •

٥ ــ نــەبڕان •

٦ ــ نەبون ( نەبونە ــ نەبونی ) •

٧ ــ نەبزوێن •

٨ ــ نەبزۆك ( غیر متحرك ) •

٩ ــ نەبو ( فقیر ، مفقود ) •

١٠ــ نەبیست •

١١ــ نەبیستراو •

١٢ــ نــەبین •

١٣ــ نەتۆرە •

١٤ــ نــەچار •

١٥ــ نەخۆش •

١٦ــ نەدار ( لایملك شیئاً ) •

١٧ــ نەدیار •

١٨ــ نەدیدە ( نەدیتە ) .

١٩ــ نەدیی و بدیی ــ نەدیی و نەناسیو .

٢٠ــ نەڕاست .

٢١ــ نەدیو .

٢٢ــ نەزان ، نەزاندوو ، نەزانراو ...

٢٣ــ نەزاو ، نەزۆک ، نەزا ، نەزێ .

٢٤ــ نەپەنیی ( مجهول ) .

٢٥ــ نەساغ .

٢٦ــ نەسرەوتن ، نەسرەوت .

٢٧ــ نەسوو ( صلب ) .

٢٨ــ نەڤەگر ( غير معدي ، غير ساري ) .

٢٩ــ نەکار .

٣٠ــ نەکاو .

٣١ــ نەکوو ، نەوەکوو ، نەوەکی ، نەوەک ...

٣٢ــ نەکێش ، نەکێشان .

٣٣ــ نەکام .

٣٤ــ نەکۆڵۆک ، نەکوڵەک .

٣٥ــ نەگۆڕ .

٣٦ــ نەگەییو ، نەگەهیی ...

٣٧ــ نەخوازە ، نەخواز ، نەمازە (کرمانجیی سەروو) ، نەخوازەڵڵا ، نەخەسەڵا .

٣٨ــ نەمان ، نەماو .

٣٩ــ نەپیاو .

٤٠ــ نەمێر (نەمێرد) •
٤١ــ نەمر •
٤٢ــنەناس ، نەناسراو
٤٣ــ نەوێر ، نەوێران
٤٤ــ نەوێس (لایدوم)
٤٥ــ نەهــات •
٤٦ــ نەهێشتن •
٤٧ــ نەهێڵ ــ نەهێڵان •
٤٨ــ نەیــار •
٤٩ــ نەخوێندەوار •
٥٠ــ نەخەندم ( عبوس ) •
٥١ــ نەشارەزا •
٥٢ــ نەبالغ ( نەباڵق ) •
٥٣ــ نەگیراو ( جوانتوی نەگیراو ) •
٥٤ــ نەناس ، نەناسیاو •
٥٥ــ نەپــاك •
٥٦ــ نەرێ (منفی ، سالب) •
٥٧ــ نەشیاو ( غیر لائق ) •
٥٨ــ نەتڵ (دوژمنانە ــ فەرهەنگی وەهبیێ) •
٥٩ــ نەگوتراو •
٦٠ــ نەخۆشەوان ( Sick — nups ــ توفیق وەهبیێ ) •
٦١ــ نەبڕ ( تیغیکول ، پیاوی کەم بڕشت ) •
٦٢ــ نەپۆڕ ( نەپۆڕیان ــ نەگونجان ) •

٦٣ــ نەگونجان •

٦٤ــ نەساز •

٦٥ــ نەخیچان (بەر هەدەف نەکەوتن) •

٦٦ــ نەترس •

٦٧ــ نەجم •

٦٨ــ نەجوڵاو •

٦٩ــ نەبزێو •

٧٠ــ نەخۆ ( دەنا ــ ئەگینا ) •

٧١ــ نەژی ( نەمر و نەژی ) •

٧٢ــ نەخەمە ( قەیناکە ) •

٧٣ــ نەدۆ ( کەمقسە ، کەم دۆ ) •

٧٤ــ نەژنەوا (کەڕ) •

٧٥ــ نەژنەفتن ( نەبیستن ) •

٧٦ــ نەشۆر ( نەزۆك ــ فەرهەنگی خاڵ ) •

٧٧ــ نەکردە ــ نەکردۆ •

٧٨ــ نەکەردەنگ (مات ، خامۆش ، بێدەنگ) •

ئەنجا لیژنە هاتە سەر لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆی :

١ــ ئەم پێشگرەش وەك پێشگری (نا) بۆ نەفی واتای ئەو شتەی پێوەی دەلکێت بەکاردێت ، وەك :

خۆش نەخۆش •
مان نەمان •
دیده نەدیده •

کار نەکار •
یـــار نەیار •

تەنیا ئیستیسنایەك هەبێت لەوەدا وشەی (نەبەدکار)ە ، کە لە ڕواڵەتی ئێستاکەیدا بە پێی بەکارهێنانی لە شێوە ئاخاوتنی سەرو ، هەر واتــای (بەدکار) دەگرێتەوە ، واتە ئەم پێشـــگرەی (نــە) لێــرەدا کاری خــۆی نــەکردوە •

٢ــ دەچێتە سەر ئاوەڵناوی سادە و نسادە و هەر ئاوەڵناو دروست دەکات ، وەك :

زاو نەزاو •
ســـاغ نەساغ •
ڕاست نەڕاست •
یار نەیـــار •
خوێندەوار نەخوێندەوار •

٣ــ دەچێتە سەر ناوی مەعنەوی و ئاوەڵناوی داڕێژراو دروســـت دەکات ، وەك :

فام نەفام •
کـــار نەکار •
سرەوتن نەسرەوتن •
مـــان نەمان •
کام نەکام •

٤ــ دەچێتە سەر هەندێك وشـــە کە لە بنەڕەتـــدا (نــاو)ن بــەڵام لەبەکارهێناندا لایەنی وەسفیەتیان تێدا ڕەچاوکراوە ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| پیـــاو | نەپیاو • | |
| مێرد | نەمێرد (نەمێر) • | |

٥ــ چی لە بەندی شەشەمی باسی پێشگری (نـــا) و بەکارهێنـــانی ئیدیێمەوە گوتراوە لەبارەی (نە)یشەوە دەگوترێت •

٦ــ بەشێکی زۆر لەو وشە وەسفیانەی کە بە هۆی پێشگری (نە)وە پەیدا دەبن لە بنجی کارەوە دێن ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| خواردن | نانخۆر | نەخۆر • |
| دیتن | دنیا دیتە | نەدیتە • |
| زانین | زۆرزان | نەزان • |
| ناسین | سەرناس | نەناس • |
| وێران | بوێر | نەوێر • |
| مردن | ــ | نەمر • |
| بەزین | خۆشبەز | نەبەز • |

٧ــ وا دەبێت ئەو وشەیەی (نە) دروستی دەکات هاو واتـــایە لەگەڵ ئەو وشەیەی (نا) دروستی دەکات ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| ساغ | نەساغ | ناساغ • |
| ڕاست | نەڕاست | ناڕاست • |
| کاو | نەکاو | ناکاو • |
| فام | نەفام | نافام • |
| دیدە | نەدیدە | نادیدە • |
| کام | نەکام | ناکام • |
| شارەزا | نەشارەزا | ناشارەزا • |

٨ــ واش دەبێت ئەو وشەیەی (نە) پێکی دێنێت لە واتادا جودایــی هەیە لەگەڵ ئەو وشەیەدا (نا) پێکدێنێت ، وەك :

خۆش نەخۆش (مریض) ناخۆش ( غیر لذیذ ) •
پیاو نەپیاو ( فاقد الرجولة ) ناپیاو (فاقد المروءة) •
ساز نەساز ( غیر منسجم ناساز (غیر صحي) •
مع أحد او شيء )

٩ــ أ ــ بەشێك لەو وشانەی کە پێشگری (نە) پێکیــان دەهێنــن ، پێشگری (نا) وەرناگرن وەك :

نەدار •
نەدیو •
نەزانین •
نەزاو •
نەپەنی •

بــ واش دەبێت ئەو وشەی بە هۆی پێشگری (نا)وە پەیدا دەبێت پێشگری (نە) وەرناگرێت ، وەك :

نالەبار •
ناشرین •
نامراد •
ناحەز •

١٠ــ أ : پێشگری (نە) لە وشەی (نەخوازەڵا ، نەخەسەڵا )دا هاتوە • ئەم وشەیە لەلایەن مامۆستا وەهبیەوە بە (ئاوەڵکار) دانراوە ( فەرهەنگی توفیق وەهبی لاپەڕە ٩٧ ) •

ب : هەروەها لە وشەکانی (نەکا ، نەکو ، نەوەکا ، نەوەك ، نەك ٠٠) پێشگری (نە) هاتوە • پێشتر لە لایەن لیژنەوە بە ئامرازی عطف دانراون •

**٢٢ ــ وشەی ( مە ) :**

چەند وشەیەك هەن لە ئاخاوتنی ئێستاکەی کوردیێدا بریتین لە سەرەتای ( مە ) و رواڵەتێکی کار ، وەك :

مەبەست •

مەترسیێ •

مەگیرانیێ •

گومان بۆ ئەوە دەبەن (مە) تێیاندا پێشگر بێت ، بەڵام لیژنە ناتوانێت بڕیار بدات لە سەر ئەوە ئاخۆ ئەو (مە)یە لەو چەند وشەیەدا پێشگرێکە و بە دەگمەن بەکاردێت ، وەیا رواڵەتی سواوی وشەیێکی کۆنە ماوەتەوە •

وشەی (مەگەز)یش لە شێوەی ئێستاکەی کوردیێدا ، وا پێدەچێت لە (مە) و وشەی (گەز ــ گەستن)ەوە هاتبێت • پێویستە لە ئاست وشەی (مەگەز)دا تێبینیێ ئەوە بکرێت کە لە فارسیێدا پێی دەگوترێت ( مگس ــ مەگەس ) •

**٢٣ ــ وشەی ( هەر ) :**

لیژنە کەوتە لێکۆڵینەوەی مۆرفێمی (هەر) هەتا بزانێت ئەم وشەیە دەبێتە پێشگر یان نابێت ، بۆ ئەوەی سەیری فەرهەنگەکانی کوردیێ کرد و ئەم وشانەی بەرچاوکەوت کە بە مۆرفێمی (هەر) دەست پێدەکەن :

١ ــ هەرچ (هەرچی) •

٢ ــ هەرچەند (هەرچەندە ــ هەرچەندێ ــ هەرچەندێك) •

٣ ــ هەرچۆن •
٤ ــ هەرکام •
٥ ــ هەرکوێ •
٦ ــ هەرکە •
٧ ــ هەروا •
٨ ــ هەروەها •
٩ ــ هەردەم •
١٠ــ هەردۆك •
١١ــ هەرسێك •
١٢ــ هەرجۆر •
١٣ــ هەرچاخ •
١٤ــ هەرگاف •
١٥ــ هەروەك •
١٦ــ هەرتا (هەتا) •

ئەم وشانە کە لە فەرهەنگەکانی خاڵ و مەهاباد و ئەستێرەگەشە دەرهێنراون ، لەو فەرهەنگانەدا وەك وشەی سەربەخۆ حیساب کراون بەڵام ئەوانەی کە لە فەرهەنگی توفێق وەهبیدا هاتوون هەموویان شێوە بەکارهێنانی (هەر) نیشان دەدەن نەك بە وشەی سەربەخۆ حساب کراون ، کاتی خۆشی (بڕوانە لاپەڕە ٣٩١ و بەرەودواتر لە کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردیی) لیژنە لە باسی ئامرازی عطفدا بەسەر بەشێ لەو وشانەدا چووە کە (هەر)یان لە پێشەوەیە •

بە لای لیژنەوە ئەم کۆمەڵە وشەیەی نێو لیستە و هەرچی وەك ئەوانیش کە هەبێت ناشێت بە وشەی فەرهەنگی سەربەخۆ حیساب بکرێت

بەڵکو وەك مامۆستا وەهبی بۆی چوە هەمویان نوێنەری بەکار هێنانی جۆراوجۆری (هەر)ن • واتە هیچ یەکێ لەو وشانە بە هۆی مۆرفێمی (هەر)ەوە وشەی تازەی پێك نەهێناوە کە لە واتای کۆنی خۆی دەرچو بێت ، لەبەر ئەمە ناشێت بگوترێت مۆرفێمی (هەر) لێرەدا پێشگرە ، هەروەك ناشێت بگوترێت مۆرفێمی دوای (هەر) لەم وشانەدا پاشگرە •

**٢٤ ـ هەندێ وشە هەن وەك : (دەر ، سەر ، لا ، ژێر ، خوار ، کن ، دوا ، پێش ، پاش ، پشت ، ناو ...)**

توسەران هەریەکەیان بە جۆرێ لێی دواون • لیژنە بۆ ڕون کردنەوەیان وای بە چاك زانی یەکە لێیان بدوێت و لە فەرهەنگەکاندا ئەو وشانەش کۆ بکاتەوە کە ئەو وشانەی تێدایە •

بەر لەوەی کە بێینە سەر تاك تاکی ئەو وشانە پێویستە بڵێین کە لیژنە کاتی خۆی لە باسی پێشگر و پاشگری کاردا بە کورتی بەسەر ئەم وشانەدا چوەوە • لێرەدا بە درێژی لێیان دەدوێین :

( ئەلف ) مۆرفێمی (دەر) :

١ ـ دەر •

٢ ـ دەرئەنجام •

٣ ـ دەرامەت •

٤ ـ دەراو ( شريعة ، مجال ، نوع من النبات ) •

٥ ـ دراوسێ •

٦ ـ دەربارە •

٧ ـ دەرباز ( دەربازبون ، دەربازکردن ) •

٨ ـ دەربردن •

٩ ــ دەربڕین •

١٠ــ دەربوون •

١١ــ دەربەدەر (دەربە دەربوون) •

١٢ــ دەربەست •

١٣ــ دەربەند •

١٤ــ دەرپۆقین •

١٥ــ دەرپەڕان (دەرپەڕاندن) •

١٦ــ دەرپەڕین •

١٧ــ دەرپێ •

١٨ــ دەرچوون (چوونەدەرەوە) •

١٩ــ دەرخستن •

٢٠ــ دەرخۆنە •

٢١ــ دەرخواردان •

٢٢ــ دەردان •

٢٣ــ دەرگ (دەرگا) •

٢٤ــ دەرکردن •

٢٥ــ دەرکوت (مطرقة) •

٢٦ــ دەرکەوتن •

٢٧ــ دەرکێشان •

٢٨ــ دەرگا (دەرگاوان) •

٢٩ــ دەرماڵ ( عتبة الدار ) •

٣٠ــ دەروازە (دەرۆزە) •

٣١ــ دەروبەر •

٣٢ــ دەرو دراوسێ •

٣٣ــ دەروژۆرکردن •

٣٤ــ دەرۆ •

٣٥ــ دەرۆلێکردنەوە •

٣٦ــ دەرۆن •

٣٧ــ دەرهاتن •

٣٨ــ دەرەبەگ •

٣٩ــ دەرەتان (مجال) •

٤٠ــ دەرەقەت •

٤١ــ دەرفەت •

٤٢ــ دەرەکی •

٤٣ــ دەرەلنگ •

٤٤ــ دەرێ •

٤٥ــ دەراورد (بەرهەم) •

٤٦ــ دەرچە ( فتحة ) •

٤٧ــ دەرهاویشتن •

٤٨ــ دەرکرد ( تصدیر ، صادرات ) •

٤٩ــ دەرەوە •

٥٠ــ دەرتەنگ ( مضیق ) •

٥١ــ دەرکەنار ( حاشیة ، هامش ) •

٥٢ــ دەریوك ( دەرگایەکی بچکۆلە ) •

٥٣ــ دەری ( کەلی ڕێگا لە سەرشاخ ) •

له دوا پێکهێنانی لیستەیەك لەو وشانەی کە سەرەتایـان بە (دەر) دەست پێ دەکات ، ئەنجا لیژنە هاتە سەر لێکۆڵینەوە لە جۆری ئەو وشانە:

١ــ مۆرفیمی (دەر) لەم وشانەی خوارەوەدا لە بەشی (ناو) بە واتای ( دەرگا = باب ) دێت :

١ ــ دراو •
٢ ــ دراوسێ •
٣ ــ دەریوك (دەرگایەکی بچکۆلە) •
٤ ــ دەربەدەر •
٥ ــ دەربەست •
٦ ــ دەربەند •
٧ ــ دەرپێ •
٨ ــ دەرخۆنە •
٩ ــ دەرك •
١٠ــ دەرکوت •
١١ــ دەرگا •
١٢ــ دەروازە •
١٣ــ دەرۆزە (دەرۆزی) •
١٤ــ دەرۆلێ‌کردنەوە •
١٥ــ دەرەلنگ •
١٦ــ دەرچە •
١٧ــ دەرتەنگ •
١٨ــ دەری •••

٢ــ مۆرفێمی (دەر) لەم وشانەشدا لە بەشی (ئاوەڵکار)ە ، بە واتای (ناوی جێ) دێت :

١ ــ دەرامەت •
٢ ــ دەراو •
٣ ــ دەرباز •
٤ ــ دەربوون •
٥ ــ دەرپۆقین •
٦ ــ دەرپەڕین •
٧ ــ دەرپەڕاندن •
٨ ــ دەرچوون •
٩ ــ دەرخستن •
١٠ــ دەردان •
١١ــ دەرکەوتن •
١٢ــ دەرهێنان •
١٣ــ دەرماڵ •
١٤ــ دەوروبەر •
١٥ــ دەرودراوسێ •
١٦ــ دەرو ژوور •
١٧ــ دەرهاتن •
١٨ــ دەرهاویشتن •
١٩ــ دەرکردن ــ دەرکرد •
٢٠ــ دەرەوە •
٢١ــ دەربڕین •••

٣ـ مۆرفێمی (دەر) لەم وشانەی خـوارەوەدا ، (دەر)ی فارستییـە بەواتای (لە) و (دە)ی پرپێۆزیشنی کوردی دێت :

١ـ دەرئەنجام .

٢ـ دەرکەنار .

٣ـ دەربارە .

٤ـ دەرخوارد .

٥ـ دەرەقەت (دەرهەق) .

٤ـ وشەی (دەرۆن) لە (ئەندەرۆن)ی فارستییەوە هاتوە بە واتـای ( ژوورەوە ـ برهان قاطع ) .

٥ ـ وشەی ( دەرەبەگ ) بەلای لیژنەوە رۆن نییە لـە چییـەوە هاتوە .

٦ ـ وشەی ( دەرفەت ) و ( دەرەتان ) بە پێی واتایان هەڵدەگرن لـە مۆرفێمی (دەر) و زیادییەك پێـكهاتبن ، بـەلام نـازانرێت لـە بنەڕەتدا زیادییەکەی ( فەت ) و ( تان )چین .

٧ ـ مـۆرفێمی ( دەر ) لـە وشـەی ( دەربردن )دا موناقەشـە هەڵدگرێت ، ئایا بۆتە پێشگر یاخوت واتـای تەواوی زەرفیەتی هەیە ، لێرەدا تێبینییەکی گرنگ ئەوەیە کە کاری ( دەربردن ) بریتیە لە مۆرفێمی (دەر) و کاری (بردن) کە تێپەڕە بـەلام واتـای تێکڕای وشـەکە بەرەو تێنەپەڕ رۆییوە ، هەرچەند لەگەردانیشدا بە تێپەڕی ماوەتەوە ، وەك کـە دەگوترێت :

| | |
|---|---|
| دەرم بری | دەرمان بڕی |
| دەرت بڕی | دەرتان بڕی |
| دەری بڕی | دەریان بڕی |

وەك دەشزانین یەکێك لەخاسیەتەکانی ( پێشگر ) ئەوەیە کە تەدەخول لە سروشتی تێپەڕی و تێنەپەڕی کار ناکات ، واتا نە تێپەڕ دەکات بە تێنەپەڕ ، وە نەتێنەپەڕ دەکات بە تێپەڕ ، ناوناوەیەکی یەکجار دەگمەن نەبێت ، ئەویش لە هەندێ شێوەی بەکارهێنانی تاك تاکی ئەو پێشگرانەدا کاری تێپەڕ لە واتادا بەرەو تێنەپەڕ دەڕوات بەنموونە : یەکێك لە واتاکانی وشەی (هەڵکردن) تێنەپەڕە • وەك دەشزانین ( هەڵکردن ) بە واتای ( پێکردن ، بەرزکردنەوە ) تێپەڕە • ئەنجا ئەگەر بڵێین ( دەربردن ) بریتییە لە ( دەر )ی زەرف و کاری ( بردن ) ، دەشێ زەرفەکە خۆی بۆبێتە بەرکاری کارەکە،بەڵام ئەگەر گوتمان (دەر) پێشگرە ئەم (توجیە)ە بە دەستەوە نامێنێت چونکە وەك دەزانین پێشگرنابێتە بەرکار (مفعول) ، لەگەڵ ئەم تێبینیانەشدا ئەو ڕاستیە هەر دەمێنێتەوە کە ( دەربردن ) زۆر گومانی لێدەکرێت کە بەهۆی پێشگرەوە بۆبێتە کاری داڕێژراو •

بەو پێیە لیژنە لەو باوەڕەدایە کە وا جگە لە وشەی ( دەربڕین ) ئەوانیتر هیچ کامێکیان گومانی ئەوەیان لێناکرێت مۆرفێمی (دە) تێیاندا پێشگر بێت •

( بێ ) مۆرفێمی سەر :

لیژنە ئەم لیستەیەی خوارەوە لەو وشانەی کە بە مۆرفێمی ( سەر ) دەستی پێکراوە لە فەرهەنگەکانی ( خاڵ ، مەهاباد ، ئەستێرەگەشە ، توفیق وەهبی ) گرد کردەوە :

١ ــ سەر ئاسنین ( سەر ئاسن )

٢ ــ سەر ئاسنە

٣ ــ سەراو ( سەراوکردن )

٤ ــ سەرئێشە
٥ ــ سەراپا ( سەرتاپا )
٦ ــ سەراپیتە ( سەقف )
٧ ــ سەراسۆیی ( تفقد )
٨ ــ سەراسەر ( سەرانسەر )
٩ ــ سەرتاسەر
١٠ــ سەراسی ( سەرئێشە )
١١ــ سەرەك ، سەرۆك ، سەراك ( زعیم ، رئیس ، قائد )
١٢ــ سەرەنوێلك ، سەرانگوێلك ، سەرەنگوێلك
١٣ــ سەرانە ( سەرانەسەندن )
١٤ــ سەراورد ( في البدایه ، سابقاً ، قدیماً )
١٥ــ سەربار
١٦ــ سەرباز
١٧ــ سەرباس
١٨ــ سەرباقی
١٩ــ سەربال
٢٠ــ سەربان
٢١ــ سەربڕین
٢٢ــ سەربزێو ( سەربزێوی )
٢٣ــ سەربلند
٢٤ــ سەربورد ( سەربوردنامە = سیرة )
٢٥ــ سەربەسەر
٢٦ــ سەربەتال

٢٧ـ سەربەخۆ ( سەربەخۆیی )
٢٨ـ سەربەدەرەوە
٢٩ـ سەربەرز ( سەربەرزی )
٣٠ـ سەربەرەڵاّ
٣١ـ سەرە ( مریشکی سەرە )
٣٢ـ سەربەرەوخوار ( سەربەرەوخوارە ، سەربەرەوخوارکە )
٣٣ـ سەربەرەوژوور ( سەربەرەوژوورە ، سەربەرەوژوورکە )
٣٤ـ سەربەرەوژێر ( سەربەرەوژێرە ، سەربەرەوژێرکە )
٣٥ـ سەربەست
٣٦ـ سەربەکلاّوە ( مطر ذو قطرات کبیرة )
٣٧ـ سەربەگۆبەند
٣٨ـ سەربەگوماکردن
٣٩ـ سەربەگێچەڵ
٤٠ـ سەرمۆر ( سەربەمۆر )
٤١ـ سەربەند
٤٢ـ سەربەهەوێ
٤٣ـ سەربێشکە
٤٤ـ سەرپاچ
٤٥ـ سەرپاك
٤٦ـ سەرپاڵە
٤٧ـ سەرپڕ
٤٨ـ سەرپزو
٤٩ـ سەرپشك

٥٠ــ سەرپۆتکردن
٥١ــ سەرپۆش
٥٢ــ سەرپەتی
٥٣ــ سەرپەرچەم
٥٤ــ سەرپەرژان
٥٥ــ سەرپەرشت ( سەرپەرشتکردن )
٥٦ــ سەرپەڕ
٥٧ــ سەرپەڕە
٥٨ــ سەرپەل
٥٩ــ سەرپەڵە
٦٠ــ سەرپەنجە
٦١ــ سەرپێ سپاردن
٦٢ــ سەرپێچ
٦٣ــ سەرپێچانەوە
٦٤ــ سەرپێوەنان
٦٥ــ سەرپێیی
٦٦ــ سەرپیاکردن
٦٧ــ سەرپێوەبوون
٦٨ــ سەرتا ( فاكهة في رأس السلة )
٦٩ــ سەرەتا
٧٠ــ سەرتاپا
٧١ــ سەرتاش
٧٢ــ سەرتاشین

٧٣ـ سەرتاڵ ( بۆ دەزو )
٧٤ـ سەرتـــل
٧٥ـ سەرتۆپ
٧٦ـ سەرتوند
٧٧ـ سەرتوێ (سەرتوێژ)
٧٨ـ سەرتەرز
٧٩ـ سەرتەزێن ( سەرتەزین )
٨٠ـ سەرتەنگ
٨١ـ سەرتەنور
٨٢ـ سەرتێ کردن
٨٣ـ سەرتیاچوون
٨٤ـ سەرتیپ
٨٥ـ سەرتیل
٨٦ـ سەرجل
٨٧ـ سەرجەم
٨٨ـ سەرجەنجاڵ
٨٩ـ سەرچاوە
٩٠ـ سەرچـــڵ
٩١ـ سەرچۆپی ( سەرچۆپی کێش )
٩٢ـ سەرچەوت ( سەرچەوتی )
٩٣ـ سەرخستن
٩٤ـ سەرخۆش ( سەرخۆش کردن ، سەرخۆشی )
٩٥ـ سەرخۆشی لێ کردن

٩٦ــ سەرخواردن ( سەرخۆر )
٩٧ــ سەرخوران ( سەرخوراندن )
٩٨ــ سەرخەو ( سەرخەوشکاندن )
٩٩ــ سەرخێڵ
١٠٠ــ سەرداخستن
١٠١ــ سەردار
١٠٢ــ سەردان
١٠٣ــ سەردانەوان ( سەردانەواندن )
١٠٤ــ سەرداهێنان
١٠٥ــ سەردڕ
١٠٦ــ سەردەرچوون
١٠٧ــ سەردەرکردن
١٠٨ــ سەردەرگا
١٠٩ــ سەردەرهێنان
١١٠ــ سەردەست
١١١ــ سەردەستە
١١٢ــ سەردەفتەر
١١٣ــ سەردەق
١١٤ــ سەردەم
١١٥ــ سەرڕاست
١١٦ــ سەر ڕەق ( سەرڕەقی )
١١٧ــ سەرڕێژ ( سەرڕێژکردن )
١١٨ــ سەرزاریی

١١٩ــ سەرزەمین
١٢٠ــ سەرزەنشت (سەرکوتکردن ــ عتاب)
١٢١ــ سەرزین
١٢٢ــ سرژمار (سەرژمێر ، سەرژماردن ، سەرژمێری)
١٢٣ــ سەرژنانی
١٢٤ــ سەرسام (سەرسامکردن ، سەرسامبوون)
١٢٥ــ سەرسپاردن
١٢٦ــ سەرسپی (پیاوی سەرسپی)
١٢٧ــ سەرسم (سەرسمی وڵاغ)
١٢٨ــ سەرسمدان
١٢٩ــ سەرسوڕمان
١٣٠ــ سەرسوتان ( سەرسوتاو ... )
١٣١ــ سەرسوکبوون ( سەرسوك ، سەرسوکی )
١٣٢ــ سەرسەخت
١٣٣ــ سەرسەنگ
١٣٤ــ سەرشار
١٣٥ــ سەرشتن
١٣٦ــ سەرشۆڕ ( سەرشۆڕکردن ، سەرشۆڕبوون )
١٣٧ــ سەرشۆك ( سەرشۆرك )
١٣٨ــ سەرشێت (سەرشێتکردن ، سەرشێتبوون)
١٣٩ــ سەرشێوان (سەرلێ شێوان)
١٤٠ــ سەرفراز ( سەرفەراز )
١٤١ــ سەرفترە ( سەرفترەدان )

١٤٢ـ سەرقاپ ( سەرقاپنانەوە )

١٤٣ـ سەرقاڵ (سەرقاڵکردن ـ سەرقاڵبوون)

١٤٤ـ سەرقۆتی

١٤٥ـ سەرقۆڵ

١٤٦ـ سەرقوڵە ( نوع من العنب )

١٤٧ـ سەرقەبران

١٤٨ـ سەرقەبلاّن ـ سەرقەبلاّندن

١٤٩ـ سەرقەپاغ

١٥٠ـ سەرقەڵەم

١٥١ـ سەرقەڵەمانە

١٥٢ـ سەرکار

١٥٣ـ سەرکانی (دانیشتنی سەرکانی خۆشە)

١٥٤ـ سەرکردن (نەپێکانی هەدەف)

١٥٥ـ سەرکردن بەگۆما (سەربەگۆماکردن)

١٥٦ـ سەرکردنەسەر

١٥٧ـ سەرکردە

١٥٨ـ سەرکز (سەرکزی)

١٥٩ـ سەرکڵاو (سەرکڵاوە)

١٦٠ـ سەرکلۆم

١٦١ـ سەرکۆنە ( توبیخ ، لوم )

١٦٢ـ سەرکۆزەر

١٦٣ـ سەرکوێر

١٦٤ـ سەرکۆمار

١٦٥ـ سەرکوێر
١٦٦ـ سەرکولم (سەرکولمی ئاڵ)
١٦٧ـ سەرکورتان (سەرکۆپان)
١٦٨ـ سەرکەچ
١٦٩ـ سەرکەش
١٧٠ـ سەرکەف (سابونی سەرکەف)
١٧١ـ سەرکەل
١٧٢ـ سەرکەلە
١٧٣ـ سەرکەوتن (سەرکەوتو)
١٧٤ـ سەرکێش ( سەرکێشی ، سەرکێشان )
١٧٥ـ سەرگران
١٧٦ـ سەرگرتن
١٧٧ـ سەرگروشتە (سەرگوزەشتە)
١٧٨ـ سەرگوڵ
١٧٩ـ سەرگەردان
١٨٠ـ سەرگەرد (بە سەرگەردت بم)
١٨١ـ سەرگەرم
١٨٢ـ سەرگەڕ
١٨٣ـ سەرگەورە
١٨٤ـ سەرلق
١٨٥ـ سەرلەئێوارێ ـ سەرلەنوێ ، سەرلەبەیانی
١٨٦ـ سەرلەشکر
١٨٧ـ سەرلێبادان (عدم الرضا ، عدم الموافقة)

١٨٨ــ سەرلێتێکدان

١٨٩ــ سەرلێخوران

١٩٠ــ سەرلێدان

١٩١ــ سەرلێدەرکردن

١٩٢ــ سەرلێسەندن

١٩٣ــ سەرلێشێوان (سەرلێشێواندن)

١٩٤ــ سەرمایە (سەرمایەدار ، سەرمایەداری)

١٩٥ــ سەرمل (سەرملە)

١٩٦ــ سەرمەست

١٩٧ــ سەرمەشق

١٩٨ــ سەرمەقۆلات

١٩٩ــ سەرمێز

٢٠٠ــ سەرەمێکوتە

٢٠١ــ سەربەکونەوەنان (سەرنان بەکونەوە)

٢٠٢ــ سەرنانەسەر

٢٠٣ــ سەرنانەوە

٢٠٤ــ سەرناوکانە (ناوکەبڕانە)

٢٠٥ــ سەرنخون (سەرەونخۆن)

٢٠٦ــ سەرنــزم

٢٠٧ــ سەرنگوبۆن

٢٠٨ــ سەرنــۆس

٢٠٩ــ سەرنەرم

٢١٠ــ سـەرۆ
٢١١ــ سەروبن
٢١٢ــ سەروبـۆر
٢١٣ــ سەروبەر
٢١٤ــ سەروپۆتەڵاك
٢١٥ــ سەروپێ ( سەروپێچك )
٢١٦ــ سەروپێـچ
٢١٧ــ سەروچـاو
٢١٨ــ سەرومڕ
٢١٩ــ سەروزیـاد
٢٢٠ــ سەروسەخت (ساخت)
٢٢١ــ سەروسەکوت
٢٢٢ــ سەروشوێن
٢٢٣ــ سەروسەمەنە
٢٢٤ــ سەرومـاڵ
٢٢٥ــ سەروگوێلاك ( سەروگێلاك )
٢٢٦ــ سەروەر
٢٢٧ــ سەروەستا
٢٢٨ــ سەرهەڵبڕین
٢٢٩ــ سەرهەڵدان
٢٣٠ــ سەرخوار ، سەرخوارکە ، سەرەوخوارە
٢٣١ــ سەرەژۆر ، سەرەوژۆر ، سەرەوژۆرە
٢٣٢ــ سەرەوکار

٢٣٣ـ سەرەولێژ ، سەرەولێژە
٢٣٤ـ سەرەونخون (سەرنخون)
٢٣٥ـ سەرەونگومبون ( سەرەونگومکردن )
٢٣٦ـ سەریـــن
٢٣٧ـ سەرهەڵگرتن
٢٣٨ـ سەرەند (سەرەنگ) سەرەو
٢٣٩ـ سەرهەنگ (عقيد في الجيش)
٢٤٠ـ سەرهەوير (سەروير ، سەرەويرك)
٢٤١ـ سەرهێنان
٢٤٢ـ سەرەتا
٢٤٣ـ سەرتاتکێ
٢٤٤ـ سەرەتەشێ
٢٤٥ـ سەرەخۆرە
٢٤٦ـ سەرەخولێ
٢٤٧ـ سەرخەو
٢٤٨ـ سەرەڕا
٢٤٩ـ سەرەڕۆ
٢٥٠ـ سەرەڕێ
٢٥١ـ سەرەسوڕە
٢٥٢ـ سەرەشکێنە
٢٥٣ـ ســـەرەکێ
٢٥٤ـ سەرەمژان
٢٥٥ـ سەرەمەرگ

٢٥٦ــ سەرەمەقەست

٢٥٧ــ سەرەمێکوت

٢٥٨ــ سەرەناز (سەرئەنداز)

٢٥٩ــ سەرەنجام (سەرئەنجام)

٢٦٠ــ سەرەنگرێ (السقوط علی الرأس)

٢٦١ــ سەرلێتێکچوْن

لیژنە بۆی دەرکەوت کەوا مۆرفێمی (سەر) لە هەمۆ وشەکاندا وەك کەرتێکی واتادار وشەی ناسادە (داڕژاو و لێکدراو)ی دروست کردوە لەبەر ئەمە ناشێ لەو وشانەدا مۆرفێمی (سەر) بە پێشگر حساب بکرێت ، چونکە مەرجی بنجی پێشگربوْن ئەوەیە واتای نەبێت •

وەك بە سەرنج دەردەکەوێت مۆرفێمی (سەر) لەو وشانەدا بەم واتایانەی خوارەوە هاتوە :

١ــ بە واتای (رأس)ی عەرەبی • بەنموْنە :

سەرتاش

سەرسام

سەرشۆڕ

سەرسپی

سەرکێش

٢ــ بە واتای ( علی ، فوق )ی عەرەبی دێت ، بەنموْنە :

سەرکەوتن

سەرپۆش

سەراو

سەربان

سـەرو

سەراسۆیی

سەرزەمین

٣ـ بەواتای ( بدایة الشیء ، اول شیء ) ، وەك :

سەرەتا

سەرەتاڵ

سەرلەئێواری

سەرلەبەیانی

سـەرپەڕ

سەرخەوشکاندن

هەروەها پێویستە تێبینی ئەو ڕاستیانەی خوارەوەش بکرێت :

١ـ مۆرفێمی (سەر) دەکەوێتە پێش (ناو)ەوە وشەیێکی لێکدراو دروست دەکات ، وەك :

سەرپەنجە

سەرهەویر

سەرپێشکە

سەرباڵ

٢ـ مۆرفێمی (سەر) دەکەوێتە پێش (ئاوەڵناو)ەوە و وشەیێکی لێکدراو دروست دەکات ، وەك :

سەربڵند

سەربەتاڵ

سەربەرەڵڵا

سەرتەنگ
سەرچەوت

٣ــ مۆرفێمی (سەر) پاشگری بە دوادا دێت و وشەی داڕژاو دروست دەکات ، وەك :

سەرە ( ە )
سەرۆك ( ۆك )
سەرۆك ( ۆ )
سەرین ( ین )
سەروەر ( وەر )
سەرەکی ( ەکی )
سەرانە ( انە )

٤ ــ مۆرفێمی ( سەر ) دەکەوێتە پێش ڕەگی کارەوەو وشەیێکی لێکدراو دروست دەکات ، وەك :

سەرپێچ ( پێچ )
سەرکێش ( کێش )
سەرتاش ( تاش )
سەرپۆش ( پۆش )
سەردڕ ( دڕ )
سەرکوت ( کوت )
سەرژمێر ( ژمێر )
سەرتوس ( توس )
سەرناس ( ناس )

لەم نموونانەی بەندی (٤) دەردەکەوێت مۆرفێمی ( سـەر ) لەگەڵ رەگی کـار بـە زۆریی ناوی ( کارای لێـکدراو ) دروسـت دەکـەن ، ناوناوەیەکیش ناوی ( بەرکـار ) پێکدەهێنێـت ، لە نمـونەکاندا تەنیا (سەردز) و (سەرکوت) ناوی بەرکان •

٥ ــ مۆرفێمی ( سەر ) بەهۆیلکێنـەری پرپیۆزیشـنەوە لەگەڵ مۆرفێمکیتردا وشـەیێکی لێکدراو دروستدەکات ، وەك :

سەرتاسەر

سەرتاپا ( سەراپا )

سەربەسەر

سەربەهەوێ

سەربەدەرەوە

سەربەگۆبەند

سەربەگۆماکردن

سەربەگێچەڵ

سەرلەبەیانیێ

سەر لە نوێ

سەر لە ئێوارێ

سەر لەبەر

هەروەها مۆرفێمی ( سەر ) دەکەوێتە پێش ئەو پێشگرانەی کە لـە بنەڕەتـدا پرپیۆزیشـن بون ، وەك :

سەر لێشێوان

سەر پێسپاردن

سەر پێداکردن
سەر پێوەبوون
سەر تێکردن
سەر لێ دەرکردن
سەر پێ شۆڕکردن
سەر پێ دانەواندن
سەر لێبادان
سەر لێ تێکدان
سەر لێدان
سەر تێکردن

٦ ـ مۆرفیمی ( سەر ) بە هۆی ( و ) عطفەوە لەگەڵ مۆرفیمێکیتردا وشەیێکی تازە دروست دەکەن ، وەك :

سەروبن
سەروبەر
سەروپێ
سەروپێچ
سەروپۆتەلاك
سەرموش
سەرومڕ
سەروچاو
سەروزیاد
سەروسەکوت

٧ ــ ئەم مۆرفێمە ( سەر ) شێوە بە کارهێنانی تریشی هەیە لە پێك هێنانی وشەدا ، وەك :

أ ــ ( ەو ) : سەرەولێژ
سەرەونخون
سەرەوخوار
سەرەوژوور

ب ــ ( ان ) : سەرانسەر
سەرانگوێلك ( لەلای رانیە بە ــ گوفەك ــ دەڵێن )

جـ ــ ( ە ) : سەرەڕۆ
سەرەدەری
سەرەتاتکە
سەرەتەشی
سەرەمەرگ

( جیم ) مۆرفێمی ( لا ) :

لیژنە ئەم لیستەیەی خوارەوەی لەو وشانەی کە بە مۆرفێمی ( لا ) دەستی پێکراوە لە فەرهەنگەکانی ( خاڵ ، مەهاباد ، توفیــق وەهبــی ، ئەستێرەگەشە گردکردەوە ..

١ ــ لابار
٢ ــ لابردن
٣ ــ لابەلا
٤ ــ لاپاڵ

٥ ــ لاپواز
٦ ــ لاپلار
٧ ــ لاپەڕە
٨ ــ لاپێچ
٩ ــ لاتریسکە
١٠ــ لاتەریك
١١ــ لاجانگ
١٢ــ لاچوون
١٣ــ لاخستن
١٤ــ لادان
١٥ــ لادەر
١٧ــ لاڕێ
١٨ــ لاسار
١٩ــ لاسوورە
٢٠ــ لاسەنگ
٢١ــ لامژ
٢٢ــ لاکوت
٢٣ــ لاکردنەوە
٢٤ــ لاکێش (لاکێشە)
٢٥ ــ لاکەوتن
٢٦ــ لاگیرە
٢٧ــ لالغاوە
٢٨ــ لالوت

٢٩ـ لادزگه
٣٠ـ لامل
٣١ـ لاڕەشه

بەلای لیژنەوه مۆرفیمی ( لا ) لەو وشانەدا به واتای ( تەنیشت = طرف ) هاتون ، هەرچەند لەگەل کاردا پتر جۆش خواردو دەبێت ، وەك له وشەی ( لابردن )دا بەدیار دەکەوێت ، بەو پێیە ناشێ به پێشگر حساب بکرێت چونکه وەك له تەعریفیدا گوتراوه ، پێشگر مۆرفیمێکه واتای سەربه خۆی نییه . وەك له وشەکانی لیستەکەوه دەردەکەوێت مۆرفیمی ( لا ) لەگەڵ ئەم جۆره وشانەدا دێت :

١ ـ لەگەڵ ( ناو )دا ، وەك :
لابار
لادێ
لاڕێ
لاسەنگ

٢ ـ لەگەڵ ناوی ( جێ )دا ، وەك :
لاپاڵ
لاجانگ
لادزگه

٣ ـ لەگەڵ ( کار )دا ، وەك :
لادان
لابردن
لاچوون

لاخستن
لاکەوتن

٤ ــ لەگەڵ ( رەگی کار )دا ، وەك :
لاپێچ
لاکێش ( لاکێشە )
لامژ
لاگیرە

٥ ــ لەگەڵ ( ئاوەڵناو )دا ، وەك :
لاسوورە
لاڕەشە

٦ ــ لەتاکە وشەی ( لابەلا )دا لەگەڵ پریپۆزیشنی ( بە )دا هاتوە •

٧ ــ لە تاکە وشەی ( لالێکردنەوە ) لەگەڵ پێشگری ( لێ )دا هاتوە کە بە ئەسڵ پریپۆزیشنە •

(دال) مۆرفێمی (ژێر) :

لیژنە ئەم لیستەیەی خوارەوەی لەو وشانەی کە بە مۆرفێمی ( ژێر ) دەستی پێ‌کراوە لە فەرهەنگەکانی ( خاڵ ، مەهاباد ، توفیق وەهبی ، ئەستێرەگەشە ) کۆکردەوە :

١ ــ ژێراو ( ژێراو )
٢ ــ ژێرپێ
٣ ــ ژێر پیاڵە
٤ ــ ژێر چەپۆك

٥ ــ ژێرچەنە ( ژێرچەناگە )
٦ ــ ژێرخان
٧ ــ ژێرخستن
٨ ــ ژێردەست
٩ ــ ژێرڕایەخ
١٠ــ ژێرزەمین
١١ــ ژێرکراس
١٢ــ ژێرکەوتن
١٣ــ ژێرماڵ ( ژێرماڵە )
١٤ــ ژێرۆ ، ژێرە ، ژێرین

بەلای لیژنەوە مۆرفیمی ( ژێر ) لەو وشانەدا بە پێشگر حساب ناکرێت ، چونکە وەك لە تەعریفیدا گوتراوە پێشگر مۆرفیمێکە واتای سەربەخۆی نییە • وە ئەم مۆرفیمە :

١ ــ لەگەڵ ( ناو )دا بەکاردەهێنرێت ، وەك :
ژێرپیاڵە
ژێرچەپۆك
ژێر زەمین
ژێر کراس

٢ ــ لەگەڵ (کار)دا بەکاردەهێنرێت ، وەك :
ژێر خستن
ژێر کەوتن

٣ ــ لەگەڵ ( پاشگر )دا بەکار دەهێنرێت ، وەك :

ژێرۆ ( ۆ )
ژێرین ( ین )
ژێره ( ه )

له کرمانجیێ ژۆرۆدا مۆرفێمـــی ( ژێر ) ناکەوێتە ســـەرەتای وشەوە ــ گەر هەشـــبێت زۆر کەمە ــ بەڵام بە زۆریێ دەکەوێتە دوای وشەوە ، وەك :

بنواری ژێر
ڕۆبـــاری ژێریێ

( هێ ) ــ مۆرفێمی ( خوار = أسفل ) :

لیژنه له دواپشـــكنینی فەرهەنگەکانی ( خاڵ ، مەهابـــاد ، توفیق وەهبیێ ، ئەستێرەگەشە ... ) ئەم وشانەی خوارەوەی بەرچاو کەوت و لەم لیستەیەدا کۆی کردنەوەو هیچیان پێشگرنین :

١ ــ خوار
٢ ــ خوارۆ
٣ ــ خوارین
٤ ــ خاریێ یان خاریێ ( له شێوەی کرمانجی ســـەرۆدا ) ، وەك :

خاریێ ماڵا ( ژۆری ماڵا )

(واو) مۆرفێمی ( ژۆر = أعلى ) :

لیژنه تەنیا وشەی ( ژۆر ، ژۆرۆ ، ژۆرکەوتن )ی بەرگیر کەوت ، وەئەم مۆرفێمە له هیچیاندا پێشگرنییە .

(زێ) مۆرفێمی (کن) :

لیژنه تەواوی فەرهەنگەکانی پشکنی جگە لە مۆرفێمی ( کن ) خۆی بەوەلاوە هیچیتری نەدیتەوە ، ئەمەش بەڵگەیە بۆ رەتکردنەوەی ئەوانەی کــە دەڵێن ئەم مۆرفێمە دەتوانێت ببێتە پێشگر •

(حێ) مۆرفێمی (دوا) :

لیژنە بە فەرهەنگە کوردییەکاندا بۆ دۆزینەوەی ئەم مۆرفێمە گەڕا، ئەمانەی هاتەبەر و تۆماریکردن :

١ ــ دوا
٢ ــ دوائەنجام
٣ ــ دوابەدوا
٤ ــ دواخستن
٥ ــ دوادوایی
٦ ــ دوابڕاو
٧ ــ دوارۆژ
٨ ــ دوا کەوتن ( دواکەوتوو )
٩ ــ دوا هاتن
١٠ــ دوایەك ( دوایەکی )
١١ــ دوایی
١٢ــ دوایی پێهێنان

مۆرفێمی ( دوا ) لەو وشانەدا بە پێشگر دانانرێت ، چونکە بــەر تەعریفی پێشگر ناکەوێت ، وە لەگەڵ ئەم وشانەی خوارەوەدا دێت :

١ ــ لەگەڵ ( ناو )دا ، وەك :

دوا ئەنجام
دوارۆژ

٢ ــ لەگەڵ ( کار )دا ، وەك :
دواخستن
دواهاتن
دوا کەوتن

٣ ــ پرێپۆزیشنی ( بە )ی بە دوادا دێت ، وەك :
دوابەدوا

٤ ــ لەگەڵ ( پاشگر )دا دێت ، وەك :
دوایی ( یی )
دوایەکی ( دوا ÷ ی + ەکی )

٥ ــ لەگەڵ موشتەقاتی ( کار )دا ، وەك :
دوابڕاو
دواکەوتو
دواخراو

(طێ) ــ مۆرفێمی ( پێش ) :

لیژنە لە فەرهەنگەکانی ( خاڵ ، مەهاباد ، توفیق وەهبی ، ئەستێرە گەشە ٠٠٠٠ ) ئەم وشانەی دیتەوە کە بە مۆرفێمی ( پێش ) دەستیان پێکراوە ، وشەکانیش ئەمانەن :

١ ــ پێشاو
٢ ــ پێشبەست

٣ ــ پێش‌بین ( پێش بینیی )
٤ ــ پێش خزمەت
٥ ــ پێش‌نوێژ
٦ ــ پێش خستن
٧ ــ پێش‌دان ( پێشان )
٨ ــ پێشڕەو
٩ ــ پێشەکیی ( مقدمة )
١٠ــ پێشکەش
١١ــ پێشپرتك ( پێشگر = سابقة )
١٢ــ پێش‌کەوتن ( پێش‌کەوتوو )
١٣ــ پێشگا ( حضور ، وجود ، مقام )
١٤ــ پێشگر ( سابقة )
١٥ــ پێش‌گرتن
١٦ــ پێش پێگرتن
١٧ــ پێش‌مەرگە
١٨ــ پێشنیاز
١٩ــ پێشنیار
٢٠ــ پێشواز ( پێشوازیی )
٢١ــ پێشوو
٢٢ــ پێشەسەر
٢٣ــ پێشەکیی
٢٤ــ پێشەڵ
٢٥ــ پێشەم ( مهم )

٢٦ــ پێشەنگ ( پێش ئاهەنگ )

٢٧ــ پێشەوا

٢٨ــ پێشین ، پێشینان ، پێشینە

بەلای لیژنەوە ئەم مۆرفێمەش ( پێش ) لەو وشانەی لیستەکەدا وەك مۆرفێمەکانی ( ژێر ، ژوور ، کن ، دوا ... ) پێشگر نییە ، چونکە لە هەمواندا واتای سەربەخۆی هەیە . وەك بەسەرنج گرتن لە لیستەکە دەردەکەوێت بەکارهێنانی مۆرفێمەکە لەگەڵ ئەم بابەتانەدا دەبێت :

١ ــ لەگەڵ ( ناو )دا بەکاردەهێنرێت ، وەك :

پێشاو
پێش‌نوێژ
پێشکۆ
پێش‌مەرگە

٢ ــ لەگەڵ ( کار )دا بەکاردەهێنرێت ، وەك :

پێش‌خستن
پێش‌کەوتن
پێش‌گرتن

٣ ــ لەگەڵ ( ڕەگی‌کار )دا بەکاردەهێنرێت ، وەك :

پێش‌بەست
پێش‌بین
پێش‌ڕەو
پێشکەش

٣ ــ لەگەڵ ( پاشگر )دا بەکاردەهێنرێت ، وەك :

پێشکا ( گا )
پێشواز ( واز )
پێشۆ ( ۆ )
پێشەکی ( ەکی )
پێشەڵ ( ەڵ )
پێشەوا ( ەوا )
پێشین ( ین )
پێشینە ( ینە )

٤ ــ دەکەوێتە پێش هەندێ لەو پێشگرانەی کە لە پرپیۆزیشنەوە هاتوون ، وەك :

پێش پێگرتن
پێش لێبڕینەوە
پێش تێکردن

٥ ــ لە شێوەی کرمانجی سەرۆدا وشەی ( پێشکێش ) بۆ مرۆڤی بەرچاو و بەڕێز بەکاردەهێنرێت • هەروەها ( پێش‌گوتن ) بە واتای ( مقدمة ، دیباجة ) بەکاردێت • دیسان لەم شێوانەشدا بەکاردێت ، وەك :

پێشڤەچۆن
پێشڤەبرن
پێشدا چۆن
پێشدا برن
پێشدا چۆن

سەرنجێکی د. ئەوڕەحمانی حاجیی مارف :

ڕاستە ، بە گوێرەی ئەو پێناسەیەی لیژنە بۆ پێشگری سازکردوە ، مۆرفێمی ( پێش ، لا ... ) نابنە پێشگر . کەچی لە وشەکانی « بەربوون ، بەردان ... »دا مۆرفێمی ( بەر ) بە پێشگر دانراوە ، بەڕای من ئەمانیش هەر بەر پێناسەکە ناکەون . جا باشتر وایە کە لیژنە یا ئـەو وشـانەش دەرهاوێت یا پێناسـەکەی فراوان بکات تا هەنـدێ حالـەتی ( پێش ، لا ... )یش ، وەك : « پێشکەش ، پێشـنیار ، لادان ، لابردن ... » بەرکەون و پتر لەگەڵ هەڵکۆڵینەوەکەدا بگونجێت .

(یێ) ـ مۆرفێمی (پاش) :

لیژنە بە فەرهەنگە کوردییەکاندا گەڕا و ئەم وشانەی هاتە بەرگیر و کۆی کردنەوە و کردنی بە لیستەیەك :

١ ـ پاش
٢ ـ پاشاخوڕ ( پاش ئاخوڕ )
٣ ـ پاشان ( پاشدان )
٤ ـ پاشبەند
٥ ـ پاشبین
٦ ـ پاشتێلانە
٧ ـ پاشەبەرە
٨ ـ پاشەڵ
٩ ـ پاشە ڕۆژ
١٠ ـ پاشە ڕۆك
١١ ـ پاشەکەوت

١٢ــ پاشەوپاش
١٣ــ پاشەکشە
١٤ــ پاشبڕێژی ( هیجاء )
١٥ــ پاش پارێز ( مؤخرة )
١٦ــ پاش خستن
١٧ــ پاش خوان
١٨ــ پاشدۆ ( مغتاب )
١٩ــ پاشڕۆ ( تابع )
٢٠ــ پاشکەوتن
٢١ــ پاشکۆ
٢٢ــ پاشگەز
٢٣ــ پاشماك ( ارث )
٢٤ــ پاشدز
٢٥ــ پاشخان ( خلفیة )
٢٦ــ پاشماڵە
٢٧ــ پاشماوە
٢٨ــ پاشملە ( پاشەملە ، پاشەملێ )
٢٩ــ پاش نێوژ
٣٠ــ پاشۆڵ
٣١ــ پاش نیوەڕۆ ( پاش نیڤەڕۆ )
٣٢ــ پاشین
٣٣ــ پاشگر
٣٤ــ پاشەلەقە

٣٥ـ پاشەلوشکە
٣٦ـ پاش باب
٣٧ـ پاش و پێش

بەلای لیژنەوە ئەم مۆرفێمەش ( پاش ) لەو وشانەی لیستەکەدا وەك مۆرفێمەکانی ( ژێر ، ژوور ، کن ، بەر ، پێش ، لا ... ) پێشگر نییە ، چونکە لە هەموواندا واتای سەربەخۆی هەیە ، وەك بە سەرنج گرتن لە لیستەکە دەردەکەوێت بەکارهێنانی مۆرفێمەکە لەگەڵ ئەم بابەتانەدا دێت :

١ ـ لەگەڵ ( ناو )دا ، وەك :

پاش نوێژ
پاشە ڕۆژ
پاش خان
پاش ملە
پاش نیوەڕۆ ( پاشنیڤەڕۆ )

٢ ـ لەگەڵ ( کار )دا ، وەك :

پاش خستن
پاش کەوتن

٣ ـ لەگەڵ ( ڕەگی کار )دا دێت ، وەك :

پاش کەوت
پاش پارێز
پاش دوو
پاشگر

٤ ــ لەگەڵ ( پاشگر )دا ، وەك :

پاشەڵ ( ەڵ )

پاشین ( ین )

پاشۆل ( ۆل )

پاشەرۆك ( ۆك )

پاشان ( ان )

٥ ــ لەگەڵ وشەی (ە) پەیوەندیی ، وەك :

پاشەڕۆژ ( پاش + ە + ڕۆژ )

پاشەبەرە ( پاش ÷ ە + بەرە )

پاشەکشە ( پاش + ە ÷ کشە )

پاشەلەقە ( پاش + ە + لەقە )

٦ ــ لەگەڵ مۆرفێمی ( و ) و مۆرفێمی ( ەو )دا ، وەك :

پاشەوپاش ( پاش ÷ ەو + پاش )

پاشوپێش ( پاش ÷ و + پێش )

(کاف) مۆرفێمی (پشت) :

١ ــ پشتاو

٢ ــ پشتاوپشت

٣ ــ پشتە

٤ ــ پشت ئەستور

٥ ــ پشتە سەر

٦ ــ پشتە سەرە

٧ ــ پشتەدەر بەو پارەیە دەگوترێت کە بۆ کردنەوەی دەرگای ماڵی

بۆك دەدرێت بەو کەسە یا بەو کۆمەڵە کەسەی دەرگاکەیان گرتوە •

٨ ــ پشتەك ( مسند • ظهیر )

٩ ــ پشتی

١٠ــ پشت چاو

١١ــ پشتدان

١٢ــ پشت ڕاست ( مطمئن )

١٣ــ پشتکوڕ ( أحدب )

١٤ــ پشتسارد ( یائس )

١٥ــ پشتشکان

١٦ــ پشتگرتن

١٧ــ پشتمل

١٨ــ پشت ملپان

١٩ــ پشتوپەنا

٢٠ــ پشتیر

٢١ــ پشتیکێش

٢٢ــ پشتێن ( پشتبەند )

٢٣ــ پشتیوان

٢٤ــ پشتیوانە ( کۆڵەکە )

بەلای لیژنەوە ئــەم مۆرفێمەش وەك ئەوانیتر پێشــگر نییە ــ بەلام لەگەڵ ئەم بابەتانەی خوارەوە بەکار دەهێنرێت :

١ ــ لەگەڵ ( ناو )دا ، وەك :

پشتمل

پشتاو
پشتچاو
پشتەسەرە
٢ ـ لەگەڵ ( کار )دا ، وەك :
پشتدان
پشتگرتن
پشتشکان
٣ ـ لەگەڵ ( ئاوەڵناو )دا ، وەك :
پشت ئەستوور
پشت ڕاست
پشت کووڕ
پشت سارد
٤ ـ لەگەڵ ( پاشگر )دا ، وەك :
پشتە
پشتەك
پشتیی
پشتیوان

(لام) مۆرفێمی (ناو) :

لیژنە بۆ دۆزینەوەی مۆرفێمی ( ناو ) بە فەرهەنگە کوردییەکاندا گەڕ و ئەم وشانەی بەرچاو کەوت و کردنی بەلیستەیەك :

١ ـ ناواخن
٢ ـ ناوان ( نێوان )

٣ ــ ناوەڕاست

٤ ــ ناوەرۆك

٥ ــ نـاوە

٦ ــ ناوەکی

٧ ــ ناوەند ( ناوەندیار )

٨ ــ ناوبڕ ( ناوبڕە = حاجز )

٩ ــ ناوبژی

١٠ــ ناوچەوان

١١ــ ناوبژە ( أسنان امامية لذوات الحافر )

١٢ــ ناوپارە

١٣ــ ناوبار

١٤ــ ناوپنچك ( الحجاب الحاجز )

١٥ــ ناوجێ

١٦ــ ناوسێڵ ( ناوساجی )

١٧ــ ناوتوێژ

١٨ــ ناوتەنگە ( ناڤتەنگە )

١٩ــ ناوچەوان

٢٠ــ ناوماڵ

٢١ــ ناوچە

٢٢ــ ناوخۆ ( ناڤخۆ )

٢٣ــ ناودەست ( خادم ــ بادینانی )

٢٤ــ ناوزگ

٢٥ــ ناوشان

٢٦ـ ناوقەد
٢٧ـ ناووك ( ناووکە )
٢٨ـ ناوکەند
٢٩ـ ناوکۆ ( مشترك )
٣٠ـ ناوگەڵ
٣١ـ ناولەپ
٣٢ـ ناولنگ
٣٣ـ ناومل ( ناڤمل = ناوشان )
٣٤ـ ناوناوە ( ناوەناوە )
٣٥ـ ناوەنجی
٣٦ـ ناوێژە ( باطن )
٣٧ـ ناوکار ( حشو الجدار )
٣٨ـ ناوبەند ( ناڤبەند )
٣٩ـ ناوڕێ
٤٠ـ ناوك ڕێژە ( ناوەندی پشتی وڵاغ )
٤١ـ ناوکێڵ ( ناڤکێڵ )
٤٢ـ ناڤبڕ ( حاجز )
٤٣ـ ناڤبارك ( ناوبار )
٤٤ـ ناڤچی ( ناوەڕاست )
٤٥ـ ناڤچیگار ( محور ، مرکز )
٤٦ـ ناڤنێری ( کاکڵ )
٤٧ـ ناڤسەر ( تەپڵی سەر )
٤٨ـ ناولەش

بەلای لیژنەوە ئەم مۆرفیمەش وەك مۆرفیمەکانی‌تری ( سەر ، ژێر ، ژوور ، کن ، بەر ، پێش ... ) بە پێشگر دانانرێت ، وە لەگەڵ ئەم بابەتانەشدا دێت :

١ ــ لەگەڵ (ناو)دا دێت ، وەك :

ناوماڵ

ناوزێ

ناولەپ

ناوتوێژ

ناودەست

ناوشان

٢ ــ لەگەڵ ڕەگی ( کار )دا دێت ، وەك :

ناوبەند

ناڤبڕ

ناوکێڵ

ناوکرێژە

٣ ــ لەگەڵ ( پاشگر )دا دێت ، وەك :

ناوان ( ان )

ناوە ( ە )

ناوەند ( ەند )

ناوك ( ك )

ناوەکی ( ەکی )

ناوچە ( چە )

٤ ـ «ە» ی پەیوەندیی بەدوادا دێت ، وەك :

ناوەناوە

ناوەڕاست

لیژنە لەم لیستەیەدا تەنیا ئەو وشـانەی ریزکرد کە مۆرفێمی (نـاو) تێیاندا بە واتای (ضمن ، داخل) دێت ، مۆرفێمی (ناو) بە واتای ( اسم = Name, noun بەر ئەم لێکۆلینەوەیە ناکەوێت ، لەبەر ئەمە وشەی وەك (ناودار ، ناوبانگ ، ناوبردن ، ناونان ...) باسیان لێ نەکرا .

(میم) مۆرفێمی (بن) :

لیژنە بۆ دۆزینەوەی ئەو وشانەی بە مۆرفێمی (بن) دەست پێ‌دەکات، هەمۆ فەرهەنگە کوردییەکان گەڕا و ئەم وشـانەی خـوارەوەی کرد بـە لیستەیەك بۆ لێکۆلینەوە :

١ ـ بن

٢ ـ بناچە (بنەچە)

٣ ـ بناغە

٤ ـ بنـار

٥ ـ بنـاو

٦ ـ بناوان (بنەوان)

٧ ـ بنـە

٨ ـ بنەبان (انتهاء)

٩ ـ بنەبڕ (بنبڕ)

١٠ـ بنەتـار (أجداد)

١١ـ بنچینە

١٢ــ بنەدار

١٣ــ بنەڕەت

١٤ــ بنەگە ( منزل )

١٥ــ بنەماڵە

١٦ــ بنەمێو

١٧ــ بنباخەڵ

١٨ــ بنبۆ

١٩ــ بنپــاڵ

٢٠ــ بنبەرگ

٢١ــ بنەتۆو

٢٢ــ بنەگۆزەلە ، بنەگۆزەروان

٢٣ــ بنەمــا

٢٤ــ بنمیخ

٢٥ــ بندانەوە

٢٦ــ بنۆلــە

٢٧ــ بنبەردەقیلە

٢٨ــ بنــاگوێ

٢٩ــ بنەتــوڵ

٣٠ــ بنــکە

٣١ــ بنەگوێز ، بنەتۆ ...

٣٢ــ بنکڕ

٣٣ــ بنەمۆم

٣٤ــ بنبەرکرن (بنبەردکردن = کوشتن)

٣٥ــ بنگرە (جۆرە بەفرێکە)
٣٦ــ بنچوون (هەژاربوون)
٣٧ــ بنبرن (بنبردن = فێڵ لێکردن)
٣٨ــ بنەدار ( بنەوان = سەرگەورەی ماڵ)
٣٩ــ بندان (ئاردەساوەر)
٤٠ــ بنگوهك (بن گوێ)
٤١ــ بنگرتن
٤٢ــ بندڕیای (مفلس ، نابوت)
٤٣ــ بنبەردان ( بن‌دەرکەوتن ــ بۆکێڵگە کە ئاو دەی‌شواتەوە)
٤٤ــ بنام ( بن ئامۆزا )
٤٥ــ بن‌هێلین (دوابەرە)
٤٦ــ بن‌هێلین (دوابەرە)
٤٧ــ بن‌کاشخان (بن‌میچ)
٤٨ــ بن‌سێڤانده (سوانده ، گوێسوانە) ٠
٤٩ــ بنەکۆزەر
٥٠ــ بنپەلك
٥١ــ بن‌کەڵ

بەلای لێژنەوە ئەم مۆرفێمەش (بن) لەو وشانەی لیستەکەدا وەك مۆرفێمەکانی‌تر (ژێر ، سەر ، کن ، ژوور ، بەر ، پێش ، لا ٠٠٠) پێشگرنییە ، چونکە لە هەموویاندا واتای سەر بەخۆی هەیە ، وەك بە سەرنج‌گرتن لە لیستەکە دەردەکەوێت بەکارهێنانی مۆرفێمەکە لەگەڵ ئەم بابەتانەدا دێت :

١ــ لەگەڵ (ناو)دا ، وەك :

بنەمێو

بنباخەڵ
بنەماڵە
بنبـــار
بنەتۆو
بنەگوێ
بنەمـــۆم

٢ــ لەگەڵ (کار)دا ، وەك :

بنەبڕ (بنبڕ)
بنبــڕ
بندانەوە
بنکڕ
بنبەرکرن
بنگرە

٣ــ لەگەڵ (پاشگر)دا ، وەك :

بنار (ار)
بناچە (اچە)
بنـــە (ە)
بنکە (کە) دەشگوترێت (بنگە) •

٤ــ ئامرازی (ە)ی پەیوەندی بەدوادا دێت ، وەك :

بنەگوێز
بنەڕەت
بنەماڵ

بنەمێــو
بنەگۆزەڵــە

تێبینی : واپێدەچێت وشەی (بناگوێ) لە (بنەگوێ)وە هاتبێت •

٥ــ ئامرازی (و)ی عطفی بەدوادا دێت :

بن‌و بنداناں (لەسەر بنکەی دانان)

(نون) مۆرفێمی (بان) :

لیژنە بۆ دۆزینەوەی مۆرفێمی ( بان ) بە فەرهەنگە کوردییەکانــدا گەڕا و ئەم وشانەی دۆزییەوە کردنی بە لیستەیەك بۆ لێکۆڵینەوە :

١ ــ بــانە
٢ ــ بانەسەر (قمة الرأس ، نوع من الحلی)
٣ ــ بانەمەڕ (شهر نیسان ، مۆڵگەی‌مەڕ)
٤ ــ بان‌تلیز (بان‌گردێن ، باگردێن)
٥ ــ بان‌خانی
٦ ــ بان‌گلێن (باگردێن)
٧ ــ بانماڵ
٨ ــ بانۆ (هضبة) ، بانێ
٩ ــ بانۆچکە (هضبة صغیرة)
١٠ــ بان‌هەڵبان (غرفة فوقانیة)
١١ــ بانیژە (شرفة)

بەلای لیژنەوە مۆرفێمی (بان)یش وەك مۆرفێمەکانی‌تر (ژێر ، سەر ، کن •••) لــەو وشانەی کە لە لیستەکەدا هەن ، پاشگر نییە چونــکە لە

هەمۆیاندا واتای سەربەخۆی هەیە • وە بە سەرنج گرتن لە لیستەکە ، دەردەکەوێت بەکارهێنانی مۆرفێمەکە لەگەڵ ئەم بابەتانەدا دێت :

١ــ لەگەڵ (ناو)دا ، وەك :

بانەمەڕ
بانەسەر
بانخانێ

٢ــ لەگەڵ (کار)دا ، وەك :

بانگلێن
بانگوش
بانگێڕ

٣ــ لەگەڵ (پاشگر)دا ، وەك :

بانە
باتۆ
باتۆچکە
بانێژە

٤ــ ئامرازی (ە)ی پەیوەندیی بە دوادا دێت ، وەك :

بانەسەر
بانەمەڕ

**٢٦ ــ پێشگری ( ب ) :**

مەبەست لەم پێشگرە ئەو ئیشارەتە نییە کە تایبەتییە بە ڕێژەی فەرمانی کار ، وەك : نانبخۆ ، زۆ بنۆ ، پێیان بڵێ بڕۆن • بەڵکو ئەو

زیادییە کە دێتە سەر کار و هەرجارە لە شێوەیەکدا دەیکات بە سیفەت ، وەك : بکوژ ، بجەنگ ...

نوسەران بەم جۆرە باسیان لەم پێشگرە کردووە :

١ ــ مامۆستا وەهبی لە لاپەڕە (١٦)ی فەرهەنگەکەیدا هەر بەسەر باسی (ب)ی کاری فەرمانەوە باسی ئەم پێشگرەش دەکات دەڵێ : پێشگرێکە دێتە سەر قەدی کاری رانەبوردو سیفەت و ناو دروست دەکات و دەلالەتی چالاکی رادەگەیەنێت ، نمونەش لەم وشانە دێنێتەوە :

أ ــ نمونەی ئاوەڵناو ، وەك : بجەنگ ، بدەر ، بدو ، بگێڕ ، بکڕ ، بکوژ ، بکوژوببڕ ، بڕان (لێخوڕ) ، بخۆر بزان .

ب ــ نمونەی ناو ، وەك : بگربگر ، بڕفێنبڕفێن .

٢ــ نوری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (٥٥)ی پێشگر و پاشگردا ( گرتنی کەلێنێکیتر) لە باسی پێشگری (ب)دا ، فەقەرە (٣) دەڵێت : رەگی فرمانی متعدی پێ دەکرێت بە (ناوی بکەر) ، وەك :

| | |
|---|---|
| کڕ | بکڕ |
| نوس | بنوس |
| چێژ | بچێژ |
| گر | بگر |
| کێڵ | بکێڵ |
| کێش | بکێش |

٣ــ لە لاپەڕە (٢١)ی کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی لە باسی دەستوری داڕشتنی ئاوەڵناوی بکەر لە فەقەرە (١) دەڵێت : هەندێ ریژەی ئاوەڵناوی بکەر لە رەگی فرمان پێشگرەکانی : (ب) و (بە) دروست دەبن ، وەکو : بژەن ، بەگەڕ .

لیژنە تەنها ئەم سێ سەرچاوەیەی دۆزیەوە باسی پێشگری (ب)یـان کردبێـت •

لێرە بەولاوە لیژنە لیستەیەك لەو وشـانەی کە بە پێشـگری (ب) دەستیان پێ کراوە :

١ ــ بیـڕ
٢ ــ بترەك ( غیر مؤدب ــ فەرهەنگی گیو موکریانی)
٣ ــ بـدو
٤ ــ بجەنـگ
٥ ــ بخـواز
٦ ــ بخـۆر
٧ ــ بخوێـن
٨ ــ بـدەر
٩ ــ بڕان ( فەرهەنگی توفیق وەهبی )
١٠ــ بژێو
١١ــ بـکەر
١٢ــ بـکڕ
١٣ــ بکوژ
١٤ــ بگێڕ
١٥ــ بتوس
١٦ــ بگر
١٧ــ بزان
١٨ــ بوێر

١٩ــ بوێژ
٢٠ــ بکێڵ

جگە لەم شێوە سادەیە پێشـــگری ( ب ) لە شێوەی ناسادەشـــدا وشە دروست دەکات ، وەك :

٢١ــ بگر و بکێش ( بە واتای مجادلة )
٢٢ــ بکوژوبڕ
٢٣ــ بڕفێن بڕفێن
٢٤ــ بگربگر
٢٥ــ بڕای بڕ ( بڕای بڕای )

بە سەرنج ڕاگرتن لەم وشانە ئەم ڕاستیانەی خوارەوە لـــە بارەی پێشگری ( ب )ەوە دەردەکەوێت :

١ ــ ئەمە پێشگرێکی ســـەربەکارە ، چونکە نایەتە بەرچـــاو لەگەڵ هیچ وشەیەکی غەیری کاردا هاتبێت •

٢ ــ بە زۆری لەگەڵ کاری تێپەڕدا ، لە لیستەی سەرەوەدا جگە لە وشـــەکانی : بترەك ، بجەنگ ، بژێو کە بریتیین لە پێشگری ( ب ) و کاری تێنەپەڕ وشـــەکانی تر تا ژمارە (٢٠) هەمویان تێپەڕن •

تێبینی : لە ئاخاوتنی کرمانجی خوارودا کاری ( وێران ) بەکارهێنانی تێپەڕ و تێنەپەڕیشی هەیە ، هەرچەند پتر بە لای تێنەپەڕدا دەڕوات ، بە نمونە :

وێرامان ــ ڕێژەی تێپەڕە
وێراین ــ ڕێژەی تێنەپەڕە

بەڵام لە ڕێژەی وەك ( پیان ویران ) تەنها شێوەی تێنەپەڕی هەیە، ئەگەر تێپەڕ بوایە دەبۆ بگوترێت ( پێمان وێران ) ، وەك کە دەگوترێت ( پێمان گوتن ) • لە کرمانجیَ سەرۆدا کاری ( وێران ) هەمیشە وەك تێنەپەڕ بەکاردێت •

٣ ــ بە زۆریَ ئاوەڵناو دروست دەکات • تەنها وشەی ( بژێو ) نەبێت کە لە دەستەی (ناو) ە • وەك دیاریشە ئەم وشەیە کە لە (ژین) و ( ژیان )ەوە هاتوە گۆڕانێك بەسەر قالبەکەیدا هاتوە ، چونکە لە بنەڕەتدا نە دەنگی وا ( و ) هەیە و نە دەنگی ( یَ ) • واش پیَدەچێت ئەم جۆرە داڕشتنە بە دەگمەن نەبێت چنگ نەکەوێت •

٤ ــ لە بارەی شێوە لێکدراوەکەی ئەم پێشگرەوە :

أ ــ وشەکان لە سەرەتاوە دەکرێن بە دوَ جۆر • یەکەمیان دوَ کەرتەکەی بە هۆی واوی عەتفەوە لێك دەدرێن ( بگروبکێش ــ بکوژوببڕ ) • دوومیان بە دوَبارە کردنەوەی وشە وێنەی لێکدراو وەردەگرێت •

ب ــ وشەی ( ببڕوبکوژ ) ئاوەڵناوە ، سێ وشەی ( بکڕوبکێش ، بڕفێنبڕفین ، بگربگر ) ناوی مەعنەوین ، ( ببڕای ببڕ ، ببڕای ببڕای ) لە بەشی ئاوەڵکارن •

تێبینیَ : وشەی ( بڕای ببڕ ، ببڕای ببڕای ) نەختێك لە داڕشتنیدا جوداوازیَ هەیە لەگەڵ ئەوانیتردا ، چونکە بەپێی قاعیدە دەبوَ ( ببڕببڕ ) بوایە • ئەمەشیان لە ئاخاوتنی کوردیدا وێنەی تری نییە •

ج ــ وشەی ( بکڕوبکێش ــ بکوژوبیڕ ) کە بە هۆی واوی عەتفەوە پێك هاتوَن ، وەك ئەوانیتر نین کە لە دوَبارەکردنەوەی یەك

پێك هاتون • وا پێ دەچێت لە یەك جودابونی دو کەرتی وشەکە داخوازیێ واوی عەتفی کردبێت •

لێرەدا کۆتایی بە لێکۆڵینەوەی پێشگری سادە دێت •

ب ـــ ناسادە :

لیژنە بە ئیستیقرا بۆی دەرکەوت کە پێشگری ناسادە تەنها لەو پێشگرانە دروست دەبن کە لە بنەڕەتدا پرپۆزیشن بون ، ئەوانیتر هیچ تاکێکیان ڕواڵەتی نادەیان نییە وەك لەمەوبەر ڕون کراوەتەوە پێشگری بە ئەصل پرپۆزیشن بریتییە لەمانە :

١ ـــ پێ ـــ لە پرپۆزیشنی ( بە )ەوە هاتووە •

٢ ـــ تێ ـــ لە شێوەی ئاخاوتنی کرمانجیێ سەرو و بەشێکی کرمانجیێ خوارو ئەم پێشگرە لە پرپۆزیشنی ( د ، دە )وە هاتوە •

٣ ـــ تێ ـــ لە بەشێکی زۆری شێوە ئاخاوتنی کرمانجیێ خواروودا ئەم پێشگرە لە پرپۆزیشنی ( لە )وە دێت ، وەك لەم نمونەیە دەردەکەوێت :

لە تۆ دەگەم

تێ (ت) دەگەم

٤ ـــ لێ ـــ ئەم پێشگرە لە هەمو شێوە ئاخاوتنەکاندا گۆڕاوی پرپۆزیشنی ( لە )یە •

٥ ـــ ژێ ـــ لە کرمانجیێ ژوروودا ئەم پێشگرە گۆڕاوی پرپۆزیشنی (ژ)ە •

ئەنجا لێرە بە دواوە یەکەیەکە لە پێشگرەکان دەدوێین :

١ ــ شێوەی ناسادەی پێشگری ( پێ ) :

لێکۆڵینەوە لە باســی شێوە ناسادەی ئــەم پێشگرە و ئەوانی تریش لە دوو ڕێبازەوە دەبێت ، چونکە هەموویان دوو ڕواڵەتی لە یەکتر جودایان هەیە :

یەکەم ــ ڕواڵەتی ( پێدا ، پێــوە ، پێڕا ــ هەروەهــا ڕواڵــەتی پێشگرەکانی تریش کە لەگەڵ «دا»وە «ڕا» دێن ) •

لێرە بە پێشەوە ئەندامــانی لیژنە هەر یــەکەیان بــیروڕای خۆی لە بارەی ئەم ڕواڵەتەوە دەربڕیوە و بیروڕاکەشیــان لە گۆڤــاری کۆڕ ، ژمارە (٥)ی ساڵی ١٩٧٧دا بلاوکراوەتەوە ( ئەوسا • د• ئەوڕەحمان ئەندامی لیژنە نەبوو لەبەر ئەوە بیروڕای ئەو بلاونەکراوەتەوە ) •

ئەندامانی لیژنە ئەوسا بیروڕای جوداجودایان هەبووە لــە بــاری ســادەبوون و ناسادەبوونی ئەو ڕواڵەتــانەوە • یەکێك بیەوێت ، دەتوانێت لەناو گۆڤارەکــەدا بیان دۆزێتــەوە • ئێستا لیژنە دەیەوێ لــەم باســە ببێتەوە و یەکالای بکاتەوە •

لیژنە دوای مناقشە و لێکۆڵینەوە گەیشتە ئەو قەناعەتە کە وا احتمالی بەهێز ئەوەیە ڕواڵەتەکانی پێشــگر و پاشگر بن نەك پێشگری ناسادە ، بەڵگەش بۆ تەرجیحی ڕایەکەی لیژنە ئەم تێبینییانەیە :

١ ــ لیژنە لێرە بە پێشەوە باسی ئەو ڕاستیەی کردوە کە پێشگرەکان لــە پریپۆزیشنەوە هاتوون ، ئەو زیادییەی ( دا ، ڕا ، وە ) کە پێانەوە دەنووسێن هەمان پاشگرن کە لە حاڵەتی تایبەتیدا بەدوا پریپۆزیشــنەکاندا دێن ، بەو پێیە دەبێت زیادییەکان بە سیفەتی پاشگرییەوە هاتبن بۆ دوای ئەو پێشگرانە ، واتە هەروەك لەگەڵ پریپۆزیشنەکاندا پاشگرن دەبێت لەگەڵ پێشگیکانیشدا هەر پاشگر بن •

٢ ــ ئەم زیادییانە بەپێی داخوازی جێگە لە پێشگرەکان دادەبڕێن ، وەك :

أ ــ پێداتێپەڕین    پێیاندا تێپەڕین

ب ــ پێوەلکان    پێمەوە لکا

ج ــ پێکڕاگەیشتن    پێتان ڕادەگەم

وا دیارە ئەم قابلیاتەی لکان و ترازانی زیادیەکان لەوەوە دێت ، کە پاشکۆن نەك کەرتی پێشگری ناسادەن ، چونکە وشەی ناسادە هەڵناوەشێتەوە •

٣ ــ ئەم ترازانەی زیادیەکان لە پێشگرەکان پتر سروشتی زیادیەکان دەردەخات کە بەراورد بکرێت لەگەڵ ئەو پێشگرە ناسادانەی هەرگیز هەڵناوەشێن و هەمو کەرتەکانی بە یەکەوە دێن • کاتێك هاتینە سەر باسی پێشگرە ناسادەکان ، ئەم بەراوردکردنە ڕون دەبێتەوە •

٤ ــ کە دێین پێشگری ( پێ ) وە یا هاوەڵەکانی لەگەڵ کارێکدا بهێنین کە پاشگری (ەوە)ی پێوەیە دەبینین پێشگرەکە لە هیچ حاڵێکدا ناتوانێت پاشگرەکە بۆ خۆی ڕاکێشێت ، واتا ئەو لکان و ترازانەی پاشکۆکان دەیکەن ، پاشگری حەقیقی نایکات چونکە پاشگر بەشێکی بنجی و پێکهێنەری وشەیە ، بە پێچەوانەی پاشکۆکان کە دیارە لەو لکان و ترازانەدا ئیسپاتی ئەوە دەکەن کە کەرتێکی بنجی وشە نین ، بەڵکو پاشکۆن •

دووەم ــ ڕواڵەتی ناسادەی پێشگری ( پێ ) و هاوەڵەکانی :

ــ ١ ــ

ڕواڵەتی ناسادەی پێشگری ( پێ ) :

ئەم پێشگرە ئەم روالەتە ناسادەیەی هەیە ( پێك ) وەك لەم وشانەدا دەردەکەوێت :

١ ــ پێك هاتن
٢ ــ پێك گرتن
٣ ــ پێك کردن ( لەسەرکردن ــ لە یاریدا )
٤ ــ پێك کەوتن
٥ ــ پێك چواندن
٦ ــ پێك چوڕن
٧ ــ پێك گەیشتن ( پێك گەیین )
٨ ــ پێكهێنان
٩ ــ پێكزانین
١٠ــ پێك شادبوڕن
١١ــ پێك وەڕین
١٢ــ پێك هەڵشاخان
١٣ــ پێك وەربوڕن ( کەوتنە ناو یەکتر )
١٤ــ پێك گەیاندن

وەك لەم نموڕنانە دەردەکەوێت ئەم پێشگرە ناسادەیە لەگەڵ کاردا دێت ، ئیتر کارەکە سادە بێت ، یان ناسادە ، تێپەڕ بێت یان تێنەپەڕ . ئاشکرایە ئەم پێشگرە لە (بەیەك)ەوە هاتوە . مامۆستا تۆفیق وەهبیش لە لاپەڕە (١٠٧)ی فەرهەنگەکەیدا دەڵێت ( پێك = بەیەك ) ، بەلام بە ئاوەلکاری داناوە . لیژنە لەو باوەڕەدایە کە بۆچوڕنەکەی خۆی گونجاوتر بێت لەگەڵ سروشتی وشەکەدا ، چونکە گوترا ( پێ ) پێشگری سادەیە

بە ناچاری دەبێت ( پێك ) بە پێشگری ناسادە دابنرێت • مامۆستا وەهبی لە لاپەڕە (١٠٦)ی فەرهەنگەکەیدا (پێ)ی بە پرێپۆزیشـــن داناوە • لەمەوە باشتر ڕوون دەبێتەوە کە بۆچوونەکەی لیژنە لەگەڵ خوێدا گونجاوتـــرە ، چونکە ( پێ ) و ( پێك ) بە پێشـگر دادەنێت ، کەچی مامۆستا وەهبـــی هەریەکەیان بە شتێکی جودا لەوی‌تر دادەنێت •

ئەم پێشگرە سەرەڕای ئەوەی لە بارەیەوە گوترا ، چەند تێبینیەکی‌تر هەڵدەگرێت :

١ ــ بەشداربوونی پتر لە لایەنێك رادەگەیەنێت •

٢ ــ زۆر جاران دەشێت لـــە جیاتی ( پێك ) وشـــەی ( پێکتر ) بەکاردێت ، وەك : پێکتر گوتنەوە •

٣ ــ وشـــەی ( پێکەڵپێـــك ) کە جۆرە بەکارهێنـــانی ئاوێتـــەی (پێك)ە • لە شێوە ئیدیەمیـــدا جێگەی وشـــەیەکی فەرهەنگی گرتـــوە واش دەبێـــت لێی دەقرتێت و دەبێتـــە ( پێـــکەڵ ) ، ڕواڵەتی وشـــەکە هەڵدەگرێت لە ( پێك + هەڵ )ەوە هاتبێت •

٤ ــ لە فەرهەنگی مەهاباد لاپەڕە (١٥٣) وشەی ( پێکاوپێك ) هاتوە بە واتای ( پێکەڵپێك ) ، لەبەر ئەمە چی لەبارەی ( پێکەڵپێك )ەوە گوتراوە بۆ ئەمیش دەستدەدات •

٥ ــ ڕواڵەتی ( پێکەوە ) بریتییە لە پێشگری ( پێك ) و پاشـــکۆی ( ەوە ) • دەشێ ئەمەشـــیان بەڵگە بێت بۆ بنجی نەبوونی کـــەرتی ( ەوە ) چونکـــە ئەگەر لە ڕواڵەتی (پێوە)دا کەرتی ( ەوە ) بنجی بوایـــە ، دەبـــو بگوترێت ( پێوەك ) نەك لە ( بێ ) بترازێت و بچێتە کۆتایی ( پێك )ەوە •

٦ ــ لەحاڵەتی اضافەی ( پێکەوە ) بۆ ڕانـــاوی لکاو دوو ڕواڵـــەت دێتە بەرچاو :

أ ــ پێکمانەوە

ب ــ پێکەوەمان

هەروەها دەبێت بڵێین ئەم ڕواڵەتە هەر اضافەی ( ڕاناو ) دەکرێت، دەبێ ڕاناوەکەش هی ( کۆ ) بێت ، چونــکە دیارە واتای ( پێکــەوە ) هاوبەشی تێدایە کە ممکین نییە لە ( تاك )دا پێك بێت ، واتە ناگوترێت ( پێکتەوە ــ پێکییەوە ــ پێکمەوە ) ، بەڵام دەشێ ( پێکەوە ) بۆ ( کۆ ) بەکار بێت ، وەك :

ئێمە و ئێوە پێکەوە هاتین

دارا و ئەحمەد پێکەوە هاتن

ئەوان پێکەوە هاتن

لە کرمانجی سەروودا دەگوترێت ( پێکڤە ) • لەبەر ئەوەی کە لەو شێوە ئاخاوتنەدا ڕاناوی لکاوی ( مان ــ تان ــ یان ) نییــە ناشــێت ( پێکڤە ) اضافە بکرێت بۆیان ، بە نموونە ناگوترێت :

پێکڤەتان ــ پێکتاڤە

٧ ــ ئــەم کارانە لەگەڵ پێشگری ( پێك ) و پاشکۆکانی دێن :

١ ــ پێکەوەنان

٢ ــ پێکەوبوون

٣ ــ پێکەوەنوسان

٤ ــ پێکدادان

٥ ــ پێکداهاتن

٦ ــ ڤێکڕاچوون ( بەگژ یەکتردا هاتن )

٧ ــ پێکدا تێپەڕین

— ٢ —

ڕواڵەتی ناسادەی پێشگری ( تێ ) :

وەك لە پێشەوە گوتمان ئەم ڕواڵەتە لە بنەڕەتدا لە پێشگری ( د، دە )وە هاتوە ، بەڵام لە هەمان کاتدا بەشێکی ئەو وشانەی بە ئەصل پرێپۆزیشنی ( لە )یان بە سەرەوەیە دواتر پرێپۆزیشنەکەیان دەبێتەوە ( ت ) ، وەك : لە تۆ دەگەم ــ تێت دەگەم .

وەك لەم وشانەدا دەردەکەوێت پێشگری ( تێك ) ئەم ڕواڵەتە ناسادەیەی هەیە :

١ ــ تێك ئاڵان
٢ ــ تێكبەربوون
٣ ــ تێك بەردان
٤ ــ تێك بەزین ( فەرهەنگی مەهاباد )
٥ ــ تێك ڕژان
٦ ــ تێك چڕژان
٧ ــ تێك چوون
٨ ــ تێك خستن
٩ ــ تێك دان
١٠ــ تێك سڕمان ( تێك سمران ، تێك سمڕان )
١١ــ تێك شکان
١٢ــ تێك هەڵاویشتن
١٣ــ تێك هاویشتن
١٤ــ تێك هەڵ ئەنگوتن

١٥ـ تێك خزان

١٦ـ تێك ترنجان

١٧ـ تێك هەڵچوون

١٨ـ تێك هەڵدان

١٩ـ تێك هەڵشێلان

٢٠ـ تێك هەڵكێش ( تێك هەڵكێشان )

٢١ـ تێك پلیشانەوە

٢٢ـ تێك وەردان ( تێك ڤەدان ) بە واتای ( تێكەڵ كردن ) دێت :

وەك لەم نموونانە دەردەكەوێت ئەم پێشـــگرە ناسادەیە لەگەڵ كاردا دێت ، ئیتر كارەكە سادە بێت ، یان ناسادە ، تێپەربێت ، یان تێنەپەڕ •

بە لێكۆڵینەوە دەردەكەوێت ئەم پێشگرە لە پرپیۆزیشنی ( د ، دە ، لە + یەك )ەوە هاتوە •

مامۆستا وەهبی وشەی ( تێك )ی بە ئاوەڵكار داناوە لاپەڕە ١٤٧ی فەرهەنگــەكەی • كەچی وشـــەی ( تــێ )ی لە لاپــەڕە ١٤٦دا بــە پرپیۆزیشن داناوە • ئەو موناقەشەیەی كە بە دەوری ( پێ ) و ( پێك )ەوە لێرەدا كردی لێرەش بــە تەواوی دووبارە دەبێتــەوە و ڕاستی پرسیارەكەی ( تێ ) و ( تێك )یش ساغ دەكاتەوە ، پێویســتە خوێنەر بگەڕێنــەوە بۆ ئەو موناقەشەیەی كە لە ( پێ ) و ( پێك )دا كراوە •

ئەم پێشگرە چەند تێبینیەك هەڵدەگرێت :

١ ــ بەشداربوونی پتر لە لایەنێك ڕادەگەیەنێت •

٢ ــ بە دەگمەن نەبێت ، ناشێ لە جیاتی ( تێك ) وشـــەی ( تێكتر ) بەكار بێت •

٣ ــ چەند کارێك شێوەیێکی تایبەتیی ( تێك )یان لەگەڵدا دێت ، ئەوانیش ژمارەیان کەمە ، وەك :

تێکەوەدان
تێکەوەپێچان

٤ ــ وشەی ( تێکە و لێکە ) : هەرچەند دەشێ لە بنەڕەتدا لە دوو کاری ( تێبکە ) و ( لێبکە )وە هاتبێت ، بەڵام ئێستا لە بەکارهێناندا بۆتە وشەیێکی فەرهەنگیی و بە ڕواڵەت لەگەل ( تێك ) یەکی گرتۆتەوە •

٥ ــ وشەی ( تێکڕا ) کە لە پێشگری ( تێك ) و پاشکۆی ( ڕا ) پێك هاتووە ، ئەویش بۆتە وشەیێکی فەرهەنگیی بەشی ئاوەڵکار بە واتای ( جمیعا ) •

٦ ــ لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا ( تێکدا )ش بە واتای ( متداخل، مختلط ) بەکاردێ ، وەك بگوترێت ( کەلوپەلەکان زۆر تێکدان جودا ناکرێنەوە ( • دەشگوترێت ( بۆ بە تێکدایی و کەس کەسی نەناسیەوە ) •

لە کوردستانی سەرۆدا ( تێکدا ) و ( تێکدایی ) بەکار دەهێنرێت •

٧ ــ وشەی ( تێکەڵ ، تێکەڵاو ، تێکەڵ پێکەڵ ، تێکەڵ و پێکەڵ ):
أ ــ ( تێکەڵ ) :

لە شێوە ئاخاوتنەکانی کوردیدا ئەم وشەیە بە پێی بەکارهێنانی دەردەکەوێت ، کە لە ( تێك + هەڵ ) پەیدا بووە ، بەڵام دەنگی ( هـ ) تێیدا فرتاوە • لە شێوە ئاخاوتنی سەرۆدا ئێستاش ( تێكهەڵ ) بەکار دێت • ئەم پێشگرە ناسادەیە بە عادەت لەگەڵ دوو کاری ( بوون ، کردن ) بەکار دێت ، وەك ( تێکەڵبوون ، تێکەڵکردن ) ، بەڵام شێوەیەکیتری هەیە

که دەنگەکەی ( هـ )ی نەفرتاوە و دەگوترێت ( تێك هەڵدان ــ تێــك هەڵدایی ) •

ب ــ ( تێکەڵاو ) :

ئەم وشەیە لە ( تێکەڵ + او )ەوە هاتوە ، بەڵام زیادیــەکە ئــەو ( ئاو )ە نییە کە لە عەرەبیدا ( ماء )ی پێدڵێن • هەرچەندە بنچینەی ئەو زیادیە زۆریش ڕوون نییە • بــەڵام وشەی تریش هەن وەك ( تێکەڵاو ) هەمان ( او )یان بە دوادا هاتوە ، وەك ( هەڵاو ، هاڵاو ، شاڵاو ، پەهناڤ ــ لە کرمانجیی سەرودا بە زەویی تەخت دەڵێن ) کە لە هیچیاندا زیادیەکە ( ئاو ــ ماء ) نییــە [ بەلای مامۆســتا نوری عەلی ئەمینــەوە وشــەی « هەڵاو » کورت کراوەی « هەڵماو »ە کە لەوێدا زیادییــەکە بە واتای « ئاو » دێت • بەلای مەسعوود محەمەدەوە وشەی « هەڵاو » بۆ ئاگریش بەکار دێت و دەگوترێ « هەڵاوی ئاگرم بۆ هات » • بــەو پێیە نابێ بە واتای هەڵم بێت ، چونکە ئاگر هەڵمی نییە • لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ ئەوە تێبینیی بکرێ کە گەلێــك جــاران وشــە لە ڕووی مەجــازەوە بۆ غەیری مەعنای خۆشی بەکار دێت ] • لە مەوە دەشێ بگوترێ ئــەم زیادیــە لە کۆتایی وشــەکاندا یەکێکە لــەو پاشگرانەی کە ناوناوە لە هەندێ حاڵ و باردا بە وشەوە دەلکێن •

ج ــ ( تێکەڵ پێکەڵ ــ تێکەڵ و پێکەڵ ) :

ئەم وشەیە لە هەردوو شێــوەیدا لەو وشــانەیە وەك ( شــتومەك ، کەلوپەل ، کەلەپەل ، چەوت و چوێڵ ، جرت و فرت ، ڕێك و پێك ، هات و چۆ ••• ( کە لە لاپەڕە (٣٧٧)ی کتێبی ( ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردیی ــ چاپکراوی کۆڕ ، ساڵی ١٩٧٦ ) لیژنە لێیان دواوە و بریتــین لە دوو

کـەرت بە پێی ئەو تفصیلـەی کە لە کتێبـەکەدا باس کراوە • وەك لە نموونەکانیشدا بەدیار دەکەوێت بەشی هەرە زۆری ئەو وشـانە بە هۆی واوی عەتفەوە پێك هاتوون ، ئەوەی کە واوەکەشی قرتاوە دەشێ واوەکەی بۆ بێننەوە • لەم وشـەیەدا کەرتی یەکـەمی واتادارە و کەرتی دووەمی هەرچەندە بە ڕواڵەت ئـەو ( پێکەڵ )ەیە کە پێشـتر لێژنە لێـی دوا و واتاداریش بوو ، لێرەدا ئەو واتایە نابەخشێت ، هەر وەك لە ( قەرزوقۆڵ ، کەلوپەل ، خاووخلیسك ••• )دا وشـەی ( قۆڵ ، پەل ، خلیسك ••• ) وشەکە لە بەرەی ( ئاوەڵناو )ە •

٨ ــ وشەی ( تێكوپێك ، تێكوپەك ، تێكوپەکان ، تێكومـەك ، تێكومەکان ) : هەموو یەك واتای هەیە و کەرتی دووەمی بێ واتایـە • هەرچەندە وشەی ( مەکان ) بە ڕواڵەت لەگەڵ ( مکان )ی عەرەبی یەك دەگرێتەوە و خۆی واتادار دەنوێنێت ، بەڵام لێرە ئەو واتایە نابەخشێت • هەروەهاش وشەی ( پێك ) ئەو واتایە نابەخشێت کە لەمەوپێش باسکرا و واتادار بوو •

ئەم وشانە کە لەگەڵ ( کار )دا دێن ، هەموویا نیەك ڕەفتار ناکەن ، بە نموونە :

أ ــ لە حاڵەتی تێنەپەریدا دەگوترێت :

تێكوپێك چوو ، تێكوپێك شکا
تێكوپەك چوو
تێكوپەکان چوو
تێكومەك چوو
تێكومەکان چوو

ب ــ لە حاڵەتی تێپەڕیدا دەگوترێ :

تێك و پێکمدا ، تێك و پێکم شکاند
تێك و پەکمدا ، تێك و پەکم شکاند
تێك و پەکانمدا
تێك و مەکمدا
تێك و مەکانمدا ، تێك و مەکانم شکاند

بۆ ئەوەی بزانین وشەکان بەر کام بەشی ئاخاوتن دەکەون نەختێك سەرنجدان و لێوردەبونەوە پێویستە •

مامۆستا وەهبی لە لاپەڕە ١٤٧ی فەرهەنگەکەیدا ( تێك )ی بە ئاوەڵکار داناوە •

هەروەها د• ئەوڕەحمان لە کتێبەکەیدا ( وەشەڕۆنان ) مۆرفێمی ( تێك )ی بە پێشگری ناسادە داناوە •

نوری عەلی ئەمین کاتی خۆی لە کتێبی ( گرتنی کەلێنێکیتر )دا مۆرفێمی ( تێك )ی بە پرپۆزیشن داناوە •

بەلای لیژنەشەوە وەك باسکرا پێشگری ناسادەیە و لە بنەڕەتدا پرپۆزیشن بوە •

هەرچەند لەبەر تیشکی ئەو بیروڕایانەی تا ئێستا لە بارەی ( تێك ) و وێنەکانیتریەوە دەربڕاون ، گەیشتن بە قەناعەت کارێکی ئاسان نییە لەگەڵ ئەوەشدا ئەم چەند خاڵانەی لای خوارەوە بەلای لیژنەوە راستی بێگومانە :

١ ــ ( تێك ) بۆ خۆی پێشگری ناسادەیە •

٢ ــ ئــەو زیادیانەی بــە دوایدا دێن لە وشــەکانی ( تێكوپێك ، تێكومەکان ... ) هێز و موبالەغەیەك لە واتاکەی زیاد دەکەن .

٣ ــ هەمیشە لەگەڵ ( کار )دا دێن .

٤ ــ بەشــدار بونی پتر لــە لایــەنێك رادەگەیەنێت ( مشــارکە دەگەیەنێت ) .

٥ ــ هیچ کاتێکیان وەك ( تێکەڵ ، تێکەڵ پێکەڵ ) وەصفی‌نین .
لەبەر ئەمە لیژنە بۆ ئەوە دەڕوات کە ئەم مۆرفێمانەش شێوەیەکی تایبەتی هێزداری پێشگری ( تێك ) بن . لە ڕێژەشدا دەچنەوە بۆ لای ڕێژەی ئەو وشانەی کە لە لاپەڕە ٣٣٧ی کتێبی ڕێزمانی ئــاخاوتنی کوردیی )دا باس کراون [ لە بەندی « ﻫ »ی هەمان لاپەڕەدا باسی دروست کردنی وشە لە لێکدانی دوو وشەوە کراوە ــ بگەڕێوە بۆ ئەو باسە ] .

ــ ٣ ــ

روالەتی ناسادەی پێشگری ( لێ )

ئەم پێشگرە وەك لەمەوبەر باسمان‌کردوە بە ئەصل پرپیۆزیشنی (لە) بووە و بۆتە ( لێ ) . ئەنجا ئەم ( لێ )یە شکلی ناسادەی دەبێتە ( لێك ) ، ئەمەیش لیستەیەکە لەو کارانەی کە پێشگری ( لێك )یان دەچێتە سەر :

١ ــ لێك بوون
٢ ــ لێك بوونەوە
٣ ــ لێك کەوتن
٤ ــ لێك چوون
٥ ــ لێك چواندن

٦ ــ لێك خزان
٧ ــ لێك خستن
٨ ــ لێك خشان
٩ ــ لێك دان
١٠ــ لێك خوڕین
١١ــ لێك کردن
١٢ــ لێك کردنەوە
١٣ــ لێك کەوتن
١٤ــ لێك نان
١٥ــ لێك هەڵبڕان ( لێك هەڵبڕین )
١٦ــ لێك هەڵوەشان
١٧ــ لێك دەرپەڕین
١٨ــ لێك بوردن
١٩ــ لێك بەربوون
٢٠ــ لێك گرتن
٢١ــ لێك هەڵچوون
٢٢ــ لێك هەڵپێچان
٢٣ــ لێك هەڵگرتن
٢٤ــ لێك هەڵبەزینەوە
٢٥ــ لێك دابڕان
٢٦ــ لێك شاردنەوە
٢٧ــ لێك دانەوە
٢٨ــ لێك گرتنەوە

٢٩ــ لێك مڕاندن
٣٠ــ لێك ئالآن
٣١ــ لێك حەیتاندن ( بەواتای یەکدی شکاندنەوە )
٣٢ــ لێك داڕسان •

مامۆستا وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا ( لێك )ی بە ( ئاوەڵکار ) داناوە، بەڵام ( لێ )ی بە پریپۆزیشن داناوە •

نوسەرانی‌تری کورد بە زۆری وەك لیژنە ( لێك )یان بە پێشــــگری ناسادە داناوە • وەك لەمە نمونانەدا دەردەکەوێت ، ئەم پێشگرە ناسادەیە لەگەڵ کاردا دێت ، ئیتر کارەکە سادە بێت ، یان ناسادە ، تێپەڕ بێت ، یان تێنەپەڕ •

بە لێکۆڵینەوە دەردەکەوێت ئەم پێشـــگرە لە پریپۆزیشنی ( لـــە + یەك)ەوە هاتوە •

ئەم پێشگرە چەند تێبینیەك هەڵدەگرێت :

١ ــ ( لێك ) بۆ خۆی پێشگری ناسادەیە •

٢ــ لەگەڵ کاردا دێت •

٣ ــ لە جیاتی ئەم پێشـــگری ( لێك )ە زۆر جار ( لێکتر ) بـــەکار دێت ، وەك :

لێکتر تۆزین
لێکتر پێچانەوە
لێکتر شاردنەوە

٤ ــ ( لێك ) یەك رواڵەتی هەیــە لەگەڵ زیادیدا هاتبێت ، ئەویش ( لێك‌وپێك )ە • دەگوترێت :

لێك‌وپێك بوه‌وه
لێك‌وپێکم کرده‌وه

٥ ـ له‌گه‌ڵ پاشکۆکانی ( ڕا ، ەوه ) دێت ، وه‌ك :

لێکه‌وه دیار بۆن
لێکه‌وه ئاڵان
لێکڕاڕۆیشتن

له‌گه‌ڵ پاشکۆی ( دا )دا ته‌نها وشـه‌ی ( لێکدا لێکدا ـ به واتای په‌یتاپه‌یتا ) دۆزرایه‌وه •

پێویسته فه‌رقی پاشکۆی ( دا ) و پێشگری ( دا ) بکه‌یت له‌و کارانه‌دا که مۆرفێمی (دا) ده‌که‌وێته نێوان پێشگری ( لێك ) و کاره‌که‌وه ، وه‌ك :

لێك دابڕان
لێك‌داڕسان ( به‌ربۆنه‌یه‌ك )
[ له کرمانجی سه‌رۆدا « داڕسیان » و له بڵباسه‌تیدا « ڕاسان » ده‌گوترێت ]

هه‌روه‌ها ده‌بێت پاشکۆی ( ڕا ) له پێشگری ( ڕا ) جودا بکرێته‌وه •
ناوناوه‌ش وا ده‌بێت پاشگری ( ەوه ) له هه‌ندێ له‌هجه‌ی بڵباسه‌تیدا ده‌په‌ڕێته‌وه بۆ دوای پێشگری ( لێك ) و شێوه‌ی ( پاشکۆ ) وه‌رده‌گرێت ، وه‌ك که ده‌گوترێ :

لێکه‌وه‌گرتن ـ به واتای لێك‌گرتنه‌وه
لێکه‌وه‌بۆن ـ به واتای لێك‌بۆنه‌وه

— ٤ —

ڕواڵەتی ناسادەی پێشگری ( ژێ )

ئەم پێشگرە لە بنەڕەتدا پرێپۆزیشنی (ژ) بووە و بۆتە (ژێ) ، ئەنجا ئەم ( ژێ )یە شکڵی ناسادەی دەبێتە ( ژێك ) کە لە ( ژ + یەك ) پەیدابووە • ئەمیش لیستەیەکە لەو کارانەی کە پێشـــگری ( ژێك )یان دەچێتە سەر ، وەك :

١ — ژێك بوون
٢ — ژێك کرن
٣ — ژێك بردن
٤ — ژێك دان
٥ — ژێك گرتن
٦ — ژێك هەڵگرتن
٧ — ژێك چویرکرن ( بە فیرۆ لێ ساندن )
٨ — ژێك ڕەڤان ( ڕەڤاندن )
٩ — ژێك

ئەم پێشگرە چەند تێبینیەك هەڵدەگرێت :

١ — ( ژێك ) بۆ خۆی پێشگری ناسادەیە •
٢ — هەر لەگەڵ ( کار )دا دێت
٣ — لە جیاتی ئەم پێشگرەی ( ژێك ) زۆر جار ( ژێکدی ) بەکار دێت ، وەك :

سەردار و سەروەر ژێکدی دوور کەفتن
ئەم و هوین ژێکدی ناگرین

٤ ـ مۆرفیمی ( ڤە ، دا ، ڕا ) کە دەکەوێتە نێوان پێشگری (ژێك) و کارێکەوە ، ئەو مۆرفیمە پێشگری کارەکەیە نەك پاشکۆی (ژێك) ، وەك :

ژێك ڤەبوون
ژێك داگرتن
ژێك ڕاگوتن

ـ ٥ ـ

ڕواڵەتی ناسادەی پێشگری ( ڕێ )

ڕواڵەتی ناسادەی ئەم پێشگرە ( ڕێك )ە • هەروەك پێشگری (ڕێ) لە پریپۆزیشنی ( ڕە )وە هاتوە ، هەروەهاش ( ڕێك ) لە ( ڕە + یەك )ەوە هاتوە پێویستە هەمیشە تێبینی ئەوە بکرێت کە پێشگری ( ڕێك ) لەگەڵ وشەی ( ڕێك ـ واتای مرتب )دا بە ڕواڵەت یەك دەگرێتەوە ، لە بەکارهێناندا پەیوەندییان بە یەکەوە نییە ، بە نموونە :

ڕێککەوتن لە وشەی ( ڕێك ـ بە واتای مرتب )ەوە هاتوە •

ڕێك گوشین لە ( ڕە + یێك + گوشین )ەوە هاتوە • هەرچی وشەی ( ڕێك ـ مرتب )ە وشەیەکی سادەیە • پێشگری ( ڕێك )یش لە پێشگری (ڕێ) و وشەی (یەك) پێك هاتوە ، کە دەبێتە وشەیەکی ناسادە •

لێرە بەپێشەوە لیژنە بە شێوەیەکی کورت لە پێشگری (ڕێ) دواوە [ بگەڕێوە بۆ لاپەڕە ٣٨٣ لە بەرگی پێنجەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ١٩٧٧ ] • پێشتریش لە لاپەڕە (٣١٨)ی کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردیدا بە خێرایی پەنجەیێکی بۆ ڕاکێشراوە ، ئێستا چی لە بارەی (ڕێك)ەوە دەنووسرێت باوەڕی دواینی لیژنەیە •

هەروەك لەو شوێنە باس کراوانەدا دەردەکەوێت پێشگری (ڕێ) بە دوا ئەویشدا پێشگری ناسادەی ( ڕێك ) لە نێوان خێڵەکانی سەر بە بڵباسەتیدا بەکاردێت لە چەند وشەیەکیش بەولاوە ئەم دوو پێشگرە بەرچاو ناکەوێت • وەك لە واتای پێشگرەکەوە دەردەکەوێت ( ڕە ) لەگەڵ ( دە ، د ، ڕ ، لە )دا یەك واتایە • بەو پێیە (ڕێ) لەگەڵ( تێ ، ژێ ، لێ )دا نزیك دەبێتەوە ، هەروەهاش ( ڕێك ) وەك لە خێزانی ( ژێك ، تێك ، لێك ) حساب دەکرێت ، چونکە لەوێشدا هاوبەشبوونی دوو لایەن رادەگەیەنرێت ( مشارکة ) • ئەمەش نموونەی ئەو کارانەیە کە پێشگری (ڕێك)یان پێوەیە :

١ ــ ڕێك خشان ( لێك خشان )

٢ ــ ڕێك خشاندن ( لێك خشاندن )

٣ ــ ڕێك گوشین ( واتای «مشارکة» لەم وشەیەدا مەبەستەکە لەوەوە دێت کە دوو لای یەك شت وەیا دەوران دەورەکەی بۆ یەکدیی دەهێنرێنەوە نەك دوو شتی جودا بە یەکەوە دەگوشرێن ) •

٤ ــ ڕێك مالین | پەلاماری یەکدی دان
٥ ــ ڕێك ماشتن |

٦ ــ ڕێكهێنان ( بە واتای هێنانەوەیەك دێت )

ئەم پێشگرە چەند تێبینیەك هەڵدەگرێت :

١ ــ ناسادە وەك لەمەوبەر گوتمان

٢ ــ لەگەڵ کاردا دێت

٣ ــ لەجیاتیی ئەم پێشگرەی ( ڕێك ) زۆرجار ( ڕێکدی ) بەکار دێت، وەك :

ڕێگدی ماشتن

ڕێگدی مالین

٤ ــ لەگەڵ پاشکوێ (ڕا) دێت و دەبێتە (ڕێکڕا) بە واتای ( لێکڕا، تێکڕا ) ، وەك :

ڕێکڕاهاتن ، ڕێکڕا ڕۆیشتن

ــ ٦ ــ

ڕواڵەتی ناسادەی پێشگری ( ڤێ ) :

ئەم پێشگرە لە شێوەی ناسادەدا دەبێتە ( ڤێك ) پێشگری ( ڤێ ) لــە لاپەڕە ( ٣٨٦ ــ ٣٨٧ )ی بەرگی پێنجەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ساڵی ١٩٧٧ )دا باس‌کراوە • لە پرپیۆزیشنی ( ب )ەوە هاتوە • ئەمیــش لیســتەیەکە لەو کارانەی کە پێشگری ( ڤێك )یان دەچێتە سەر :

١ ــ ڤێك‌خستن

٢ ــ ڤێك‌کەفتن

٣ ــ ڤێك‌دان ( بە واتای خستنەوە سەر یەکدی • هەرچێ «ڤێدان»ە بەواتای « التقاط» دێت ) •

ئەم پێشگرە چەند تێبینیەك هەڵدەگرێت :

١ ــ ناسادەیــە

٢ ــ لەگەڵ کاردا دێت

٣ ــ لەگەڵ پاشکۆی ( ڕا ، دا ) دێت ، وەك :

ڤێکڕاهاتن ، ڤێکڕاچۆن ( بەیەکەوە ڕۆیشتن ) ، ڤێك‌ڕاچۆن ( شــەڕ لەگەڵ یەکتردا کردن ) ، ڤێکداچۆن •

دوو کاری ( هاتن ، چۆن ) هەر لەگەڵ ( ڤێکدا ، ڤێکڕا )دا بەکــار دێت ، واتە لەگەڵ ( ڤێك )دا نایەن •

— ٧ —

ڕواڵەتی ناسادەی پێشگری (وێ) :

ئەم پێشگرە لە شێوەی ناسادەدا دەبێتە ( وێك ) ٠ هەروەك لە لاپەڕە ( ٣٨٧—٣٨٨ )ی بەرگی پێنجەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ساڵی ١٩٧٧ )دا باس کراوە ٠ پێشگری (وێ) لە پریپۆزیشنی ( وە — بە واتای «بە» )وە هاتوە ٠ ئەمیش لیستەیەکە لەو کارانەی کە پێشگری ( وێك)یان دەچێتە سەر :

١ — وێكچوون
٢ — وێكچواندن
٣ — وێكخستن
٤ — وێككەوتن
٥ — وێكهاتن
٦ — وێكهاتنەوە
٧ — ڕێكهێنان
٨ — ڕێكهێنانەوە

ئەم پێشگرەش چەند تێبینیەك هەڵدەگرێت :

١ — ناسادەیە
٢ —لەگەڵ کاردا دێت
٣ — لەجیاتی ئەم پێشگرەی (وێ) زۆر جار (وێکدێ) بەکار دێت ، وەك :

وێکدی کەوتەوە ( بەیەکتر کەوتەوە )
وێکدی گوتن ( بە یەکتر گوتن )
٤ــ لەگەڵ پاشکۆی ( ڕا ، ەوە )دا دێت ، وەك :
وێکڕاڕۆیشتن
وێکڕادانیشتن
وێکەوەبوون
وێکەوەهێنان

٥ــ لە ڕووی واتاوە هەروەك لە لاپەڕە (٣٨٨)ی بەرگی پێنجەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ساڵی ١٩٧٧دا نووسراوە ، (وێ) بە واتای (پێ ، ڤێ) دێت ، هەرچەندە مەرج نییە هەمۆیان بچنە سەر هەمان کار ، وەك بۆ سەرنجیش دیار دەکەوێت بەکارهێنانی (پێ) بەرفراوانترە لە دوو پێشگرەکەی تر •

★ ★ ★

دوای لێبوونەوەی باسی ئەو وشانەی کە پێشگریان بە سەرەوەیە ، لیژنە بە پێویستی زانی سەرنجی خوێنەران بۆ مۆرفیمی (ما) رابکێشێت کە لە چەند وشەیەکەوە دێت واتای مێیەتی دەبەخشێت • لە کوردیدا ئەم مۆرفیمە لە شێوەی (ما)دا واتای سەربەخۆی نییە ، کاتێك کە کرا بە (مێ)واتای سەربەخۆی دەبێت ، لە ڕواڵەتدا لەگەڵ (مادە)ی فارسی خزمایەتی هەیە کە بەشێکی لێ قرتابێت • ئەوا لە خوارەوە لیستەیەك لەو وشانە دەنووسین کە بە (ما) دەستیان پێ کردوە :
١ــ ماکەر
٢ــ ماکەو
٣ــ مالۆس

